# سەلیم بەرەکات

## لە ڕۆژئاوای کوردستانەوە خۆرێک هەڵهات!

نیگاری: مەدحەت کاکەیی


ڕۆڤار 31

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات




**سەرپەرشتی گشتی**
**شێرکۆ بێکەس**

**ڕاوێژکار**
**ئەکرەم قەرەداخی**

**سکرتێری ڕۆڤار**
**یاسین عومەر**

**سەرپەرشتیاری هونەری**
**قادر میرخان**

**مۆنتاژی کۆمپیوتەر**
**یادگار ئەوڕەحمان**

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات

**ناونیشان**
سلێمانی فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

ت: 3120690

**لە دەرەوەی وڵات**
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

**Web Site**
www.sardam.info

**Email**
rovar@sardam.info

چاپخانەی (شڤان)

## مەدحەد کاکەیی



ساڵی 1954 لە کەرکوک لە دایکبووە، ساڵی 1976 بەشی پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی بەغدای تەواو کردووە. ساڵی 1979–1980 ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی سان فرناندۆ مەدریدی لە ئیسپانیا تەواوکردووە. چەندین پێشانگەی تایبەتی سازکردووە. بەشداری چەندین پێشانگەی هاوبەشی کردووە. دوایین پێشانگەی بە هاوبەشی لەگەڵ وەلید ستی لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی سازکرد.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، ڕەفیق چالاک.

# بۆ هەرکەسێ کەمەسەلەکەی مەبەستەو بۆ ئەو کەسەشی کەمەبەستی نییە

سەلیم بەرەکات
نووسیوویەتی
جەمال غەمبار
کردوویەتی بەکوردی
و ئامادەی کردووە

## چەند پەیڤێك پێش وەرگێڕان

*زمانی سەلیم بەرەکات وەك تۆو وەشاندنی نێو زەوییەکی کێڵراو وەهایە، لەنێو ئاپوورەی زەمەن و لەنێو شەپۆلی ڕەنگی شوێندا. زمانی ئەولەو گورزە تیشکانە دەچێت کاتێ دەتەوێ ڕاویان کەیت(بەدەست ناگیرێن و، کاتێکیش دەتەوێ ڕەمایان کەیت لەلاپێ دەست نابنەوە...) ئەوەی مایەی سەرنجە، نووسەرێکی بەرچاوی کورد، بەئاکار و ئەدگار و زمان کورد، بەمەووشتی کورد کەچی کە بەعەرەبی دەنووسێ، وەك ئەوە وایە بەووردە چەوی سپی چەندین بازنەی گەورەو بچووك لەسەر ڕووی ئاوی زمان دروست بکات و، لەپشت هەر پەیڤ و ڕستەو دەستەواژەیەکیشەوە. گوڵی چەندین مانات پێ دەبەخشێ. نووسینی سەلیم بەرەکات بۆ تەرجەمەکردن هێندە سانا و خۆش دەست نییەو، وابەئاسانی خۆبەدەستەوە نادات. بۆیە لەتەرجەمەدا، بەتایبەتی بۆ ئەم نووسینەی، دەبێ وەرگێڕ جارێکی دیکە هەویری پەیڤەکانی وێ هەڵشێلێ و خۆماندوو بکات و بەئەمانەتەوە ڕوئیای ئەو بگوێزێتەوە نێو پانتایی ئەو زمانەی کەبۆی وەردەگێڕێ.*

*ئەم نووسینەی سەلیم بەرەکات، وەڵامدانەوەیەکی(مەحوی) یانەیە لەشابەیتی(لەپاداشتی قسەی سەرداهەمە ئاد و هەناسەی گەرم، کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێ دەگرم) بۆ ئەو نووسەرانەی کە گوایا بەرەکاتیان تۆمەتبار کردووە بەوەی سواڵی تەرجەمەی بەرهەمەکانی خۆی دەکات بۆ سەر زمانەکانی ڕۆژئاوا... وێڕای داکۆکی کردن لە تۆکمەلی بەرهەمەکانی، داکۆکی یەکی جوان و شاعیرانەش لە کوردبوونی خۆی دەکات.. لەتەرجەمەکردنی دا، هێندەی چوارچێوەی فیکریی و ڕوئیای دەوڵەمەندی سەلیم بەرەکات ڕێگەیان دابێ، هەوڵی جارێکی دیکە دارشتنەوەی نووسینەکەیم داوە بەزمانی کوردی بەڵام بەئەمانەتەوە... هیوادارم چێژی نووسینەکەو، ئەو مانایەی کەلەپشت دێرەکانیەوەیەتی بگاتە خوێنەر.*

وەرگێڕ

لەم سالأنەی دواییدا، کەسالأنێك بوون تووڕدرابوونە نیوّقیامەت وتالووکەی شەڕێکەوە کە ئەو هەندە مێژووەشی بۆ عەرەب مابۆوە، کردیە پەند و عیبرەتی زەمانە.. ئالەم سالأنەدا، واتەواتێك کەوتە بەرگوێم- منی نووسەری ئەم چەند دێڕەی کەبەو مەرەیە برام- لەسەرەتادا گومانی ئەوەم کرد کە ئەو واتە واتە جۆرێکە لەگەمەی پولبەندکردن، کەچی لەگەڵ هەڵکشانیا، لەگەڵ تەشەنە سەندنیا، ئەو گەمەیە بەرگی ڕەگەزپەرستی لەپۆلێن کردن، لەبەر کرد.

ئەو دەزگاو نێوەندانەی کە(بنووس)انی ڕەخنەی "ئەکادیمیی" لەخۆ دەگرن، ئەوانەی، کەلە قوتابخانانەی ریالیزمی سۆشیالیزمدا لە قوتابخانە هاوشێوەکانی ئەودا، بەهەتیویی ماونەتەوە، هەروەها گروپێك لەو کەسانەی کەپاش گومڕابوونیان لە نێو ئومەمیەت و هاوشێوەکانی ئومەمیەتدا، ئەمێستا گەڕاونەتەوە نێو قاوغی "ئەوپەڕی بەعەرەب بوونی خۆیان" ئەو جۆرە بنووس و گروپانە، ماوەیەکە کەوتوونەتە تاووتوێ کردنی، یان خستنە بەرباسی "شەرعیەتی" کارکردنم لە نێو سیستمی نووسینی عەرەبیدا.. هۆی ئەمەش، بەسانایی بریتیە لەوەی من بەرگ و پانتۆڵێکی وەهام بۆ باوکی خۆم دەست دروو نەکردووە کەلەتەك جل و بەرگی عەرەبیدا تەماهی بکات و، وازم لەدایکیشم هێناوە هەر لەو پۆشاکەی خۆیدا بمێنێتەوە کەلەو جل و پۆشاکە نەچێ ژنانی پایتەختەکان دەیپۆشن.. دواتر لەهەردووکیشیان گەڕاوم تاکو بەزمانی کوردی قسە بۆ دراوسێکانیان بکەن بێ ئەوەی چ پێشوازییەك لە پلانەکانی(نەهێشتنی نەخوێندەواری) بکەن.. ئەو پلانانەی کەنەك بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری نەبوون، بەڵکو بۆ نەهێشتن و سڕینەوەی ئەو زمانە کوردییە بوو: کەلەوێنەی حەرفی عەرەبییدا بەمەعریفەی گشتگیریی و ئەزەلی، هێنراوەتە قسە



ماوەیەکی کەمیش بەر لە ئێستا، وەك نموونەیەکی ناجۆری بڵاوبوونەوەی ئەو گومان و واتە واتە کەسێکی بەناو ڕەخنەنووس دەزگایەکی چاپ و بڵاوکردنەوەی(لەوتارێکی ئاشکرایدا بەزمانی ئینگلیزی) بەوە ڕاسپاردە کرد نەکەوێتە ئەو(داو)ەی، کەباقی‌ی دەزگاکانی دیکەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژئاوایی تێ‌ی کەوتبوون... چونکە گوایا من- بەپێ‌ی قسەو هەڵبەستە ناجۆرەکانی ئەو ڕەخنەنووسە- نووسینەکانم بەمەبەستەوە، ئاڕاستە گیری ڕۆژئاوان و، وەکی دیش گوایا بەمەبەست دەچمە پای بەکارهێنانی "ئاسانیی" بونیات و، ئاسانیی زمانەوە، بۆ ئەوەی دەربڕینی "میحنەت"ی گەیشتنی تاکی کوردی لەنێوەی ڕێ‌ی سەفەرەکەیدا بەرۆحی خۆی، بەمەرگی خۆی، بۆ کاری وەرگێڕان مەیسەر بکەم.

من ئەو نووسەرە نیم، لەدوای شەڕی کەنداوەوە بارودۆخی "کەمەنەتەوەیی خۆی- (قلیتە" بکاتە هۆکارێك بۆ هەڵکشانی خۆی و بۆ ئەوەی بیخاتە بەردەم "بەزەیی" ڕۆژئاواوە، بەزەیی بەرامبەر "شوناسەکەی خۆی"

ئەو نووسەرە نیم کەلەدوای شەڕی مەرگ ئاوەری کەنداوەوە سواڵی پەرچڤەی بەرهەمەکانم بکەم.. کورد بوونی من لەو کاتەوە دەستی پێ نەکردووە کە(جۆرج بوش) ئیعترافی بەو قەتڵو عامە کرد کەلەسەرەتادا گوێ‌ی خۆی لێ خەواندبوو، لە سۆنگەی ئەوەشەوە من بێم و بڕیاری قۆستنەوەی هەلی ئەو ئیعتراف پێکردنە بدەم و لە پشت وەئاگاهاتنەوەی ویژدانی ئەوەوە پەلە قاژەی ئەوەبکەم بەرچڤەکاران بەرهەمەکانم تەرجەمەی زمانی یانکی‌یەکان بکەن... یانکی‌یەکان قەبیلەیەکی دێرینی ئەمریکان- وەرگێڕ" بەش بە حاڵی خۆم بەشێوازو زمانێکی هەڵایساوی وانووسیومە، کەمیتاڵی مسینی کورد هەڵبکوڵێ و، هەتا سەر

ئێسقانی بە خەڵووزبووی کورددا، ڕۆبچێ... لەکاتێکدا هەر بۆ ئەوەی کارەکانی منیش بەتەرجەمەکردن شاد بن، خۆ دەمتوانی تەگبیرێکی سانا بۆ بەجێ هینانی ئەو مەبەستە بکەم وەك بەکاربردنی یان خستنەگەڕی شێوازێکی ئارەوانی ئینشا ئامێزی تێکەڵ و پێکەڵ... ئەوسا بەرهەمەکانی منیش وەك هیی هەندێ کەس، بەهۆی ئەو خەبیرانەی کە وەك(کیلی) عەقڵی دەزگاکانی چاپ و بلاوکردنەوەن و لە ژێر کاریگەریی دۆستایەتیدا هەموو شتێکت بۆ ڕایی دەکەن، دەکرا بەهەمان دەستوور بەرچڤە بکرێن. وەك چۆن چەندین کاری تەرجەمەکراو هەن لەسەر جزوەیەك قاوە پامال دەکرێن. من ئاراستەگیری زمانێکی دیکە نەبووم لەپێناوی تەرجەمەدا، بەڵکو هەمیشە ئاراستەگیری تەرجەمەکردنی گیانی کوردبووم بۆ ئەو زمانە عەرەبییەی کەهیی خەڵکی عەرەبی شەریکمە، ئەو خەڵکە عەرەبەی کە پێویستە پاش ئامۆبوونی بەصەحوەتی نەتەوەیی خۆی، من"بناسیّ"... منی کورد... ئەو صەحوەتەی کەناچاری کردم شارەزای کون و قوژبن و، ورد و درشتی زمانی خاوەنەکەی ببم. ئەو زمانەی کەتوانای دابینکردنی ئازادیی خۆمی لەڕووی بەلاغەتەوە بۆ فەراهەم کردم، توانای ئەوەی پێبەخشیم کەلەفەزای فراوان و بەخششی بەپیتی خودی ئەو زمانە خۆیدا. تەدارەکێ بۆ دۆزینەوەی شوناسی خۆم ساز بکەم ئەو زمانە، عاشقانە هاتە ناخمەوە هەر بۆ ئەوەی ... ئەو مانایە بسازێنم کەهەر کوردێك شایانە بەوەی ئەو مانایە بناسێتەوە وەك چۆن ئەو مریشکانە دەناسێتەوە کەدایکی بەخێویان دەکات و، ئەو تووتنەشی کەباوکی بەکاری دێنێ.

لەڕاستیدا ئەوەی مایەی سەرنج لێدانی ئەو"واتەواتە" یە کەئەنجامو بەرهەمی" گومانکردنە" لەخواستە ڕاستەقینەکانی ئەدەبەکەی من، ئەوەیە کەوەها(واتە واتێك) لەو نێوەندو دەزگاو کەسانەوە چرپ و هوڕی لەسەر دەکرێ و بڵاودەکرێتەو و ڕەواجی پێ دەدرێ کەهەمان ئەو نێوەندو دەزگاو کەسانەن ڕۆژانێ چرپ و هوڕ یان هەڵلای بانگەشەکردنیان بوو بۆ پیرۆزکردنی"صەدام حسێن" و خۆڕاگریی و قارەمانێتی ئەو!! ئەو خۆڕاگرییە وەهمیەی کەلەسەر داروپەردووی شەڕەکان کەڵەکە کرابوو، ئەو پیرۆزکردنەش خۆی لەخۆیدا گریانێکی تیمساحییانە بوو بۆ بنەماو پادگاکانی ئەو بەعەرەب بوونەی کەوردوخاش کرا!

لێرەدا دەکرێ دەست تێکەڵاوکردن یاخود ڕێککەوتنی ژێر بەژێری صدام و ڕۆژئاوا وەبیر بهێنینەوە، ئەو ڕێککەوتنەی بۆ ماوەیەکی زەمەنیی درێژخایان. دەنگ و سەدای زەرەرو زیانەکانی دەنگی دەدایەوە... چونکە هەمان ئەو نێوەندەی باسمان کردو لە ئێستادا بانگەشەی ئەوە دەکات کە نێوەندێکە خۆی"تەیاروپڕچەك کردووە" بەباس و خواستەکانی بەپیرۆز ڕاگرتنی دیموکراسی و بایەخدان بەمەسەلەی جیاگەرایی(الاختلاف). هەمان ئەو نێوەندو گروپە دەیانەوێ بەتەنێ دەروازەکانی ماناو دیاریکردنی خەسلەتەکانی مانا بۆ خۆیان قۆرخ و پاوان بکەن. بەمجۆرە"ئوسولیەت"ێکی نوێ بۆ خوێندنەوە بەدی دەکەین، ئەو "ئوسولیەت"ەی کەتەعبیری یان دەستەواژەی"کەمە نەتەوەی برا-الاقلیة الشقیقة- بەجۆرێك لەدەست درێژیی ئەداتە قەڵەم بۆ سەر ئامانج و خواستەکانی خۆی... ئەو ئامانج و خواستانەی کە بریتین لە قۆرخ کردنی ڕا دەربڕین بەو ئاراستەیەدا کەبەتەنێ خۆی باوەڕی پێیەتی... دیارە سەنگ و تەرازووی ئەم تێڕوانینەش، سەنگ و تەرازوویەکی شکاوە، واقعێکی خراپ و، جۆرێك لەستەم و ڕەتاندن فەراهەم دەکات و، ڕەتکردنەوە یان سڕینەوەی شوناسەو پێویستی بەرەخنە لێگرتن هەیە... ئەم"ئوسوڵیەتە" لەگەڵ ئوسوڵیەتی ئیسلامیی هاوزای خۆیدا یەك دەگرێتەوە، ئەویش بەوەی کە ئەگەر دەسەڵاتی بۆ بڕەخسێ دەبێتە ئەو هێزەی کە دیموکراسی بێ ئەرزش دەکات و دواتر ناوەڕۆکەکەی بەتاڵ دەکاتەوە و بەرەو مەشروعیەتی سڕینەوەی ئەوی دی(الغاء الآخر)ی دەبات.

ئەم نێوەندە، نێوەندێکی هێندە فەساد زەدەیە، بەهۆی تێشکانەکانی زمانی خۆیەوە لەبەرەی ئومەمبەتدا"دەشێ سەلیم بەرەکات مەبەستی فاسیدبوونی خودی نێوەندەکەیە نەك مەسەلەی ئومەمیەت وەك بیروباوەڕێ کەهەر کەس ئازادبێ لەپیادەکردنیا- وەرگێڕ) دەتوانێ صدام حسێن لەگەمەیەکی ئابڕوو بەرانەی سۆز ئامێز بهێنێتە دەرێ و بیکاتە قارەمانی ئەو ڕووبەڕوونەوانەی کە بەدروشمێکی درۆزنانە ڕووپۆش کراوە، ئەو دروشمەش: کۆبوونەوە و کۆك بوونی"ئیمپریالیزم"ی جیهانیی‌یە لەدژی عێراق.!!

هەرچی حیکایەت و ورد و درشتی مەسەلەی ڕەفتاری سەدامیشە بۆ ڕاکێشان و داوەتکردنی(ئاگا مەمنون) بەرەو لای قاشە سێوەکانی کەنداو، هەروەها ڕەتاندن و لەبن هێنانی وزەی عیراقە لەشەڕی بێ هوودەی دژ بە بەرەی فارس و، دواتریش بەزۆر هەڵتۆقاندنی ژیانی"فرە حزبی" لەسەر دەستی هەردوو ئامۆزا جوانەمەرگەکەی و! هەردوو کوڕەکەی خۆی و، پاشان هەڵپەڕاندنی دیموکراسی لەسەر خوانی"ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌ی شۆڕش" و ماکیاژکردنی گەڕان لەدووی ئەڵغازی بریقەداری جیهادکردن و، پاشانیش ناونانی مەهزەلەیەك بەناوی"ام المعارك" دایکی شەڕان کە خۆی لەخۆیدا ناونانێکە دەلالەت لەسووکایەتی کردن دەکات بەمێینە نەخوازەلا لەشەڕێکی دۆڕاودا کەهەرچی مەرگەسات و خوێن ڕشتن هەیە بەسەر مرۆڤدا هات، کەچی ئەو دێت و ئەو شەڕە بەناوی دیکەوە ناو دەنێ(ام المعارك) کەنەك هەردایکی شەڕان نەبوو، بەڵکو دایکی سەرکەوتنی، بەدۆڕاندن تالانفرۆش کرد!

دیارە سەرجەمی ئەو شتانەش، هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی، لەدەوری ئاکامێك یان لەمەداری ئەنجامێکدا خەریکی خول خواردن و سووڕانەوە بون کەئەویش گوایا دوا"حەصانەت"ی نەتەوە بوو لەتاقە ڕەمزی"ڕەتکردنەوە-رفض" ی ملکەچکردندا کە بەحساب هەر ئەم ڕەتکردنەوەش بوو. پێشتر ئەوەی بەسەر سەدام حسێن-دا سەپاند ئەو ئاگری یاخیبوونە دابمرکێنێتەوە کەلەدژی ئەو(حەصانەت)ی نەتەوەیە لە کوردستانی عیراقدا هەڵایسابوو، ئەویش بەجاڕدانی"غەزاکانی" ئەنفال و، بەخشینی جۆرێك لەبەرەکەت و پیرۆزیی ناوەکەی-واتا ئەنفال- بۆ ئەوەی سەربازێ کەماڵ و خانەی هاوڵاتیەکی دیکە تالان دەکات. جارێکی‌تر ماناکانی دەوڵەت- ئەو دەوڵەتەی کە قەلای سەختی عەرەبە- بگێڕێتەوە سەر ئەسڵ و خەسڵەتە سروشتی‌یەکەی خۆی کەسروشتی جەنگەڵە پاشان زمانی تالانکردن ببەخشێتەوە یان بگێڕێتەوە بۆ گوتاری دەوڵەت!

دواجار ئەسڵ و ئەسەبی(ئەنفال) لەسەمتە دینی‌یەکەیدا وەك دەلالەتێك بخوازێ و بیکاتە ڕەمزی گەورەیی هێزێك کەپێی دەوترێ هێزی ڕەهای خێر کەگوایا لەخانەوادەی حزبی بەعسدا خۆ دەنوێنێ، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هێزێك کە گوایا هێزی ڕەهای خراپەو جەستەی ئەو

هێزه شەرواڵی کوردی لەبەردایەو، جامانەی کوردی لەسەردایە.. لێرەوە من دەپرسم، بڵێی واتەواتی ئەو دەزگاو نێوەندانەش لەبارەی ئەوەی کەگوایا ئاراستەی ئەدەبی کوردیش، ئاراستەیەکە بەرەو(رۆژئاوای شەڕانگێزو خراپەکار) کاردەکات، دەپرسم، بڵێی ئەو واتە واتەش بۆ خۆی هەڵگیرسانی فتیلی(ئەنفال)ێکی دیکە نەبێ لەبەرەیەکی دیکەوە؟! من نازانم، ئەوانە چۆن لەئاستەکانی تەعبیرکردنی هەتا سەر ئێسك کوردانەی من بۆ چارەنووس و بوون و توانای کوردەوە تێدەگەن... یان بۆچی وەهای تێدەگەن کە گوایا بانگەشەیەکە بۆ سازدانی چەترێکی پاراستن لە جۆری(پرۆڤاید کۆمفۆرت-Provide Comforta ).(پرۆڤاید کۆمفۆرت- مەبەست لە دابینکردنی هێزی چەکوشی ئامادەو پشتێنەی ئەمنییە بۆ کورد- وەرگێڕ)، ئەوەش بەڕای ئەوان گوایا بانگەشەیەکە بۆ ئەوەی رۆژئاوا دەست وەرداتە سەروەریی دەقی عەرەبییەوەو بێ ئەرزش کردنی یان کاڵکردنەوی رووە گەشەکانێتی؟!

ئەو کاتەی رۆژئاوا هاتە سەر ئەو قەناعەتەی کە دەستی یارمەتی لەشێوەی پارێزگاری کردن لە کوردان درێژبکات، ئەو قەناعەتە لە خۆڕانەبوو، بەڵکو لە کاتێکدا بوو کوردەکانی عێراق بەنیوە مردوویی رچەی توولەڕێو، ڕێ وبانە بەفراوییەکانیان دەشکاندو بە هەزارانیان خۆیان ئاودیوی (تورکیای نەرم ونیان!)دەکرد هەر بۆ ئەوەی لەو مەرگە حەتمییە دەربازبن کەکۆپتەرە سەمتیەکانی سەرۆکی فەرماندە! وادەو بەڵێنی بەسەردا بارینی پێدابوون.

بڵێی کوردان، غەدرێکیان لەرۆحی عەرەب کردبێ ئەو کاتەی چەتری کەسێکی غەریبی غەیرە عەرەبیان قەبووڵ کرد بۆ ئەوەی لە بارانی مەرگیان بپارێزێ، ئەو مەرگەی کە گازی بەرەحم و شەفەقەتداری"خەردەل" لەکارگەکانی دروستکردنی پەینی کیمیاوییەوە دەیگواستەوەبۆ نێو ئێسك و پروسکی بەشەر؟!

کەواتە، دەکرێ بڵێین، کوردان، ماڵویران خۆیان! کوردان، خۆیان دەزانن کەرۆژئاوا، ئەو سەروەختەی بێ دەنگ بوو لە میحنەتەکانی وان، چ غەدرێکی لێکردن... ئەو کاتەی کەگوێی خۆیان لەسەرجەمی ئەو ماڵوێرانکردن و کاولکارییانە خەواندبوو کە صدام بەسەری هێنان.. ئەو کات، ئەم ناوچەیە باشترین یان بەپیت ترین کێڵگەبوو بۆ تێدا وەشاندنی تۆوی وەبەرهێنانە ئابووریەکانی رۆژئاوا خۆی... بەڵام کوردان چیبکەن... چی... لەوە زیاتر کوڵی قورسی عەزابێ هەڵبگرن و لەنێوان دوو جۆر هەراو زەنادا گێژو کاس بێن. لەملا هەراو زەنای هارین و لە ناوبردن و، لەو لاشەوە هەراو زەنای وادەو بەڵێنەکان...!

ئاواتی کوردان، رزگاربوون بوو لەکۆت و پێوەندی کۆیلایەتیی خانەوادەی بەعسییان و، ئەوانەی بەدەست و پلی کیمیاوییەوە، تیربارانیان دەکردن... کەچی رۆژئاوا وادەو بەڵێنەکانی بەجددی نەبردە سەرو لێیان پەژیوان بۆوەو، هێندەی لەلابەس بوو کەلەو تخووبەدا راوەستێ بەتەنێ پرۆسەی چاودێری بخاتە سەر عێراقێکی داوەشاو بۆ ئەوەی زامنی کۆنترۆڵکردنی خۆی بکات بەسەرکانی و شادەمارەکانی خوێنێکی جیهانیدا کەئەو خوێنەش نەوتە!

لێرەوە بەو بنووسانە دەڵێم ئەدی بۆ ئەو بەرهەمە ئەدەبییە عەرەبییانەی کەتەعبیر لەئیستبدادی دەسەڵاتە عەرەبییەکان خۆیان دەکەن، ناچنە خانەی پاڕانەوە لەڕۆژئاواو بزاواندنی بەزەیی ئەوان و، سواڵکردنی تەرجەمەی ئەو بەرهەمانە بۆ زمانی خۆیان؟! ئەوە من نیم، پەنام بۆ بزواندنی ئەو بەزەیی و شەفەقەتە بردبێ لە پێناوی تەرجەمەکردنی بەرهەمەکانمدا... ئەو جەمعە کوردەی کەمن لەبارەیانەوە شتم نووسیوە، جەمعێکی هەمە چیزەن... جۆرەها کەسێتیی سەیریان تێدایە دز، جاهیل، بەهێز، رەتێندراو، کەللەشەق، رووخاو، پیاوکوژ، چاونەترس، زاناو، نەخوێندەوار... من نەهاتووم گوندەکانی کوردان بکەمە چەند یاریگاو گەمەخانەیەك بۆ هەڵتۆقاندن یان سازدانی وێنەو هۆشمەندییەکی درۆزنانەو دەمامکێکی ساختەی حەتمیەتی رزگاربوونی مێژوویی!!"

ئەز، بۆیە لەبارەی کوردانەوەم نووسیوە، چونکە خۆم کوردم... دەروجیرانەکەم کوردن، کەس و کارم دابەش بوونەتە سەرگوندە کوردییەکان و ژیان و گوزەرانی تێدا دەقەتێنن، بەکوردیی دەئاخڤن و، نوێژەکانیان بەزوبانی عەرەبی ئەدا دەکەن و، تەنانەت لە زمانی کورداندا لە فزێکی تایبەت بە(اللەی جل جلالە) هەیە و،(خوا)یەکەی ئەمانیش هەمان ئەو (اللە)یەیە کە عەرەبان دەیپەرستن... ئیدی بۆ دەبێ لەبارەی بوونەوەرێکەوە نەنووسم کە زمان دەخاتە سەر ژانی لە دایك بوونی حەقیقەتی خۆی چ وەك ئەدگار و دیمەن و، چ وەك ئەوەی زمان لەلای ئەویش سیستمی کۆمەڵێك پەیوەندییە؟! بڵێی ئەو من بم کەدەست وەرئەدەمە "کاروباری ناوخۆ"ی ئەم هەرێمانەوە؟! بڵێی خودی کورد بەشێك بێ لەو"کاروبارە ناوخۆیی"یەی کەبەر لەدەست بردن بۆ باسکردنی، دەبێ نووسەر روخسەت یان مۆڵەت لەسانسۆری عەرەبی وەربگرێ بۆ ئەوەی بەپێی بنەماو ڕێساکانی رۆنانی کردارەکانی نێو زمانی عەرەبی(تصریف افعال اللغە) کوردانیش وەها بخرێنە خانەکانی رۆنانەوەو خاڵ و نیشانەکانی ئیعراب کردنی ئەو زمانە بخرێنەسەر پاش پرتکی ناوەکانیان؟!

بڵێی کوشت و کوشتار بەشێك بێ لەکاروباری ناوخۆو دەست بردن بۆی قەدەغەبێ؟ ئەی سەربڕین و لەت وپەتکردن کاروباری ناوخۆن... رژێم وسیستمی حوکمڕانیی کاروباری ناوخۆیە... ئەی بڵێی زیندانیی کردنی بێ موحاکەمە کارێکی ناوخۆبێت؟ گرتن و فڕاندن و بێسەرو شوێنکردنی ئینسان کاروباری ناوخۆن... پاداشت و سزادان هەردووکیان کاروباری ناوخۆن... ئەی بەکوردیی ئاخاوتن و، بەکوردیی نووسین و، بەکارهێنانی حەرفە کوردییەکان، بڵێی ئەمانە هەموویان بەشێك بن لەکاروباری بڤڤەی ناوخۆ؟ ئەی خودی کورد خۆی لە هەرێم و دەڤەری شەریك و برا بەشەکانی خۆیدا، بۆ دەبێ بەشێك بێ لە کاروباری ناوخۆ؟

ئەگەر سەرجەمی ئەوانە، کاروباری ناوخۆن و دەست بردن بۆیان وباسکرنیان بەشلوێکردنی کاروباری ناوخۆ بدرێتە قەڵەم، ئەدی بۆچی کەسانێك هەن دەست وەرئەدەنە باسکردنی میحنەت و ئازاری چینییەکان، ئەفریقاییەکان، لاتینیەکان؟! ئەدی بۆچی سەرکۆنەو لاقرتێ بەبینوشێت و چاوچیسکۆو عیدی ئەمین وسیسی سیکۆو مارکۆس دەکرێ؟! ئەی مەگەر ئەوانەش ولاتەکانیان نەکردۆتە تەویلەیەکی تەلبەندکراوو رەعیەتەکانی خۆشیان بەکۆمەڵێ ئاژەڵی دەست و دەم شەتەك دراو؟!

ئەو فیشەکە گڕدارانە ناو دەنێن چی کە(علی حسن المجید) لە جەستەی قوربانییەکدا پاش تێراو کردنی ئەو جەستەیە بەبەنزین، تەقاندۆتەوە؟! ئەی رەفتاری برای سەرۆکی ولاتێکی دیکەی عەرەبان ناو

دەنێن چی کەکەیفی بەوە دێ لەسیناریۆیەکی ساختەدا رێگا بۆ نەیارە زیندانی کراوەکانی دەسەلات خۆش دەکات لەزیندان هەڵێن بۆ ئەوەی پاشتر بەتاپرو تفەنگی راو، راویان بکات؟!

یان فراندن و لەناوبردنی کەسانی نەیاری رژێمێك کەلەولاتێکی دیکە بەپەناهەندەیی دەژی، چی ناو دەنێن؟ بەرێزینە! دیارە ئەوانە هەموو"کاروباری ناوخۆن"! بەڵێ کاروباری ناوخۆ... بلادەی وەعزی دانی ناشرینی خۆتان لەمەڕ-کاروباری ناوخۆ- وەتەواوکەن... خۆتان لەگلەیی و گازاندەی دنیا ببوێرن...! هەرگیز بەکارێکی ترسناك نادرێتە قەڵەم و، بگرە خیانەتزەدەییش نییە ئەگەر مرۆ، نوێژو نزای ئەوە بکات کەلەهەر لایەکی دەرەوەی خۆیەوە بێ، دەستی فریاد ڕەسی بۆ درێژبکرێ، فریاد رەسییەك ئازادیی بۆ بگێرێتەوە مەداری خۆی، ئەو ئازادییەی لە ئاکامی شەق شەقێن پێکردن و ژێر پێ خستندا دووچاری لە هۆش خۆچوون و بێ نموودیی هاتووە... ئەو نێوەندەی کە هەڵوێستە ئینسانییەکان، بەدەست تێوەردانی کاروباری ناوخۆ ئەداتە قەڵەم و تۆقیوە لەوەی کەستراتیژیەتی نەتەوەیی عەرەب دووچاری هەرەس پێهێنان دەبێ، ئەوانە هەمیشە پێیان وایە کەدەبێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە گۆڕانکارییەکان لەناوەوە رووبدەن، پێیان وایە لێگەڕێن با هۆکاری ناوخۆیی گۆڕانکاریی بەرپا بکات نەك دەستێوەردانی دەرەکی، پێیان وایە تەنهاو تەنها هاوکاری پوخت و عەیارە بیست وچواری ناوخۆ! وەك زللەکەی کێم ئیل سۆنگ" ئەو زللەیەی کە زنجیرە شاخێکی سەخت لەبن دینێ" لە توانایدایە ئاگرو ئاسنی رژێمەکانی ناوخۆ رابماڵێ... مەسەلەی"کاروباری ناوخۆ" ئێستاکە بۆ تەسکەی لێدراوی ئەودراوە هاوبەشە ئەخلاقییەی کەرژێمەکان خۆیان دروستی دەکەن و، بۆتە جۆرێك لە"پەیماننامە یان رێککەوتننامە"ی جاڕدراوی نێوان ئەو رژێمانە بۆ ئەوەی هیچ کامیان رێگا بەفاکتەرێکی دەرەکی نەدات تاکو نەیارانیان رام و تەیار بکات دژی ئەوەی دی و ئەوسا کارەکە ببێتە جۆرە عورفێك و ئەوەی دژ بە(س) ئەنجام دەدرێ، هەمان شت دژ بە(ص)یش بکرێ.

ئەمێستاکە(فاکتەری ناوەکی) وتەزایەکی هێندە بەرەواجە بۆ خۆ پاراستن و بەتۆکمە راگرتنی عەرشەکان، نرخ و رەواجی زۆرترە لەگەنجەکانی قاروون. بەلام ئەز دەپرسم. دەبێ خاڵی جیاکەرەوە و خەسلەتی "هەلاوێریی کورد- التمییز الکردی" لەچیدابێ کەمن بێم و بەناراستەگیریی رۆژئاوادا کاری تێدا بکەم بۆ ئەوەی وا لە رۆژئاوا بکەم بەهەڵەداوان بێت بەپیرمەوە و وەك فاکتەرێکی دەرەکی ببێتە پاڵپشتێ بۆ رێنیشاندان و چۆنێتی وەبەرهێنانی واقیعێکی "ئالتوونیی!" پڕ لە گومڕاکردن؟ ئەگەر نووسینەکانی من لەبارەی کوردانەوە ببنەمایەی خراپ هاندانی "تحریض" تەرجەمە کاران بەمەبەستی (خرۆشاندن)ێکی غەرەزدار لەوەها بابەتێکدا، ئەوا کارەکە مانای ئەوە دەبەخشی کەواقیعی عەرەبی، بەحسابی ئەوان واقیعێکی پاك و پوختەو بێ غەل و غەشەو، تەن دروستەو ئەو واقیعە گوڵزاری دەروونەکان بە ناوی ئارامیی ئاوپرژێن دەکات و، ئیرادەیەکی عادیلانەی هەیە(؟!!).

من لە ماڵێکداگەورە نەبووم، فێری ئەوە کرابێتم کەئەو قوڕەی منی لێ شێلراوم جیاوازە لە قوڕەکانی دیکەی ئەم دنیایە. باوکم کەبەنازناوە ئایینییە بچووکەکەی خۆی بە(مەلا) ناسرابوو، وای لە عەرەب دەنوڕی کەئەوانە خزمانی نزیکی حەقیقەتن چونکە شالقی درەختی پێغەمبەرایەتین، ئەو شالقەی کە سەوزترینی لقەکانی خەلیقەتەو، ئەوان خیتابی خواوەندن بۆ دنیای فانی... کەچی منی کوڕی ئەو باوکە، ئەو رۆژەی کە بەراگوزاریی لە قوتابخانەدا زارم هەڵچڕیی و ویستم لەبارەی رەگ و ریشەو بنەچەی کوردانەی خۆمەوە بدوێم، ئیدی ئیدارەی قوتابخانەکەم دۆزەخی موحاکەمەیەکی وای بۆ داخستم وەختەبوو ئێسك و پروسکمی تێدا ببێتە قەرەبرووت... سەرجەمی مامۆستاکانی قۆناغی خوێندنی ئەو دەمەم کە قۆناغی سێی ناوەندی بوو بەپەلە کۆبوونەوەیەکیان سازدا بۆ ئەوەی جەرەیانی موحاکەمەکە ببەنبەڕێوە، جگە لە دوو مامۆستا کەیەکەمیان کۆمۆنیست بوو دەرسی کیمیای پێدەوتینەوەو، دووەمیشیان مامۆستایەکی فەلەستینی بووە دەرسی جیۆگرافیای پێ دەوتینەوە، باقی مامۆستایان لەسەر ئەوە کۆك بوون کەعەقڵ بهێنمەوە بەرخۆم و مەسلەکی حەقیقەت بەرنەدەم.. مامۆستای ئەدەبی عەرەبی کەپیرە مامۆستایەکبوو، بەرستەیەکی درشت پێی گوتم:"ئەگەر بانگەشەی ئەوە دەکەیت کەبەبنەچە کوردیت، ئەوا بگەڕێوە بۆ تورکیا....!" کەواتە، بەنەزەری وی، کوردان بەتەنێ لە تورکیادا هەنو!! شەقی زەمانە توورِی هەڵداونەتە ئێرە... بەلام هەرچی خۆمم، پێشتر ئەوەم دەزانی کەباوکی باپیرەم لەدەڤەرەکانی کەناری قەزوینەوە بەرەو خاکێك هاتووە کە چەندین نەتەوەو رەگەزی دیکەی تێدا نیشتەنیی بووە، خاکێك لەو دەم و زەمانەدا، خەریتەکان وێنەیان نەکێشا بوو، هێشتاکە هێڵ و تخووبە شین و سوور و رەشەکان، خانە خانەیان نەکردبوو...(بەواتا نەتەوەیەکی سەردەستی دیاریکراو نەبووە خاوەنی ئەو خاکە بێت- وەرگێڕ).. باپیرە گەورەی بابم لەوێوە هاتبووە خاکێکەوە هاو زمان و هاوبەرگ و کالای وخۆیی پێشتر لێبوون... کەسانێك لەو خاکەدا نیشتەنیی بوون کەوەك باپیرە گەورەی بابم خاوەنی داستانی ئازایەتیی و شکست و، خاوەنی داستانی بەزن و سوێی عیشق بوون، خودانی ئەو داستانانەش هەر لە کوردان بوون ... ئەو خاکە چەندین هەرێم و دەڤەری تێدابوو، هەر دەڤەرەی گوندێك بوو، ناوێکی کوردی هەبوو، دەساڵ بەر لە دایك بوونی من، سێ لەسەر چواری ئەم ولاتە، هێشتا بەرەسمیی نەببووە ولات... کەچی ئەوێ رۆژێ لە قوتابخانە مامۆستای عەرەبی داوای لێکردم"بگەڕێمەوە" تورکیا!! کەچی من، لەبەرامبەری قسەکەی ئەودا، داوام لەو نەکرد کەبگەڕێتەوە بۆ دوورگەی عەرەبی... بەڵکو پاش ئەوەی فەسڵیان کردم، سەرسەختانە کۆڵم نەداو"ئمتیحانی خارجی"م دایەوە و بەسەرکەوتوویی پۆلەکانی خوێندنی ئامادەییم تەواو کرد... ئەمێستاش، پێم خۆشە بۆ ئەو مامۆستایە بنووسم و پێی بڵێم، ئەوەتانێ پاش ئەوەی کەمێ لە ئاستەکانی ئەو(عروبەتە) دوورکەوتمەوە کە بەشەهامەتەوە چامە شیعرییەکانی شانازیی(اشعار الفخر بەڕێوەی دەبەن، ئەوەتانێ هاوزمانەکانی) هەمان ئەو مامۆستایە شوێن پێی من لەبەکارهێنانی زمانی عەربیدا هەڵدەگرن و وەکی تریش ئێرەییم پێ دەبەن و خوفیەکاریم بەسەرەوە دەکەن بۆ ئەوەی ئەو زمانە لە(ئیحتیلال) کردن لەلایەن کوردێکەوە رزگاربکەن، چونکە ئەوان پێیان وایە من ئەو زمانە دەکەمە هۆیەك یان پردێ بۆ تەرجەمەکردنی بەرهەمەکانم بۆ زمانی رۆژئاوا...!

من نەهاتووم، میللەتێك لەسەر پێوەری خەیاڵی رۆژئاوا بخوڵقێنم. لەهیچ دەقێکدا بێ حورمەتیم بەکەسێتیی عەرەبەوە نەکردووە... بڵێی هۆی ئەم واتە واتە ئەوە نەبێ کەموزاحەمەی هەندێ کەس، لەسەر بەشێ

لە خەیاڵی شوێنداریی(خیال المكان) دەكەم؟!... ئەگەر وایە، با ئەوانە بزانن كەئەو شوێنە شوێنی منیشە، وەكی دی بەشی منیشی پێوەیەو، ئەزیش وەك ئەوان مافی لەنوێ رێكخستنەوەی ئەو شوێنەم هەیە، مافی ئەوەم هەیە ئیزافەم هەبێت بۆی و، جارێكیدی لەپانتاییەكانی خەیاڵدا دای برێژمەوە، یان وەك خۆی وێنەی بگرم... ئەگەر ئەوان دەیانەوێ بەزۆر پۆلبەندیی من بكەن كەنووسەرێكی كوردم و لەدەرەوەی مەملەكەتەكەی خۆیاندام، ئەوا من هەرگیز بانگەشەی ئەوەم نەكردووە كە كورد نیم... بەواتایەكی تر، من نەهاتووم، كتوپڕ یان شەبەیخوونانە ئەوان"بخەڵەتێنم" بۆ ئەوەی"راوەسۆز"ی رۆژئاوا بكەم و وخەریكی"خراپ هاندان"ی تەرجەمەكارانی رۆژئاوابم.

من هەر لەسەروەختی نووسینی"دینۆكا بریڤا" وە لەساڵی(1973)ەوە، سەرقاڵ و وەدووكەوتووی دەستگیركردنی "زەمەنی كوردی"م .... با ئەوان بەئینسافەوە "زەمەنی كوردی" بخوێننەوە، وەك چۆن بەرهەمی تەرجەمەكراوی نووسەرێكی یابانی بەعەرەبی دەخوێننەوە و خۆشنوود دەبن یان گەشكە دەیانگرێ بەوەی كەشتێكیان خستۆتە سەر مەعریفەی خۆیان بۆ دنیا لەبواری خوێندنەوەی دەقێكی ئەدەبییەوە... ئەگەر وا نییە، بۆ دەبێ لەپشت دووكەڵی قسەو واتە واتی ئەوانەوە دژ بەمن، ئاگرێك هەبێ؟!

من سەنگ و سووكییم لەزماندا نەكردووە. سەنگ و سووكییم لەوەدا نەكردووە كەدەق بكەمە رووبەرێكی مەعریفیی و بارگرانی بكەم بەشەڕی مانا لە پێناوی مانادا... سەنگ و سووكییم لەسەر ئەوە نەكردووە كەخۆم و، خوێنەری بەرهەمەكانم راپێچ بكەمە نێو ئیمتیحانێكی قورسی واوە كە بگاتە سنوورەكانی بەلوغزكردن، بەو پێیەی ئەو بەلوغزكردنە دەروازەیەكە لەدەروازەكانی حەقیقەتی گەیشتن بەگومڕاكردنی هەمووان... منێك كەباوەڕم وایە لە نووسینەكانمدا پەنا ببەمە بەر بونیادێكی هەڵیساوو، بەر بەكاربردنی زمانێك كەلەرووی پێكهاتەوە لەتەرجەمەكردن عاسێ دەبێ، دەبێ ئەو رۆژئاوایە كامە بێت كەبەم هەموو بارو بارگە قورسەوە رووی لێ بنێم بۆ تەرجەمەكردن؟! جارێكیان دوو وەرگێڕ، یەك لەدوای یەك دەستیان دابووە تەرجەمەكردنی یەكێك لە رۆمانەكانم بۆ تاقە یەك زمان... هەردوو وەرگێڕەكە هەشت دانە ساڵی رەبەق پێوەی خەریك بوون، كە لەو هەشت ساڵەدا دەشێ سەدان رۆمانی عەرەبی تەرجەمەی زمانەكانی دیكە كرابن.

جارێكیان ژنە بەرپرسێكی تەرجەمەكردنی دەقە عەرەبییەكان بۆ زمانە رۆژئاواییەكان بۆی نووسیبووم، وتبووی:"بەرچڤەكاران بەدەم چاوەڕوانیی هاتنی میترۆكانەوە هەر لەسەر كورسی چاوەڕوانی دەتوانن بەرهەمی گەورەترین نووسەری ئێوە تەرجەمە بكەن، كەچی تۆ، نووسینەكانی تۆ زۆر سەختن... لەرادەبەدەر سەختن...)

من پێم وایە، ئەم حاڵەتەش، حاڵەتی هاسانیی تەرجەمەی ئەو بەرهەمە سادانە رەنگە لەوەوە بێ ئەو بەرهەمانە بەجۆرێك باوەش بە ئایدۆلۆژیادا دەكەن و"ئاوێزانی فیكر" دەبن كە بۆشاییەكی گەورە لەبواری داهێنانی هونەریی و پانتاییەكانی دیكەی دەقدا، وەك ئەو بۆشاییەی ئێستا هەیە، دەخوڵقێنن... سەرەراش، ئەوانەی كە گوتاری خۆیان لەسەر مەسەلەكانی دیموكراسی و جیاگەرایی پابەند دەكەن، خاتیمەی دەقەكانیان دەبەنەوە سەر نوختەیەك لەو چەندەها نوختە"ناوازانەی" كەلەبەیاننامەیەكی صدام و بەلاغەتی ئەو بەیاننامەیەدا هاتوە... رەنگە ئەوان بەوە، جۆرە گەمەیەكی تەسەللا بەخش ساز بدەن، بەڵام گەمەكە، گەمەیەكی خوێناوییەو بەدەم چاوەڕوانیی رزگاركردنی بیرۆكەی خۆیانەوە لە تۆفانی ئەو قەیرانەی گەمارۆی داون، سازی دەدەن.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی(الحیاة)- ژمارە12893





به‌شێك له‌

# شێره‌كولله‌ی ئاسنین

سه‌لیم به‌ره‌كات

وه‌رگێڕانی: عیسا چیایی

**( یاداشتی نیوه چڵی منالێك كه هیچ شتێكی نه‌بینی جگه له خاكێكی هه‌ڵهاتوو. بۆیه هاواریكرد. ئه‌وه ته‌له‌كانمه ئه‌ی قه‌تیكان )**

1 *وه‌رگێڕان و تێگه‌یشتن له نووسینی سه‌لیم به‌ره‌كات، كارێكی ئاسان نییه، ته‌نانه‌ت بۆ عه‌ره‌به‌كانیش كه به زمانی ئه‌وان نووسراوه.

وه‌كو خۆی ده‌ڵێ: (پاش یاریكردن به ئاسن ده‌ست ده‌كه‌م به نووسین) ئه‌و سه‌رچاوه‌یه‌ی سه‌رده‌وه له شێوه‌ی یاداشتدا نووسراوه، به‌ڵام خاڵی نییه له رۆحی شیعریتی. له‌م وه‌رگێڕانه‌دا پتر له هه‌موو ره‌هه‌نده‌كانی تری ئه‌م نووسینه پاراستنی ئه‌و رۆحه‌م له‌لا مه‌به‌ست بووه.

2 *ژێده‌ر/ سلیم بركات- الجندب الحدیدی- دار الطلیعة للطباعة والنشر- بیروت- الطبعة الاولی (یولیو) 1980.

**ده‌روازه:**

**(هه‌یداد.. ئه‌ی. مناڵه‌كه.. هه‌یداد..)**

**1- مه‌حاڵه ئه‌ی مناڵه‌كه مه‌حاڵ..**

چی ده‌بینی؟ ئه‌ی منداڵ تۆ چی ده‌بینی.؟ دوو ته‌پۆڵكه له ئاسۆداو بۆڵه گوندێك و خاكێك كه له نێوان هاوینێكی هه‌ڵه‌شه‌و زستانێكی گه‌مژه‌دا هه‌ڵده‌له‌رزێ.. و ژووانی تۆش ئه‌ی منداڵ ژووانی رووه‌كێ یان باڵنده‌یه‌كه.. چاوانت به‌سه‌ر كازیوه‌یه‌كدا داده‌خه‌ی كه له زنجیره‌ی ده‌مامكه‌وه هه‌ڵده‌وه‌رێ و به‌و مشتانه‌ت له‌غاوێكی ته‌م و مژاوی ده‌گریت. هه‌روه‌كو، تۆ خۆتت بۆ پیریی یان پیریی خۆی بۆ تۆ ئاماده‌كردبێت.. ئاوا پێكه‌وه ئه‌و سیحره كورت بكه‌نه‌وه كه ته‌نیا جارێك لێده‌دات و ئیتر ژیانیش له حه‌یبه‌ت لێدانێكی تریدا خۆی ده‌كوژێت..

مه‌حاڵه ئیتر ئه‌ی منداڵ هیچ شتێكی تر ببینی جگه له‌وانه‌ی كه بینیوتن، ئه‌ی چیت بینی؟! پێم بڵێ، جگه له‌و گالیسكانه‌ی كه ده‌نكێنن و ئه‌و سه‌رچاوانه‌ی كه له لێدانه‌كانی تۆز هه‌ڵاتبوون؟ واز بێنه له‌وه‌رگرتنی شێوه‌كان. بۆ ئه‌وه‌ی شێوه‌كان لێت دڵنیابن، وازبێنه‌و مه‌مكه به‌و په‌شیمان بووانه‌ی كه ره‌گ و ریشه‌یان له باوه‌ش گرت و نووستن. به‌ڵام توخوا قورسایی هه‌ورو قورسایی به‌فرم له‌سه‌ركه‌م مه‌كه‌ره‌وه. ئه‌وكاته‌ی له‌نێوانیاندا ئه‌تبینم چۆله‌كه‌و (كات) سه‌ر ده‌بڕی و به‌و گریانه‌ت منالییی ئه‌ڕێژێته سه‌ر زه‌مین و تۆڕی خوێنه سه‌ر خۆشه‌كه‌ت هه‌ڵده‌ده‌ی بۆ گرتنی ئه‌فسانه..

تۆ منالییت و ئه‌ی من چیم له منالێك ئه‌وێ جگه له‌وه‌ی كه باكوور، ماڵ به‌ماڵ و دار به‌دار و چه‌م به‌چه‌م و گه‌ڕه‌ك به گه‌ڕه‌ك و گوڵه‌گه‌نم به گوڵه گه‌نم و هه‌ور به هه‌ور، له جله‌كانی بته‌كێنێ و باستۆقه‌ی ئاسۆ بشكێنێ تا پۆل پۆل په‌ره‌سێلكه و قه‌تێی لێ بڕژێ..؟؟

.. غاربده، هێنده‌ی پێیه‌كانت هه‌ڵیده‌گرێ غاربده، له گه‌رده‌لووله‌وه بۆ گه‌رده‌لوول و به نزاوه ئه‌و دڵه بچكۆله‌یه‌ت هه‌ڵبڕه بۆ و ده‌شتانه‌ی كه پیت و ریشۆڵه به ده‌وورپا ئاپۆره‌یان داوه.. ئه‌رێ ده‌نگی چه‌قه‌ڵ له ده‌نگی تۆدا نییه؟. ئه‌رێ ده‌نگی درز له ده‌نگتدا نییه؟ ئه‌رێ پۆشته‌ییه‌كی به‌زیو كه له هه‌موو پیاهه‌ڵدانه‌كاندا هه‌یه له تۆشدا نییه؟

تۆ منالییت و (با) چی له تۆدا دیل ده‌كات، له پانتاییه‌كی پڕ له (با) زیاتر؟ لێم گه‌ڕێ با وه‌كو راكشانی كاره‌سات له به‌رده‌م قه‌ڵغانه‌كه‌تدا راكشێم و قۆڵه‌كانم بۆ پاقله و رێوی بكه‌مه‌وه. هه‌ر وه‌كو ئه‌وه‌ی من مه‌یلی له‌ناوچوون بكه‌م یان مه‌یلی رۆیشتنی ته‌ورهه‌ڵكێشێك به‌سه‌ر بوونه‌وه‌ره‌كاندا.. و تۆ منالێت، پێم بڵێ چیت له منالیی بینیووه؟

بڵێ تۆ ده‌نگی خۆتت به رووتی له‌نێو ده‌نگه‌كاندا بینیوه؟ به هه‌ناسه بڕكێوه وه‌كو گه‌روویه‌كی شكاو له‌نێو درزه ژه‌نگبردووه‌كانیه‌وه هه‌ڵده‌چێ و ته‌وره‌كان هه‌ڵده‌قوڵێن

.. ئای ئه‌ی منداڵ، چه‌ندم ده‌بیستی به بیداری دڵه بچكۆله‌كه‌ت بۆ مه‌ته‌ڵ ده‌گێڕایه‌وه‌و گه‌مه‌ی گوڵت بۆ مه‌ته‌ڵ ده‌گێڕایه‌وه. بیرت ده‌چۆوه كه چۆن چۆنی ماڵه‌كانی "پریڤا" و "مۆسسیانا" و "عامودا" و "كیتسك" و "بهارنك" و "مۆزان" و "سمیل" و "حلكۆ" و "كوچك" و "عه‌نته‌ریه" و "تریسبی" و "عاكوله" و "هرم ره‌ش" و "هرم شێخۆ" و تد.. تد.. ت—ده‌دایه‌به‌ر خه‌نجه‌ری ئاورینگ..

تۆ منداڵییت.. و واگیرفانه‌كانت پڕ ده‌كه‌یت له پاقله كێوی و گوڵی كێوی.

به ئانقه‌ست خۆت پیشانی پاسه‌وانی ده‌غڵه‌كان ده‌ده‌یت تا هه‌ڵیانخه‌ڵه‌تێنی. ئه‌وه گاڵته‌جاڕی تۆیه، گاڵته جاڕی ته‌مه‌نێكی سه‌رخۆشه وه‌كو خوێنه سه‌رخۆشه‌كه‌ت. ئه‌وه گاڵته جاڕیه‌ی كه له نێو ته‌ڵه‌كانتدا بۆ هه‌موو كێڵگه‌كانت ناوه‌ته‌وه‌و هه‌ر كاتێكیش كێڵگه‌یه‌كی پێوه‌بوو پێده‌كه‌نیت، تا "با"ی ده‌وروبه‌ریشت ده‌هێنایه پێكه‌نین تۆ و "با" درێژایی خۆتان پێكه‌وه گرێدابوو.. و فووتان ده‌كرد به‌یه‌ك بوقدا، تا رقی بوونه‌وه‌ره‌كان بوروژێنن

له‌پاش ئه‌و هه‌موو گه‌ڕانه وا ئێستا به دڵنیاییه‌وه زانیمان كه تۆ ئه‌و كه‌سه‌ی كه چاڵێكت له‌و رێگایه‌دا هه‌ڵكه‌ند كه عه‌ره‌بانه‌كانیان به‌سه‌ردا تێده‌په‌ڕی تا پێی ئه‌سپه‌كه‌ی "سمعان" بشكێ تۆ ته‌ڵی كاره‌بات گه‌یانده فڕنه‌كه‌ی "مرادۆ" و ده‌ستی هه‌ركێی به‌رده‌كه‌وت ده‌یگرت، تۆ باگردێنه به‌ردینه‌كه‌ت له‌سه‌ربانه‌وه گلۆركرده‌وه‌و به‌سه‌ر سه‌گه‌كه‌ی "فلمز"دا كه‌وت و لایه‌كی تووشی شه‌له‌ل بوو. تۆ كه‌ڵه‌شێره‌كه‌ی "هیلان"ت كوشت. ئه‌و كه‌ڵه‌شێره مل رووته‌ی كه پۆپنه‌ی به‌به‌رد بڕابوو و تۆ ئاڵه‌تت رۆكرده نێو گۆماوی قازه‌كاندا و قازه‌كانی "سمقور"شێت و هاربوون. و تۆ داره‌كه‌ی "كتام"ه كوێرت دزی و تۆ شاخێكی به‌رانه‌كه‌ی "میرت"ت شكاند و تۆ له كۆتاییدا نووستیت و خه‌ونه‌كانت پڕبوون له‌و ئاره‌زووه‌ی كه گۆڕبه‌گۆڕی گۆڕستانی "هلالیه" هه‌ڵده‌یته‌وه‌و بڕوانیت له‌و حه‌شارگه ته‌سك و تروسكانه‌دا چۆن چۆنی گه‌مه‌وگاڵته ده‌كه‌ن. به‌ڵام تۆ منداڵییت. كێش گله‌یی له منالێك ده‌كات كه هه‌وره بروسكه‌ی گوڵ لێیدابێت و چرۆچرۆ به‌نێو دره‌ختی ئاسن و هه‌وری ئاسندا په‌رش و بڵاوبووبێته‌وه؟؟

ئای چه‌ندمان پێ وتی ئه‌ی منداڵ نزیك مه‌كه‌وه‌ره‌وه له‌سه‌ره‌نوێلكه‌كان. به‌ڵام تۆ نزیك بوویته‌وه و له‌سه‌ره‌نوێلكه‌كاندا پاشماوه‌ی زیوت كۆده‌كرده‌وه تا ماته‌می پێبڕازێنیته‌وه..

سوور زانیمان تۆ به درێژایی ئه‌م متبوونه‌ی كه ره‌گی له هه‌نگاوه‌كانماندا داكوتاوه بیداربووی ئه‌و متبوونه‌ی كه وه‌كو مۆرێك به‌سه‌ر ئه‌و فتوحاتانه‌وه وێناكرابوو كه هی ئێمه نه‌بوون. به‌ڵام بیداری نه‌كردینه‌وه‌و سپاردینی به گاڵته‌جاڕیی

ئێمە گەورەین، ئەی منداڵ، ئەو گەورانەی کە لەبەردەم دەرگای کاتدا گاڵتە بەتەقەتەقی ئاسن دەکەین و ئاسنی سارد هەڵدەوەرێنین. گەورەین ئێمە قەدەرمان بۆ پەرەسێلکەیەکی تێپەڕیوو، یان گاڵتەیەك ناکەینەوەو حیکمەتی زۆرداریی نەبێت هیچ شتێك ناپۆشین.

ئەگەر جارێکی تر جموجوڵت تێکەوتەوەو ویستت لە پشت پەپوولەیەکەوە خۆت لە زەمین بشاریتەوە چاوەڕوانی ئێمە مەکە. چونکە ئێمە لە ژێر ئەم حیلە بێدەنگانەوە بۆ یاریکردنی ڕۆڵە بێدەنگەکان وەستاوین و لە هەڵکردنی گاڵتەجاڕییەوە شاخی بزن هەڵدەبڕین..

تۆ بیدارییت و بیدارت کردینەوە تا سەرپێی بتبینین کە دەروازەیەکی بۆ ڕووەك و لە پشتیشتەوە ئەیزەکێك لە ئاوپەڕ. تا لەنێو چەکەکانی کازیوەدا بتبینین دەشتاییەکانی "کیتسك" پاڵدەنێی بەرەو "نصیبین" بێ ئەوەی گوێ بدەیتە پاسەوانەکانی شار، ئەوانەی تیری مێژوویەکیکەڕیان دەگرتە گاڵتەو گەپەکانت

ئەوکاتە تۆ وەکو دڵە سەرخۆشەکەت ڕاکشابوویت و هەر وەکو دڵێکی سەرخۆش مایتەوە. وا تۆ دەمانبینی ئێمە ئەوانەی کە (ئێمە ئەوانەی کە هاتینەوەیەك) و غاردەدەین لە چەمەوە بۆ چەم بۆ ڕاگرتنی بەیەکا هاتنی ڕووگاکان بەرەو ئێمە. لە ترسی بینینی ئەو ئێستایەی کە هیچ ڕووگایەکی نییە ئای هەر بە ڕاکشاوی بمێنەوە. ئەی بچکۆلە و بە بچووکی بمێنەوە چۆن ڕەگەکان ئارەزووت دەکەن هەر مەسینەو کوپەیەکت بەردەست دەکەوێ بیانشکێنە چونکە تۆ لە تووڕەبووندا جوانیت.. لە دەسەڵاتە پڕووکێنەرەکاندا جوانیت، جوانیت ئەوکاتەی حەسارەکانی گوڵ هەڵدەکەنی و گاڵتە بە گوڵ دەکەیت. جوانیت ئەوکاتەی دەچیتە سەر پشتی بەران و هار دەبیت. جوانیت ئەو کاتەی کانیاوەکان بەردباران دەکەیت و مانگا ئاو خۆرەکە واقی وڕدەمێنێ. جوانیت ئەو کاتەی مارمێلکە کەوڵ دەکەیت و هێلانە تێکدەدەیت. جوانیت ئەوکاتەی پاقلە دەدزیت و تەڵە بۆ کۆتر دەنێیتەوە. جوانیت ئەوکاتەی کە پشیلەو ماڵەکان دەسووتێنی. جوانیت ئەوکاتەی کە گاکان لە گەورەکان دەردەکەیت و گاکان تار دەبن.. جوانیت ئەوکاتەی دەنووکی عەلەشیشەکان لێك دەئاڵێنی.

جوانیت ئەو کاتەی بە وڕێنەوە باسی ئەو ئەستێرە کشاوانەو ئەو ئاوانە دەکەیت کە باڵی مەلیان پێوەیە.

جوانیت ئەو کاتەی باس لەو "سوارە" دەکەیت کە بە قەمچیەکەی هەور لێ دەخوڕێ و ئەو گالیسکانەی کە لە بنی زەریادان جوانیت ئەو کاتەی بەوڕێنەوە باسی ڕێویەکانی تاریکیی و لەرینەوەکانی دەکەیت و ئەو ئەسپانەی کە قژیان هەیە هەروەکو قژی ژنان. تۆ جوانیت. جوان دە توخوا لێمانگەڕێ..

بەڵام تۆ بیدارییت و بیدارماندەکەیتەوە تا گاڵتەجاڕیی بگێڕینەوە

یەکەم:

## تووندو تیژی ئەندازەیی

2–توندوتیژیی ئەندازەیی

ئێمە منداڵ بووین، هاوڕێم زۆر منداڵ وەکو بێچووەقاز. بەهەردوو لای شەقامەکەدا وەکو دێڕی نووسین ڕادەوەستاین و هەرایەك هەبوو هەرایەکی تۆقێنەر. مامۆستاکان لە پشیلەی تۆقیوو دەچوون کە بەنێو پۆلەکاندا بازیان ئەداو دارەکانیان ڕادەوەشاند و دەیانقیژاند: (بە ئاگابن کە سەرۆك تێپەڕدەبێ.. دەستەکانتان هەڵبڕن و سڵاوی بۆ بکەن) و سەرۆك بەدەم دەست هەڵبڕینەوە بەنێوانماندا تێپەڕی و بەدوای کەژاوەکەیدا ڕیزە ئەندازەییەکان تێکەڵ دەبوون و دەبوون بە چەند بارستاییەکی ڕەش و گلۆرەوەبوو. کە دەمویست لەو زەریا بەشەریە دەرێچم چەندین جار دەکەوتم و چەندین پێ و جەستەم بەردەکەوت، ئەوکاتەش کە گەیشتمە ماڵەوە ڕوومەتم لە خۆڵەوە نزیکتر بوو تا لەدەم و چاوی منداڵێك..

ئەوە سەرەتای توندوتیژی بوو. هاوڕێم. سەرەتایەك، سەرەتای خۆشیەکی ڕەسمی "توندوتیژ". لە شارۆچکەیەکی پەنای چیای تۆڕۆسدا دوو هەفتەی خایاند.

دەبووایە بە درێژایی کات لە دەرەوەو ناوەوەی پۆلەکانی خوێندندا هوتافمان بکێشایە و لەکاتی پێویست و نا پێویستدا چەندین جار دیوارەکانمان بڕازاندایەتەوەو لەکاتی پێویست و نا پێویستدا ئاڵای بچکۆلەمان بە سینەماندا هەڵواسیبایە بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە ناخمان بدەینەوە وێنەی خۆشیەکی تەم و مژاویمان لەسەر ڕوومەتمان بکێشایە. توندوتیژی خۆشیەکی (ڕەسمی) توندوتیژتر بوو لەوەی کە منداڵێکی (ناڕەسمی) بتوانێ هەڵیبگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبووایە لە ملکەچیەکی پلیشێنەردا هەڵیبگرم و منیش لەلای خۆمەوە توند و تیژیم، توندوتیژیەکی زیاتر لە توانای منداڵێك.

ئەوە سەرەتای توندوتیژی بوو، هاوڕێم، سەرەتایەك کەوای لێکردم کە لە قوتابخانە تەباشیری ڕەنگاوڕەنگ بدزم و چوار گۆشە بەردینەکانی دیواری باخچەی گشتی پێ پڕبکەمەوە لە پیت، پیتی ناوی خۆم بوون و پیتی تریش وەك پیتی ئەو جۆرە قەڵەم ڕەساسانەی کە پێم دەنووسین (H.B) ئەو دوو ناوەش دەروازەیەك بوون بۆ شکاندنی (ڕەوشتی گشتی) ڕەوشتی (پاکەکان) و ڕەوشتی سووربوون لەسەر (پاکێتی) گشتی. بەڵام ئەو توندو تیژییەی کەوام مەزەندە دەکرد کە تایبەتە بە خۆم لەو تێپەڕینە توندوتیژەی سەرۆکەوە دزەی کردە ماڵی ئێمەوەو پاشان لەنێو خێزانێکی یازدە کەسیدا لە چەند شێوەیەکی ڕێژەییدا دەردەکەوت.

حەوشەی ماڵەکەمان، هاوڕێم حەوشەیەکی زۆر فراوان و بەشوورایەکی بەرز دەووردرابوو..

وورد، وورد تەنیاییەکی لەخۆ دەگرت کە پێشتر خوی پێوە نەگرتبوو. میوانە (ئاسراو و نامۆ)کانیش ئەوانەی کە هیچ هۆیەك نەبوو، بۆ هاتن و ڕۆیشتنیان، دەهاتن و دەڕۆیشتن، ئەوانەی لەگەڵ کەم بوونەوەی موڵکەکانماندا ئەوانیش کەمیان دەکرد و باوکیشم زیاتر مۆن و بێ میزاج دەبوو.

ئەو توندوتیژییە بێدەنگەش کە تەنیا لەنێو بازاڕە بازرگانیەکانی شاردا هۆکەی دەرکەوت لە زیادبووندابوو. ئەوکاتەی کە بازرگانە تێکشکاوەکان لە موزایەدەی دەغڵ و داندا پێکدا هەڵدەپژان، زیاتر لە سەد دەستی گورز بە دەست بەرز دەبوونەوەو گۆشتی ڕووت بەو ناوەدا پەرش و بڵاودەبووەوە.

ئەوە سەرەتای خۆشیەکی (ڕەسمی)بوو. سەرەتای هەژارییەکی میللی توندوتیژ..

سەرەتایەك کە لە قوتابخانەوە چووە بازاڕەکانەوەو چووە ماڵەکانەوە و لێی نەهاتە دەرەوە. منیش منداڵ بووم هاوڕێکەم سبەینیان پاش دەرچوونی باوکم دەبووایە نەدەهاتمەدەرەوە، تا بۆم بلوێ بەڕووی دایکمدا بقیژێنم "من چام ناوێ چاااام ناوێ" و پاشان شەقێك هەڵبدەم لە کتریەکەو بە تەواوی بیڕژێم و تا هێزم تیایە پیاڵەکە بدەم بە دیوارەکەدا و هەڵبێم بەرەو گۆماوی "قاسمبۆ" بۆ سەیرکردنی مارماسی. لەوکاتەوەی کە ماڵەکانمان پڕبوو لە تارمایی گورز بەدەست، ئەو تارماییە وڕێنەکەرانەی سەریان بەو جامانانە دەبەستەوە کە پڕبوون لە پەڵە خوێنی وشکەوەبوو ئیتر ئەوە کاری هەموو بەیانییەکم بوو کاری براکانیشم بوو..

سەرەتاش فراوانتر بوویەوە وەك فراوانی بازنەی نێوگۆمێك كە بەردێكیان تێ فڕێدابێ. ئیتر ئەو باستۆقە خەزەفیانەی كە بەڕیز لەسەر ڕەفە دارینەكانی ناو ماڵ دانرابوون، یەك بەیەك دەكەوتنە خوارەوەو پرش و بڵاودەبوون. لەوێشەوە ئیتر ئێمەی براكان زانیمان ئەوە تینوێتیمان ناشكێنێ، شووشەی پەنجەرەكانمان بەرد باران دەكرد و پاش ئەوە ڕۆژێك دوو ڕۆژ لەماڵ وون دەبووین.، دەهاتینەوە گۆزەیەكمان دەشكاند یان دارگوڵێكمان لە ڕەگەوە دەردەهێناو دووبارە هەڵدەهاتینەوە.

سەرەتا ورق فراوانتر بوونەوەو دوژمنایەتیەك لەنێوان ئێمەو دایكماندا دروست بوو، زۆر لەماڵ هەڵدەهاتین و هەر كاتێكیش هەر كاممانی بەردەست بكەوتایە دەبووراینەوە. دایكم تەنیا بە داركاریەك وازی لێ نەدەهێنان، هەرچییەكی بەردەست بكەوتایە لە ئاسن و بەرد تێی دەگرتین و ئێمەی منالیش خوێنمان لێ دەڕژا.

هاوڕێكەم.، جارێكیان هەر بەڕێككەوت لە دەستی دەربازبووم و بەرەو گۆشەیەكی حەوشەی ماڵەوە هەڵهاتم كە كۆمەڵێ كەروێشكی تێدابوو. پەرژینە تەلینەكەی دەرەوەیم لە بنەوە دەرهێناو مەسینەیەكی مسی كە بنكەكەی بازنەیی وتیژبوو گرتمە كەروێشكەكان. ئەوانیش بە ناویەكدا شپرزەبوون، دانەیەكیان كە مەسینەكەی بەركەوتبوو، هەردوو پێی دواوەی بەدەم هەڵلەرزینەوە درێژكردەوە و پاش هێمنیەكی بێ سنوور هێمن بوویەوە.

دووازدە كەروێشك ئەنجامی ئەو قەسابخانەیەبوو. بۆ منیش بیست ڕۆژ سووڕانەوە بوو بەدەورماڵدا بەبێ ئەوەی بوێرم بێمە ژوورەوە، لەنێوان كێڵگە پەمووەكەی تەنیشت ماڵدا دەنووستم و خواردنیشم تەنیا ئەوەبوو كە براكانم بۆیان دەدزیم

ئیتر لەوێوە سەرتا هاتەوەیەك، تەسك بوویەوە وەك ڕەشمە. ئەو شارە بچكۆلەیەی بنار چیایی تۆرۆس هاتەوەیەك خەڵك بەچپە شتێك بۆ یەكتری دەڵێن و باوكیشم زیاتر پیر دەبێ و تەنیا ئەو حەمالانە هەندێك ورەی دەدەنێ كە لە ڕۆژانی شكۆدا باوكم بەگەنم یارمەتی دەدان. ئەوان نەزان بوون و لەپێناوی ناندا توونـد و تیژبوون دەیانگووت: "هەرچی دەبێ بابێ هیچ نابێت ئەگەر بەشێكی تۆی تیا نەبێت" و هەڕەشەیان لە شۆفێری بارهەڵگرەكان دەكرد. بەڵام حكومەت ناردنەدەرەوەی هەموو شتێكی بۆ خۆی مسۆگەر كرد. حەماڵەكان لە نێوان خۆیاندا دابەش بوون و بەتاكڕەوی ئیشیان دەكرد. هەریەكەیان بەو گورزە ئاسنینەی كە بە دەستیەوەبوو پارووی لە دەمی ئەوی تر دەردەهێنا..

ئێمەی منداڵیش ئەوەمان دەبینی و توونـدو تیژیمان لەگەڵیاندا دابەش دەكرد. هەڵمان دەپروسكاندن و دەمانفڕاند هەروەكو چۆن شیرینی لە دەستی چڵكندا دەفڕێندرێ و مەملەكەتی ئێمەش مەملەكەتێكی لە ئاسمان دوورتر بوو مەملەكەتێك بوو لە تەپوتۆز و لە خۆشی مەلەوانێ لە گۆماوی "قاسمبۆ" یان غاردان بە نێو ئەو گوڵە گەنمانەدا كە لەپاش خۆمان وەكو پەڕی خوراو جێی دێڵین. پێشبڕكێ دەكەین لە گرتنی مریشكە هەڵاتووەكانی نێو كێڵگەكاندا بەدارلاستیكەكانمان، دەپەشۆكان، دەكەوتن، ڕایان دەكرد، و دەكەوتن، باڵەكانیان لەگەڵ زەویدا جووت دەكرد و دەنووكیان دەكردەوەو پڕدەبوو لە خۆڵ و پاشان دادەمركانەوە..

منالبووین، ئێمە، هاوڕێكەم، منالگەلێك كە ئارەزووی باسكردنی ئەو گیانلەبەرانە دەكەین كە بە هێواشی دەمرن پێمان خۆشە گەڵای ڕووەك بخەینە لووتمانەوە تا خوێنی بەردەبێ و خۆمانی پێوە هەڵدەكێشین. خۆ بەوەوە هەڵدەكێشین كە زیاتر خوێنی بەردەبێ و بەوەی كە لێدانی زۆرتری بەركەوتووە. بەوەی كە زۆرترین برینی قووڵی كەوتۆتە دەست و ڕوومەتیەوە. ئای چەندین شەو لە ژێر گلۆپە سیسەكانی شەقامەكاندا چاوەڕووانی گالیسكەی سەوزەمەنی و كاڵەكی سەوزمان دەكرد كە لە گوندەكان یان لە كێڵگەكانی دەوروبەرەوە بەرەو شار دەهاتن، شاگەشكە دەبووین ئەو كاتەی كە گوێمان لە سمی ئەسپ و جیڕەی تایەدارینەكانیان دەبوو، لە ئێمە تێپەڕدەبوون، بەپێی پەتی دوای دەكەوتین، هەمیشەش چەقۆیەكی تیژ، یان موسێكمان لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرت و حەبلی بارەكانمان پێدەبڕی و بارەكان گلۆر دەبوونەوە. چەندمان پی هەڵبگیردرایە دەمان بردو هەڵدەهاتین. هیچ كەسێك نامانگرێتەوە كە پێمان پەتی بێت. تۆزێكمان لێدەخوارد لەوانەی كە هەڵمانگرتبوو و پاشماوەكەیمان فڕێدەدا..

منالێتیەكی بێ منالیی منال بووین و گەورەكان بە دڕەندەیی ئێمەوە خۆیان هەڵدەكێشا. ئەوان منالی دڵڕەق و دڕندەیان خۆشدەویست و ئێمەش پیاوانی دڵڕەقمان خۆشدەویست. وەرزشەوانەكان شەیدامان بووبوون. بۆكسخەنجەرمان هەڵدەگرت، هیچ منالێك نەبوو چەقۆیەكی لە گیرفاندا نەبێت، یان زنجیرێكی نەبەستبێتە كەمەریەوە. و هەموو منالێكیش دەیزانی قۆچەقانی یەك لە گوڵ دروست بكات، یان قامچیەك لە تەلی كارەبا دروست بكات و هەمووانیش لە دەلغەی كۆكردنەوەی پاشماوەی مسدابوون چونكە دەفرۆشرا، لە توانای هەموانیشدابوو كە سەیاریەك تێكبشكێنێ تا پارچە مسێكی لێ دەربهێنێ و نرخەكەی دەیباتە سینەما..

ئێمە (كیفۆرك)مان خۆشدەوێ چونكە بەسەر شەش پیاوی چەكداردا زاڵدەبێت. (كنعان)مان خۆشدەوێ چونكە بە خێرایی دەچێتە هەموو سینەمایەكەوە، (شەرۆ)ی حەماڵمان خۆشدەوێ چونكە كرێی ماندووبوونی لە هەموو بازرگانەكانی دەغەڵ و دان وەردەگرێ بەبێ ئەوەی تەنیا فەردەیەكیش هەڵبگرێ. ئەو زۆر كەلەڕەق و خێرایە لە هەڵكێشانی خەنجەرەكەیدا. حەڤدەجار چۆتە بەندیخانەوە، ئەمانە نموونەكانی ئێمەن.

منالی و سەرەتاش دێنەوە یەك. هەستم بە شتێكی تازەدەكرد كە پێشتر دەركم پێی نەكردبوو. شتێكی توونـد و تیژ و زەق: تۆ كوردیت، كوردەكان ترسناكن. بە كوردی قسەكردن لە قوتابخانەدا قەدەغەیە. ئەمە شتێكی تازەیە، چونكە تۆ دەزانیت كەسێ چارەكی ئەو شارانەی كە بەتخووبی چیای تۆرۆسەوەن كوردن. وا تۆ بەرەو ڕووی كێشەكە دەبیتەوە: مامۆستاكان زیادەڕۆیی لە لێدان و زەلیلكردنی قوتابیەكاندا دەكەن و بەدووەكانیش ئەوانەی كەچەپڵە بۆ هەموو ڕژێمێكی تازە لێدەدەن، دێنە شارەوەو چاودێری ڕوومەتەكان دەكەن.

..تۆ منالیت. بەڵام كوێر نیت. ئەوان پێشوەخت ڕقیان لێتە و نازانیت بۆچی مامۆستا ڕقی لە تۆیە.

فەرمانبەری دەوڵەت و پۆلیس ڕقیان لێتە. ئەمە مەرجێكی تازەیە. ***كەواتە باتووندو تیژبم منیش.*** زیاد لە پێویست لە بەرامبەر ئەم دایگركردنە شەیتانیەدا توونـد و تیژبم. تۆش لەلای خۆتەوە بە ڕقەوە دەڕووانیتە منالانی بەدو لە قوتابخانەدا و گاڵتە بەو سەرتاشینە نامۆیەو بەو خاڵەشینانە دەكەیت كە لووت و گۆنا و دەستەكانی داپۆشیون، بە زیادەڕۆییان ساویلكەییدا. بەڵام ناشزانی بۆچی ئەوانیان پێ باشترە لەتۆ. بۆیە پاش گەڕانەوە لە قوتابخانە لەڕێگایاندا دەوەستی هۆیەك دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی شەڕیان بكەیت.

بۆ ڕۆژی دواتر چاودێرەكە سزات دەدات، بەڵام تۆ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەردەوامیت لە شەڕكردنیان و چاودێرەكە داوا دەكات كە باوكت بێنی بۆ قوتابخانە و باوكیشت دێت. چاودێرەكە گاڵتە بە لەنگی زمانی باوكت دەكات، بەڵام باوكت توونـدوتیژ و بە

هەیبەتەوە بەچاودێرەکە دەڵێ (تۆ کێیت ا ئاوا قسەم لەگەڵدا دەکەیت؟) چاودێرەکە دەڵێ: (خودای خودات)..

باوکم تووڕە دەبێت و لە هەمان ڕۆژدا دوو حەماڵ لەو شەقامەدا دەوستن کە ماڵی چاودێرەکەی لێیە هەردوو قاچی دەگرن و بەزەویداکێشی دەکەن. چاودێرەکە لەلای پۆلیس شکات دەکات.

پۆلیس دێت و باوکم لەگەڵیاندا ناڕووات. هەموو خزم کەسوکارەکانمان لە تووڕەییەکی پلیشێنەردا کۆدەبنەوە. کاردەگاتە بەڕێوەبەری ناوچەکە. کەلەپایەی سەر هەنگدایە.

سەرهەنگ لە ئۆتۆمبیلێکی قۆزدا دێت. "حسین ئاغا" بۆی دەردەچێ و دەقیڕێنێ: "کڵاوەکەت دەخەمە ژێرپێم ئەگەر ئەو پیاوە ببەیت" و کارەکە بەهێمنی دادەمرکێتەوە و بە هێمنی چاودێرەکە واز لە ڕقەبەرایەتیەکەی دەهێنێ. بەڵام کێشەکە تەواونابێ و منالێتی و ئەو سەرەتایەش کە لێیەوە دەستە بچکۆلەکانت بۆ سەرۆك هەڵبڕی. دەبێتە دۆزەخێك.

شتەکان بەسەریەکدا کۆمەڵ دەبن. لەوێدا ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی شەوانە دەڕۆی بۆ کێڵگەی پەموو و قۆزاخە سەوزە نەگەییوەکەی کۆدەکەیتەوە و داری پیرو درەختی باینجان هەڵدەکەنیت ڕوون دەبێتەوە کە سەردەکەویتە سەربان بۆ تێکدانی هێلانەی چۆلەکە وشکاندنی هێلکەکانیان تا کار دەگاتە ئەوەی فرسەت لە پاسەوانی گەڕەك بهێنی، ئەو پاسەوانەی کە هەمیشە نووستوە تا دەمانچەکەی لێ بدزیت. پاشان خۆت و هاوەڵەکانت بە دەستیەوە دادەمێنن و فڕێی دەدەنە ڕووباری (جغجغ)ەوە، پاسەوانەکە سێ مانگ دەخرێتە بەندیخانەوە، لە کاتێکدا تۆ پێی پێدەکەنی و گاڵتەی پێدەکەیت. بەڵام باوکت لەگەمەیەکی تازەدا نوقوم دەبێت، ئەویش گەمەی ڕاوکردنە.

فیشەکێکی (12) ملم دەنێتە باڵندەیەکەوەو بە تەواوی دایدەڕزێنێ. تۆ دەزانیت ئەمە ڕاوکردن نییە، ئیتر تۆ لە نێو ئەو منالێتیەی کە منالێتی تیا نەماوە دەست دەکەی بەڕاوکردنی تایبەتی خۆت، لێرەو لەوێ تەڵە دەنێیتەوە بۆ چۆلەکەو ڕیشۆڵەو تیتی ڕاو دەکەیت، و هەرکاتێکیش باڵندەیەکت گرت هەموو پەڕەکانت لێدەکردەوەو زیندەبەچاڵت دەکرد، بەڵام وەختە شێت دەبیت بۆ گرتنی کلك هەڵتەکێنە ئەو باڵندەیەی کە قەت دەستت نەکەوتووە چونکە زۆر فێڵبازەو لە جێگایەکدا ئۆقرە ناگرێت، ئەوەش بەگژاچوونەوەیەك بوو کە تەحەمول نەدەکرا و سوێندت خوارد کە ئەگەر بیگریت بە زیندویی کەوڵی بکەیت.

تۆ منالێکی بێ منالییت، سەرەتاش دێتەوەیەك و لەگەڵ سەرەتاشدا بەفردێت، بەفری هەمان ئەو ساڵەی کە تۆ دەستەکانت بۆ هاتنە توندو تیژەکەی سەرۆك هەڵبڕی.. بە درێژایی پێنج ڕۆژ تۆ سەر دەکەوتیتە سەربانی دراوسێکان تا لوولەی دووکەڵکێشەکانیان بگریت. هەندێجار ڕاویان دەنایت و هەندێ جاریش ئازا دەبوویت و ڕزگارت دەبوو. هەروەکو لێزانیت لە دروستکردنی ساردەمەنیە تایبەتیەکانتدا، ئەوەی کە تێکەڵیەك بوو لە بەفرو دۆشاو و مێوژ.

تۆ بەفرت خۆش دەوێ، ئەم ڕەنگە زاڵەت خۆش دەوێ کە دەست دەگرێ بەسەر هەموو ڕەنگەکاندا، درێژبوونەوەیت خۆش دەوێ و درێژبوونەوەی هەنگاوەکانیشت لەودا، بەڵام هەندێجار تۆزێك شتەکان دەئاڵۆسکێنێ، چونکە کە دەچیتە ماڵەوە پێڵاوەکانت پڕن لە بەفر و گۆرەویەکانت تەڕبوون. بەدزی دایکتەوە گۆرەویەکانت بە تەواوی دەخەیتە سەر سۆپاکە، زۆر ناخایەنێ و دەسووتێ و لێرەدا جارێکیتر تۆ لە ترسی لێدان لە ماڵەوە هەڵدێی و هەڵدێی بەرەو بەفری سارد و هەڵدەلەرزی و هەڵدەلەرزیت و هەڵدەلەرزی، تا ڕەنگت شینێکی تۆخ دادەگەڕێ. بۆنی بەفر دەکەیت و خۆشت دەوێت، بۆنی ماڵ دەکەیت و خۆشت ناوێت. بەردەبیتە براکانت چونکە گاڵتە بەو بەفرە سپیە خزەی ناو حەوشەی ماڵەوە دەکەن و تێکی دەدەن. لە کۆتاییدا لە گۆشەیەکدا گۆشەگیر و زۆر دڵتەنگ دەبیت، ئەو کاتەش کە هۆیەك نادۆزیتەوە بۆ دڵتەنگیت بە زەلیلی دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ. لە هەموولایەکەوە دەستەکان تێت بەردەبن و خوێنی لووتت بەردەبێ.

تۆ منالیت..

تۆزێك هێمن دەبیتەوەو چاوەکانت سوور داگەڕاوە بیر لە کارێك دەکەیتەوە کە بیکەیت، کارێکی پڕ لە ژاوەژاو و ڕوخێنەر. لە سۆپاکە نزیك دەبیتەوەو پێوەری سووتەمەنیەکەی تا دوا ڕادە بەرز دەکەیتەوە سۆپاکە هەڵدەچێ و وەکو جامانەکەی سەری باوکت سوور هەڵدەگەڕێ. تۆ لێرەدا دوعا دەکەیت کە گڕەکەی زیاتر ببێت. سۆپاکە بتەقێتەوەو ماڵ بسووتێنێ، بەڵام هیچ ڕوونادات. بەڵکو تۆ دەتەقیتەوە. منداڵیت لە شێوەی قوڕ و باڵندەی ڕووت و مردارەوەبوودا دەتەقێتەوە. منداڵیت لە شێوەی چەقۆ و گۆزەی شکاو و جلی خەڵتان بوو بە خوێن و تەڵە و تفەنگی ڕاوی و کاڵەکی سووری بەسەر شۆستەدا پەرش و بڵاوەبوو دەتەقێتەوە..

**دووەم:**

**لە پێکدادانی لایەنەکاندا**

وا ئێمە لە کۆڵانەکانماندایین، بە دەور دوو عەلەشیشدا ئەڵقەمان بەستووە، ئایا عەلەشیش دەناسن، ئەو عەلەشیشەی کە کلکی وەکو پەنکەیەکی گەورە فش دەکاتەوەو ئەو زیادە گۆشتانەش بەخوارووسەروی دەنووکیدا شۆڕدەبنەوە؟ ئایا میری عەلەشیش دەناسن؟ میری ڕەشی گەورە.

ئەوەی کە مێینەکەی هێلکەیەك دەکات بە قەدسێ هێلکەی مریشك؟ هێلکەی عەلەشیشان بینیوە ئەو هێلکە خاڵخاڵەی کە تەنیا دانەیەکی بەشی ژەمی منالێکی وەکو من دەکات؟

ئای لە جوانی عەلەشیش و مێینەکەی. ئای لە جوانیی ئەو شەڕەگرانەی نێوان دوو عەلەشیش.. وا ئێمە گوێمان لە پێکدادانی باڵ و دەنووکە. دەنگی گڕاوی دوو نێری پڕ لە نێرێتی دەبیستین؟. یەکێکیان دەزانێت کە بردنەوەی تێکشکانە. بەڵام ململانێکە وا لە یاریەکە دەکات کە زیاتر بێت لە یاری. بەڵکو دەیکاتە دووانەی ژیانێك کە بە یاریەك نەبێت ڕاست نەبێتەوە. ئەو گۆشتە شۆڕبووانەی سەروژێر دەنووك زیاتر سوور هەڵدەگەڕێن. شوێنە فودراوەکان و وەسوەسەکان تونتر دەبن و هاواری ئێمەش بەرزتر دەبێتەوە.

عەلەشیشێکیان لەویتر نزیك دەبێتەوە و پێش ئەوەی دەنوکێ بدات لەسەری بەرزتر خۆی ڕادەگرێ پەڕوچاو پەرش و بڵاودەبنەوە.. دەنوکێك لەم و دەنوکێك لەویتر، کلك تاکۆتایی فش بۆتەوە باڵەکانیش وەك دەستی دوویاریکەری بۆکسێن پێش پیاهەڵپژان لەزەوی دەخشێن و هاوار دەکەین: "دەی هەی کەڵ هەی کوڕی سەگ".

عەلەشیشەکان لێکتر دوور دەکەونەوە لێی دەوەستن هەروەکو خۆیان بۆ دەست وەشاندن ئامادەبکەن ئێمەش چاوەچاومانە: دەی هەی کوڕی سەگ. ئەوکاتەش کە تۆزێ هێمن دەبنەوە، یەکێکیان بەرەو ئەوی تر پاڵ دەنێین. بەڵکو هەر بەکێشکردن کێشی دکەین و سەر لەنوێ شەڕ دەستپێدەکاتەوە.. لێرەدا، پێش ئەوەی یەکێك لەو دوو دوژمنە بکەون دایکمان ڕادەکات و دەقیژێنێت:

"ئێوه دڕندەن"، پێش ئەوەی بەردێك یان دارێكمان بەركەوێ لە حەوشەی ماڵ دەچینە دەر..

بەڵی هاوڕێکەم. ئەوسا منالبووین.. منالگەلێك بە شەڕی عەلەشیشەوە ڕامان دەبوارد یان هێلکەمان لە ژێر مریشکەکان دەردەهێنا پێش هەڵهێنانی و چەندین جار هێلکەمان دەشکاند و جوجەڵەی ڕووت و قووتمان تیا دەبینی و ئەو جوجەڵە لینجەتەڕانەی کە هێشتا کامڵ نەبووبوون، یان زەردێنەی بە خوێن داپۆشراو، یان وردیلە لە شێوەی بێچوە بۆقدا..

ئێمە شتەکانمان خۆشدەوێ پێش کامڵ بوون. شەڕی کەڵەشێرمان خۆش دەوێ کە سەرکەوتنی تیا نییە ئەو هێلکانەمان خۆش دەوێ کە هێشتا تۆوەکانی تیا کامڵ نەبووە. دەنووکی بەهێزو ئاپۆرەی پەڕمان خۆش دەوێ. هاوڕێکەم ئێمە واین. ژیانیشمان ئاوایە. ئێمە هۆیەك نەبووین بۆ شەڕی گیانلەبەرەکان ئەوان هەر بە غەریزە بۆ شەڕکێش دەبن، بەڵام ئێمە شتەکانمان دەوروژاند ئەو کاتەی زۆرانبازیەکانمان دەکردە زۆرانبازیەك کە هەردەبوو ببوایە، هاوڕێکەم دەزانی چۆن؟ واپێت دەڵێم، ئێمە بەرانەکانمان ڕووبەڕووی یەکتر پاڵ دەنا شاخەکانیانمان دەگرت شتەکە هەوڵێکی گەورەی نەدەویست، هێندەمان بەس بوو کە بەرانێك لە بەرانێك نزیك بکەینەوەو ئیتر شەڕ هەڵدەبوو و شەڕی بەران لە شەڕی عەلەشیش نەدەچوو. ئەمەی یەکەم توندوتیژتر بوو. سینەیان مەترێك لە زەوی بەرز دەبۆوە و کەللەیان دەیدا بە یەکدا، بەرز دەبوونەوەو لە یەکتریان دەدا و لە نێوان خوریەکەیاندا تۆزێکی سۆزدار دەوروژا.. شاخەکانیان تێکەڵ دەبوون و هێمن دەبوونەوە. هەروەکو ئیتر پاش ئەوە شەڕنەکەن، بەڵام کەشاخەکانیان دەکرایەوە دیسانەوە تێهەڵدەچوونەوە نێوچەوان بە نێوچەوان و دەنگی شەڕەقۆچیش هەروەکو دەنگی تەپڵ وابوو..

تۆزێك دەگەڕانەوەو دووبارە لە یەکیان دەدایەوە.. دەگەڕانەوەو دووبارە لە یەکتریان دەدا

بەرانێك دەکەوتە سەر زەوی و پاشان هەڵدەسایەوە. دووبارە دەکەوت و هەڵدەسایەوە و پاشان هەڵدەهات بۆ دوور. و چەندین بەرانی شاخ شکاوی هەڵاتوومان دەبینی چەندین ڕۆژ وەکو سەگ دەیلوراند تا برینەکەی خۆش دەبۆوە..

بە عادەت خەڵك تەنیا بەرانێکیان هەبوو بەرانێکی سەرکەوتوو کە بەدەور ژنەکانیدا دەسووڕایەوە. سەرکەوتووش هەمیشە ناز پێدراوە. شتێکی ڕەنگاڵەییان دەخستە سەر سینەی تا بزانن چەند مێینە بەژێریا تێپەڕبوون. گەردنیشی بەزەنگ و چەند زەنگیانەیەك دەپێچنەوە، لە جووڵەیەکی سەیردا لە کاوڕ نزیك دەبێتەوەو خۆی بەسەریدا بەرز دەکاتەوە، کاوڕ یەکەمجار ڕادەکات پاشان لە هێمنیەکدا خۆی بە دەستەوەدەدات،

هێمنیەك کە تەنیا هەناسەبڕکێ و تەکانی نەرمی ڕاست و چەپی بەرانەکەی تیا دەبیسترێ: "دەی هەی سەگباب" هەریەکەمان. لە خێسەیەکی سەیردا سەیری یەکتریمان دەکرد.. هەموو گیانلەبەرەکان سەگن.. یان لە سەگ دەچن مریشك و کاوڕ و چۆلەکە. ئێمەی منال وای لێدەگەین و ئاواش جوێنیان پێدەدەین. بەڵام زۆر سەرسام بووم بە هەردوو ئەسپەکەی (پاڤی کازمۆ) و شۆفێری عەرەبانەکەی عەرەبانەی نەفەرهەڵگر کە دوو ئەسپ ڕایان دەکێشاو ڕێبوارانی لەسەرەتای (قامیشلی)ەوە دەگواستەوە بۆ کۆتایی شارەکە (پاڤی کازمۆ) تەلبەندێکی بچکۆلەی بە تەلی دڕکاوی بەدوای عەرەبانەکەیدا دروست کردبوو تا کۆتایی هەردووتایەی دواوە

ئێمە بۆ کوورتکردنەوەی ڕێگاکان لە سەری دانەنیشتین..

ئەوەش خووی ئێمە بوو لەگەڵ هەموو عەرەبانە نەفەر هەڵگرەکاندا. بەڵام هەندێك لە هاروهاجەکانی ئێمە ئەو کاتە کە نەیدەتوانی بە دوای عەرەبانەکەدا غار بدات، دەیقیژاند: (قامچی.. قامچی) ئەوەش ئاماژەیەك بوو کە ئەسپەوانەکان تێیدەگەن و "پاڤی کازمۆ"ش تێیدەگەیشت و بە قامچیەکەی ئاگری بەردەدا لە پشتی هەردوو ئەسپەکەی. پاشان ئاوڕی دەدایەوەو دەیگوت (بیخۆن).

پشتی ئاگر دەدەین بە لێدانی قامچیەکەی ئیتر خۆمان هەڵدەدایە سەر شۆستەکەو گلۆر دەبووینەوە و بە هیوابووین کە ڕۆژێك ئەو دووئەسپە کەوڵ بکەین، بەڵام من زۆر سەرسام بووم پێیان، سەرسام بووم بە لاملیان کە زەنگیانەو گوڵەنگی پیاشۆڕەوەبووبوو..

هاوڕێکەم لە ڕاستیدا ئێمە دەمانتوانی گیانلەبەر کەوڵبکەین. دەزانی ئێمە گیانلەبەری مردارەبوومان کەوڵدەکرد؟. لێگەڕێ با ئەوەت بۆ بگێڕمەوە کە نایزانیت.. منالانی گەڕەکەکەمان هەژاربووین تاسەر ئێسك هەژاربووین، هەندێکیان قوڕی سەر دیواری دەخوارد و ئەگەر ئەو قوڕخواردنەیان زیادی بکردایە دەبران بۆ سەر دوکتۆر، دوکتۆرەکانیش دەیانگوت "ئەوە خوویەکی پیسە" لە مەیاندا هیچ زیادە ڕەویەك ناکەم، بڕۆن لە دوکتۆرەکان بپرسن دەربارەی ئەو قوڕخۆرانە. ئەو منالانەی کە ئامادەبوون لە پێناوی پەیداکردنی پارەیەکی کەمدا هەموو شتێك بکەن.. و هەمیشەش ئەوکاتانەی کە مەیتارەکان دەبوون بە دکتۆری مرۆڤ گیانلەبەری مردارەوەبوو و مرۆڤی مردارەوەبوو زیادیان دەکرد،

بە تەنیشت گوندەکەوە دۆڵێك هەبوو. خەڵك گیانلەبەرە مردارەوەبووەکانیان تێ فڕێ دەدا و ئەو جێگایەش کە گیانلەبەری مردارەوەبووی تیابێت منداڵیشیی تیایە. لەوێشدا چەقۆی دزراوی موبەقەکان کاری خۆیان دەکرد چەرمی سەر گۆشتە گەنیوەکەیان لادەبرد. بەڵام بۆنی پارە پەیداکردن لە هەموو بۆنەکانی تر بەهێزتربوو ئاوا ئیتر منالێك یان دوو منال بە دەسکەوتێکی چەورەوە دەهاتنەدەرێ. کە یەك بەرگن خوری یەکسان بوو بە لیرەیەك یان دوو لیرە ئەو دوو لیرەیەش یەکسان بوو بە چوارجار چوونەژوورەوەی مەلەوانگەیەکی میللی یان سینەمایەك.. ئێمەی منال مردووانمان بەلاوە گرنگ بوو و بە مردووانیش دەژیاین، ئەوە خووی ئێمە بوو.. بەڵام ئێمە بێجگە لەنان بەشتی تریش دەژیاین ئێمە بە هەڵاتنیش دەژیاین ئەوە کێشەیەکی ئاڵۆزە بەلام لێم گەڕێ بابۆتی بگێڕمەوە؟

شارەکەمان بە تخووبی تورکیاوەیە. لەنێوان ئێمەو ئەواندا هێڵێك لە تەلی دڕکاوی ڕاکێشراو هەیە بەڵام ئەوە بێ هوودەمان ناکات لەوەی بڕۆینە وولاتانێکەوە کە نایانناسین. دەڕۆینە تورکیاوە بە لێرێکی دارێندا ڕێپیشاندەرەکەمان کە هەروەکو ئێمە تەمەنی "12 ساڵ" دەبێت شوێنی لوغمەکانمان بۆ دیاری دەکات. کە تورکەکان نازانن بە باشی دایبنێن. دەلیلە بچکۆلەکەمان دەڵێ: ئەگەر پێتان نا بەجێگایەکی نەرمدا و گوێتان لە تەقەیەکی لاوازبوو ئەوە لوغمە و ئەگەر پێتان نا بە لوغمدا قەت مەجولێنەوە کە نەجولانەوە من کەفالەتی مانەوەتان دەکەم و دەچینە شاری (ماردین)ەوە شاری مرەبا و ترێ. لەوێ لەگەڵ خەڵکەکەیدا خورما دەگۆڕینەوە بە توتن "تورکیا دار خورمایەکی تیا نییە" و کیلۆیەك خورما یەکسانە بە پێنج پاکەت لە باشترین جۆری توتن". کە دەشگەڕێینەوە توتنەکە بە پێنج بەرامبەری خۆی دەفرۆشینەوە بە بەقاڵەکان.

منال بووین ئێمە هاوڕێکەم. نەماندەزانی ڕاڕەوی لێرەکان ئەو ڕاڕەوانەیە کە وولاتان پێکەوە دەبەستێتەوە. بەڵکو وامان هەست دەکرد کە زەمین بە تەواوی ڕاستە و ئەو سنوورانەش کە گەوەکان دەیکێشن تەنها سنووری گەورەکان خۆیانە بۆیە بە دیاریکراوی لەژێر سیمە دڕکاویەکاندا تەڵەمان

دەنایەوە ئیتر ئەو کۆترە کێویلانەمان دەگرت کە لەوڵاتی خۆماندا نەمان دیبوون، هەر کاتێکیش یەکێك لەو کۆترانەمان بگرتایە بە ترس و دڵخۆشییەوە غارمان دەدا بۆی. لە ترسی ئەوەی نەك سەربازە تورکەکان تەقەمان لێبکەن "هیچ شەوێك تێناپەڕێ گوێمان لە تەقە نەبووایە دەیانگرتە قاچاخچییەکان"

بەڵام تورکیا زۆر نزیکە نزیکە تا سنووری تێکەڵ بوون و هێشتا "ئەستانە"مان خۆشدەوێ "باوکەکانیشمان خۆشیان دەوێ". بەڵام ئەتاتورکمان خۆشناوێ ئەگەرچی ئێمە بە سادەیی و هەریەکە لە باب و باپیرییەوە بێ مەبەست ئەمە دەڵێینەوە: "یاشا یاشا/ جمال غورسیل غول پاشا"

ئا لەم کاتەدا، لەو ساڵانەدا کە تەڕن وەکو ڕانی مانگا..، ئێمە گوێمان بەشتی تریش دەدا و بەدڵخۆشییەکی وەسف نەکراوەوە چاوەڕوانیمان دەکرد. یەکێکیان وەرزی دروێنە بوو، دووەمیشیان وەرزی کوتانی گەنم تابێتە ساوەر. ئەو دوو ڕێککەوتە تەڕبوون وەکو تەڕی تەمەنمان. لە دروێنەدا چاوەڕوانی ئامادەکردنی دەڕاسەکانمان دەکرد ئەوانەی کە پانکەی دارین و هەڕەی ئاسنینیان هەبوو.. بۆ ئەوەی کاربکات کاتی دەویست بۆ چاککردنەوەی ئەو کاتەش پڕپڕبوو لە خۆشی. هەڕەئاسنینەکانیان دەگۆڕی، پانکەکانیان.. پارچە. پارچە دەکردەوە، هەروەها ئەو دەڕاسانەش کە گەنم و جۆی لە یەکتر جیادەکردەوە "هەموو ئەمانە لە دەشت دەکران، خەیمەیەکی گەورەیان هەڵدەدا و ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارەکان کۆدەبوونەوە"

حەزمان لەو کەرەستە بچکۆلانەبوو، چەکوش، سپانە، پلایس، هەڕەی ئاسنینی بچووك. هەندێ جار دەمان دزین خۆمان بەوەوە دەخلەفان کە دنیا سەر لەنوێ لەسەر دیواری قوڕین دروست دەکەینەوە بەو کەرەستانە درزمان دەخستە دیوارەکانەوە پانتاییەکی گەورەمان هەڵدەکەند تاوای لێ دەهات دەبوو بە قاڵبی قوڕین کە لە ژێرەوە پتەوویەککگرتوو دەردەکەوت، کەرەستەکانمان دەخستە چاڵەوەو بە خۆڵ سەریمان دادەپۆشی جارێکی تر لە کرێکارەکان نزیك دەبوینەوە.. بە دزیانەوە دەستمان دەخستە ڕۆن و چەوریەکانەوە، دەستەکانمان لە یەك دەسوو، تا هەستمان دەکرد کە کرێکاری ڕاستەقینەین..

پاش ئەوە، درەویش تامی خۆی هەبوو: دەڕاسەکان زەمینیان لەو ڕووەکە فشۆڵە ڕووت دەکردەوە. تەواو هەروەکو ئێمە لە گەڕەکەکاندا چۆن ڕووت دەبووینەوە پێش ئەوەی بخزێینە چەمەکانەوە..

دەڕاسەش لە مانگای دەستەمۆ دەچێت بەدوایدا غاردەکەین، پوش بەلێدانی پانکەکانی بەملاوئەولادا پەرش و بڵاودەبنەوە، پاش ئەوەی گەنم لە گوڵەکانیان جیادەبنەوە بەدوایدا ڕادەکەین تا گەردەلوولی پوش دامان دەپۆشێ تێکی دەدەین و پەرش و بڵاوی دەکەینەوە تا دەم و لووت و جلەکانمان پڕ دەبێت لە پوش. گەورەکانیش بە ژن و پیاوەوە بەدوای دەڕاسەدا ڕادەکەن ئەوان لە مەڵۆی گەورەدا پوش کۆدەکەنەوە. بەپشتی گوێ درێژ دەیگوێزنەوە تاپاشتر دەبێتە ئالف.. یان لە قوڕی سووردا تێکەڵی دەکەن و خشتی خانووی لێدروست دەکەن.

لێرەدا هەموو شتێك لە قوڕە تەنانەت ڕێگاکانیش. لە هەر کوێ منداڵ هەبێ، پووشیش هەیە. دوای ئەوە بڕوا دێنین کە ئێمەش لە پوش لە دایکبووین و دەبینەوە بە پووش و سنووری زەمینیش سنووری ئەو بایانەیە کە ئێمە لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ. بەڵام وەرزی گەنم کوڵاندن ئەوا میهرەجانێکە بۆ خۆی ئێمە سنووقی دارینیبەتاڵ و تایەی لاستیك دەکڕین.

مەنجەڵێکی گەورە دەخەینە سەر چەند بەردێکی گەورە و ئاگر دەکەینەوە..

بەدرێژایی ڕۆژ ئاوەکە وورد، وورد دەکوڵێ. دەنکە گەنمەکان نەرم دەبن و با دەکەن.. با دەکەن و لەبەر زۆر کوڵاندن دەتەقنەوە.. ئیتر ئەوکاتە لەسەر حەسیر ڕادەخرێن.. دۆڵکەی پڕ سەردەکەوێ و بە بەتاڵی دادەبەزێت.. سەردەکەوێ و دادەبەزێت

دانوولەی زەرد سەتڵ لە پاڵ سەتڵدا هەڵدەخرێت..

منداڵانی گەڕەك هەموویان نزیك مەنجەڵێکی گەورە کۆدەبنەوە. هەریەکە و تاوەیەك یان قاپێکی گەورەیان هەڵگرتووە، لە بەیانییەوە چاوەڕوانن هەندێك دێ و هەندێك دەردەچن..

لە خوانێکی دوور و درێژدا هەروەکو لە دەستیان بچێت، ئەو کاتەش کە گەنمەکە دەکوڵێ ژەمی بچکۆلەی خۆیان دەبەن. هەندێك شەکر دەپرژێنن بەسەر گەنمەکەدا یان تێکەڵی دەکەن بە خوێ و ڕۆن بە خۆشیەکی ڕاستەقینەوە دەیخۆن..

هاوڕێکەم ئەوە خوانی بچکۆلەی ئێمەیە، بەڵام خوانی گەورە، ئەو خوانەی کە تیایدا خوێن بەر دەرگای ماڵەکان دادەپۆشێ. ئەویش وەرزی خۆی هەیە. لە کۆتایی هاویندا پاش دووەم تاوە باران کە هەر وەکو قوڕە سوورە دەبارێ. قەسابخانەکان دەست پێدەکات، ئیتر قەسابەکان تەور و چەقۆکانیان تیژ دەکەن (هەسان دەکەن) ئیتر گیانلەبەرە بچوك و گەورەکان.. گەل، گەل سەردەبڕدرێن و ئیتر گۆشت. و تێگووشە زیاد دەکات..

هەموو ماڵێك بەرخ یان مانگایەك ئامادە دەکات بۆ سەربڕین، بە درێژایی چەند مانگێك دابەستەیان دەکەن، تا جەستەیان پڕ دەبێتەوە قەڵەودەبن "گۆشت دەگرن"، تا بەدرێژایی پایز و زستان بەش بکات. هەموو ماڵێك لەگەڵ قەسابێکدا ڕێك دەکەوێت، قەسابەکان کرێ بەپارە وەرناگرن.. بەڵکو تۆڵەی خۆی بە کەوڵی گیانلەبەرە سەربڕاوەکە دەکاتەوە.. ئەمە کرێی ماندووبوونیەتی.

ئێمە منداڵ بووین هاوڕێکەم، مۆڕەمان لەو کابرایە دەکرد. ئەو پیاوە بێدەنگەی کە ملی مانگایەکی بەشاخەکانی دەگرت و بایدەدا تا دەکەوتە سەر زەوی. پاشان بە جووڵەیەکی سادەو لێزانی دەستی خوێن بازرەقەی دەبەست، لە دەرویەکی باریك و بەهێزدا. ئەو کاتەش کە ماوەی برینەکە درێژ دەبۆوە جۆگەلەی گەرم و سوورەکان هەڵدەقوڵان، دەڕژانە سەر خۆڵەکەو چەند درزێکی تەسکیان لێدروست دەبوون یان دەڕژانە سەر زەویەکەو چەند گۆمێکیان جێ دەهێشت کە هەڵمێکی سووك سەری گرتبوون.. خوێنی ئاژەڵیش جوانە، ئاڵ.. ئاڵ، یان تۆخەو بۆنێکی هەیە کە پشیلەو سەگ کێش دەکات و دەمی تێدەخەن و ئەوکاتەش کە خۆڵ دەخەنە سەر خوێنەکە، قەسابەکە کێردێکی بچوکی تیژ وەکو موسی تەراش دێنێ بەووردەکاری و هێمنی پێستەکە هەروەکو جل لە گۆشتەکە دەکاتەوە و قەساب زۆر لێزانانە ئەوە دەکات، یان هەر بە ئانقەست دەستی دەخاتە نێوان پێست و گۆشتەکە، پاش ئەوە کێردە خوێناویەکە بەدەم هەڵدەگرێ و لەلێدانێکی لەسەرخۆدا پێستەکە هەڵدەکەنێ..

دەنگی هەڵکەندنی پێستەکە لە دەنگی هەڵکەندنی ئەو مەجلەمانە دەچێ کەلەسەر پشتی باوکمە..! ئاوەها پارچە.. پارچە گۆشتەکان دەڕۆن بۆ ئەو جێگایانەی کە پێویستە بۆی بچن.. پەراسووەکان لەسەر تەنافی جلشتن هەڵدەخرێن.. گۆشتە سوورەکان قەد دەکرێن.. چەوریەکان

دەتوێنرێنەوە.. هەمووشیان دەخرێنە تەنەکەیەکەوە. هەندێك یان لە ناواخنەکانی دەخورێن، ئەو بەشەکەی تری بە قورقوشم دەبەسترێ و بۆ ڕۆژانی زستان هەڵدەگیردرێت..

.. هەر لەم وەرزەدا، پاشماوەی ئێسقان لەناو کێڵگەکاندا فرێدەدران. ئیتر داڵە کەرخۆری گەورە وبچووك زۆر دەبوون گەورەکانیان کە لە عەلەشیش دەچوون، لە دوورەوە تێمان دەڕوانی و لێی دەترساین.. دەمانبینی ئەوکاتەی کەلە کەلاکەکان نزیك دەبوونەوە. بە دەنووك بەردەبوون لە یەك هەرکاتێکیش بە جوڵەیەکی تووڕەدا سەرنجمان ڕادەکێشا، باڵەکانی لە باوەڕبەخۆبوونێکی سەیردا لێکدەدا و بەرزدەبوویەوە.

لەبەر ئەوەی کە کێڵگەکان لە ماڵەکانەوە نزیکبوون و پێکەوە تێکەڵبوون. تەقسێکی تایبەتی شەوان دەستیپێدەکرد، تەقسی چەقەڵ بوو. تەقسێکی ناپوورە بوو، ئێمەی منداڵ لێی دەترساین. بەڵام دەنگدانەوەی ژیانی بەسەر ئەو خاکە بێدەنگە تەنیایەدا پەخش دەکرد..!

چەقەڵیش قەت ترسنۆك نییە وەکو باسی دەکەن بەڵکو دڕندەیە لەوکاتانەدا کە پێویستبوو دڕندەبێت.

تۆ دەزانی هاوڕێکەم ؟

لە "حەسەن سۆفی" بپرسە، ئەو کەسەی کە بەڕۆژ پەلاماری گیانلەبەرێکی لەمانەیدا! چەقەڵ بە تەنیا لە شەودا ئەمیرە.. "حەسەن سۆفی" بە ئەسپ و دار حەیزەرانە درێژەکەی ڕاوی دەکرد. هەر کاتێك نزیك دەبێتەوە، دارێکی لێدەدا، ئیتر چەقەڵەکە بازێکی دەدا کە قەپاڵەکانی دەگەیشتە چاوی ئەسپەکەی.. و.. "حەسەن" دەیگووت: شەڕی چەقەڵ دوو سەعاتی خایاند.. تا پرووکا.. و کەوت ئیتر تا مردار بووەوە ئەسپەکەی دەیشێلا..!

"حەسەن سۆفی" ئەو کاتەی کە باسی لە ئازایی چەقەڵ دەکات، زیاد ڕەویی ناکات. دەزانی بۆ.؟ چونکە "حەسەن سۆفی" دەموچاوی بە خودرەکەی دادەپۆشیو (پەلاماری دوا مردن) پەلاماری گوندەکانی "ابن عباس البدوی"ی دەدا، لە ڕووتاییەکی بینراوەوەو بە تفەنگەکەی تەقەی لە ماڵەکان و خۆ حەشاردراوانی پشت ماڵەکان دەکرد.. و پاشان ڕزگاریشی دەبوو لەوسەرەوە ڕانەمەڕێکیشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا..

"حەسەن" مێگەلەکەی زۆر دوور نەدەخستەوە، لە ترسی ئەوەی نەوەك دوژمنەکانی بیگرنەوە. بەڵکو وای بە باش دەزانی پاش هەر فرسەخێ بەشێکیان جێ بهێڵێ. تا لە دواییدا کاوڕێ یان دوو کاوڕی بۆ خۆی دەهێشتەوەو ئەوەشی بەسبوو..

هاوڕێکەم. لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا.. زەمەن زەمەنی جەردەیی بوو

لە کۆتایی ئەم سەدەیە و یان کەمتر ئێمەی منداڵیش بارمتەیەك بووین.. بۆ جەردەیی

**سێیەم:**

**لە ئاگر کەوتنەوەو.. لەڕاودا..**

بەغاردان لەنێوان ڕووبارو کونی مشکە کوێرەدا لەتەنەکەیەکی ژەنگاویدا ئاومان دەگواستەوە، ئاوەکەمان ڕۆدەکردە کونەکەوە دەگەڕاینەوە، تەنەکەکەمان پڕدەکردەوە لە ئاو و دەشمانزانی کە چاوەڕوانیمان زۆر ناخایەنێ

پاش ماوەیەك کونەکە پڕپڕ دەبوولە ئاو، چەند بڵقێکی بچکۆلە بەرزدەبوونەوە ورد ورد "مشکە"کە بە تەڕی دەهاتە دەرێ و "مشکە کوێرە" لە ڕاستیدا کوێرە بەڵام هەستی بە هێزی بۆنکردن لەلای ئەو چاوێکی وای پێ دەبەخشێ کە بە هیچ شتێکدا هەڵنەپژێ بەڵام ئێمە لەکۆتاییدا دەیگرین، بە کلکی دەیگرین و دەیخەینە تەنەکەکەوە.

ئەمە ئەو ڕێگایەی ئێمەیە بۆ گرتنی مشکە کوێرەو جربۆعی کێڵگەکانیش و یاریەکەش لەم سنوورەدا تەواو نابێت. مشکەکە لە ترساندا هەناسە بڕکێی پێدەکەوێت و ئێمەش سەرسامین بەو ترسەی، چاڵێکی فراوان هەڵدەکەنین و پڕی دەکەین لە ئاو پاشان مشکەکەی تێفڕێ دەدەین بە هەموو لاکاندا مەلەی تیا دەکات و هەر کاتێکیش بیەوێ دەربچێت بە دارێك پاڵمان پێوەدەنایەوە بۆ ناو ئاوەکە سەعاتێکی پێ ناچێت وەکو کونە بادەکات و لە جموجوڵ دەکەوێت لە بێ ئومێدیدا دەیەوێ دەربچێت و ئەو کاتەی ڕێگای لێ دەگیردرێت هەرەس دێنێ ئیتر ئەوکاتە بەرد بارانی دەکەین گەروی دەکاتەوە وقووت دەخواتەوە و جەستەیەکی لە کارکەوتوو سەر ئاودەکەوێت. هەر ئەمە بە جربۆعیش دەکەین بەڵام کونی جرۆبۆع چەندین کونی هەیە بۆ دەرچوون. هەریەکەیان درێژایی دوو مەترێك لەیەکەوە دوورن هەمووشیان لە ژێر زەمینەوە پێکەوە بەستراون بۆیە ئێمە هەموو کونەکان دەگرین بە تەنها یەکێکیان نەبێت ئەوەی کە ئاوی تیا ڕۆدەکەین. ئیتر ئەوانیش بە باکردوویی دێنەدەر هێندەیان ئاو قووت داوە ئەوکات بچکۆلەبووین. بچکۆلەگەلێك کە بە چاودێریکردنی جربۆعەوە ڕامان دەبوارد ئەو دەمەی کە دەهاتە دەری و پێیەکانی پێشەوەی بەرزدەکردەوەو ئاوڕی خێرای دەدایەوەو لە جووڵەیەکی پێکەنیناویدا لوتی دەخوراند هەوڵی ئەوەمان بووکە ڕاویان بکەین و تامردنیان گاڵتە بەئازارەکانیان بکەین بەڵام گوندنشینەکان گۆشتەکەیان دەخوارد هەروەکو چۆن گۆشتی قەتێ و ژیژکیان دەخوارد ئاواش گۆشتی جربۆعیان دەخوارد. ژیژکیش لای ئێمەی منداڵ چەند کاتژمێرێکی گاڵتەو گەپی هەیە کە بە کەوڵکراوی نەبێت لێی ڕزگار نابێت. ئێمە پاش خۆرئاوا بوون دەڕۆیشتین بۆ دەشت و دەر بۆ ڕووتایی چاوەڕوانی شەو دەکەین تا مانگ هەڵدێت هەر کە مانگ دەردەکەوێ، ژیژکیش دەردەکەوێ، ژیژك بە گشتی جووڵەیەکی خاویان هەیە، بەڵام ئەو قەڵغانە دڕکاویەی وا دەکات کە گرتنی کێشەیەکی سەخت بێت بەڵام ئێمە دەورمان دەگرتن و لەگەڵ خۆماندا قاپ قاپمان دەهێنا دەمانکردە پێمان و پێمان پیا دەنان و هەرکاتێکیش بە توندی قورساییمان خست سەر ژیژکە سەری لە قەڵغانەکە دەردەهێنا ئەو کاتەش، تەنیا پێویستیمان بە چەقۆی تیژ دەبێت، بەرگە دڕکاویەکەی پاش سەربڕین خاو دەبێتەوە، لە سکەوە هەر وەکو مۆزتوێکڵی دەگرینەوەو هەڵیدەدڕین.. بەڵام ژیژك و جربۆعی کەوڵکراو بە زیندوییێتی دێنەوە خەونمان، دێنەوە باڵیان لێڕواوە و کلکی مارمێلکەیان پێوەیە و شەوانە وڕێنە دەکەین، وڕێنەدەکەین و ماڵەوە خەبەرمان دەکەنەوەو ئیتر چاومان ناچێتەوە خەو تا ئەوکاتەی خۆر هەڵدێت، بەڵام ژیانی ئێمە، ئێمەی منداڵانی باکووری ڕووت هیچ خۆشیەکی‌تیا نییە جگە لە زیکەزیکی زیکزیکەو خشەخشی گیانلەبەرە خشۆکەکان نەبێت بە نێو گژوگیا وشکەکاندا لەبەر ئەوەی کە ئاوا دروستبووین ئیتر ئێمەش لەلای خۆمانەوە لەو وشکانیەدا هەوڵمان دەدا سەرقاپێك بۆ

خەونەکانمان دروست بکەین لە وێرانەی "فەرەنسیەکان"دا کۆدەبووینەوە کە ئەویش پاشماوەی ماڵ و سەربازگەی سەردەمی داگیرکردن بوون بە تەنیشت ڕووباری "جعجع"و بەتەنیشت تەنیا ئاشەکەوە ئەوەی کە تەنیا بە کاری کوێرانەی دوو ئەسپەوەمابوون کە لە سووڕانەوەکانیاندا ژیان و دەغڵودانیشی دەهاڕی هەر لەوێ چایی سیلانمان دەدزی‌و لە لاپەڕەی دەفتەردا دەمان پێچایەوە و ئاگرمان تێبەردەدا، بەوەش لاسایی گەورەکانمان دەکردەوە، بەڵام قومارچیە سالووکەکان بەسەرماندا دەهاتن و ئەو هێلانەیەیان لێ تێک دەداین، قومارچییەکان ئەوانەی کە گەنجەلێک بوون و هەمیشە جەردەیەک سەرۆکایەتی دەکردن لەو وێرانەیەدا، ئەو دەسکەوتانەیان لە نێوان دابەشدەکرد کە بەیاریەکانیان لە گوندنشینە ساوێلکەکان بردبوویانەوە. قومارچییەکان بوون کە دەهاتن ئێمەیان دەردەکرد.. ڕۆژی دابەشکردنەکەیان تەواو نەدەبوو ئەگەر یەکێکیان بەرگروزێکی چەقۆ نەکەوتبایە لە پشتەوەی یان لە کەمەرەی. بەڵام هەمیشەش ڕزگاریان دەبوو تەنها (ڕەشادەخێل) نەبێت ئەوەی کە هاوڕێکەی بە تەنها لێدانێک وازی لێ نەهێنا بەڵکو لە کەمەرەوە بۆ کەمەر و بە درێژایی لە سینەوە بۆ سکی هەمووی هەڵدڕی، هاواری دەکرد پاڵکەوتبوو هەموو ناوسکی هەڵهێنابووە دەرەوە پاش پێنج سەعات کە کەس نەهاتە هاواریەوە تا تووشی نەزیف بوون بوو دوا دڵۆپە خوێنی ڕژاو مرد. ئێمە منداڵانیش بە درێژایی یەک مانگ لە خەونەکانماندا قیژەو هاواریمان دەبیست و تەنانەت بێزاریشی دەکردینەوە وەکو دیوارێک ئا لەو خاکە بێ چرایەدا.

ئێمە سەرەڕای ترس لەوێرانگە بەڵکو ترسمان لە بوونەوەرەکانی سەیرانگە ئەوانەی بوونەوەر گەلێکن هەمیشە وا هەست دەکەین بە دەوروبەرماندا وێڵن. هەندێجار هەناسەکانیانمان بەردەکەوێ یان هەندێ جار وەختە گوێمان لە چپەچپەکانیان دەبێ ئەوانەی نەبینراون ئەوان ڕامالکراوێکی ڕابوردون گەورەکان نەبێ کەس نایان ناسێت.

ڕەواڵ سپین و چاوەکانیان هەڵ قڵیشاوەیەکن تا گوێچکەکانیان ئامادن هەر شێوەیەک وەرگرن کە هەڵیدەبژێرن، بەڵام (ئوسمانو) دەڵێ مادام دەمبوسێکی میتاڵ یان دەمامکێکی دورمانتان پێیە مەترسن.. و ئێمەش دەڵێین چۆن؟ ئوسمانۆ دەڵێ. ئەوان لە دەرزی دەترسن داپیرەم یەکێك لەم دێوە نەبینراوانەی بەدیلگرت کاتێ دەرزییەکی درومانی پیا چەقاندن ئیتر دێوەکە کەوتە ژێر ڕکێفی داپیرەم ئوسمانو گونجێکی تێکشکاوە داوای کچی مامەکەی خۆی کرد مامیشی ڕەدیکردەوە چونکە ئەو جەردەیەو بە ماڵی حەرام دەژی لە بەرامبەر ئەم ڕەتکردنەوەدا بڕیاریدا ئیش بکات و بە عارەقی نێوچەوانی بژێت و کاری پێڵاو بۆیاخکردنی دەکرد. ئوسمانو سەر بە تایەفەیەکی کورد بە (کولی) دەناسرێنەوە، (کولی)ەکان توندوتیژن هەندێکیان بۆ سەرکەوتنی هەندێکی تریان تا مردن شەڕدەکەن (کولی)ەکان حەماڵبوون و لە تورکیاوە هاتن هەندێکیان دەوڵەمەند بوون هەندێکی تریان وەکو خۆیان مانەوە دەستیان بە خێر و چاکەوەیەو هیچ نرخێک بۆ پارەوپول دانانێن ئوسمانو لەبەر هەژارێتیەکەی تێکشکاو نییە بەڵکو بەڕابووردووی تێکشکاوە. ئوسمانو ئێمەی مناڵانی، لە دەوروبەری خۆی کۆدەکردەوە چیرۆک و هەقایەتی وای بۆ دەگێڕاینەوە کە هەندێکیان ڕوویدا بوو و هەندێکیان قەت ڕووی نەدەدا.. کاتی کە کۆی دەکردینەوە ئێمە لەسەر سورماندا لە حەکایەتەکانی دەممان دەکردەوە: ئەوبوونەوەرە نەبینراوانە لە جێگایەکی چۆڵی نێوان گوندەکانی (عامودا)دا بە پاسکیلەکەیدا خۆیان هەڵواسیبوون پاشان دەیگوت: تەنیا جورئەت و خۆگرتن چەکی مرۆڤن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بوونەوەرە نەبینراوانەدا و خەڵکی ترسنۆک لە ترساندا تێی دەکەوێت. ئوسمانۆ دەڵێت کاتێ کە داپیرەی بەدەرزیەکی دروومان یەکێك لەو بوونەوەرانەی بە دیلگرت، ئیتر ئەو بوونەوەرە نەبینراوە بوو بە بوونەوەرێکی بینراوی (ئاسایی) دەستی دەخستە سەر گۆزەی ڕۆن ئیتر گۆزەکە لێی هەڵدەقوڵا و لێی دەڕژا تا داپیرە فەرمانی دەدا بە وەستانی و ئیتر دەوەستا پاشان دەیگوت پاش چەند ساڵێك داپیرە بوونەوەرەکەی ڕزگارکرد پاش ئەوەی سوێندی خوارد کە واز لە ترساندنی مرۆڤ بهێنێت.

بەڵێ، ئازادیکرد، دەرزیەکەی لێدەرهێناو بەرەڵای کرد (قەت لێمان نەپرسی کە کەی و بە کوێدا دەرزیەکەی چەقاندبوو) لەنێوان هەقایەتێک و هەقایەتێکی تردا ئوسمانو دەستی دەکرد بە گیرفانی چاکەتەکەیدا و وێنەیەک ی تەمومژاوی دەردەهێنا: کچێکی کاڵ لەسەر ئەژنۆی ئوسمانو دانیشتبوو و لە پێشیانیشدا مێزێك دانرابوو کە هەندێ شووشە و گڵاسێکی لەسەر بوو. بەڵێ وێنەیەکی تەمومژاوی بو لای ئێمەی مناڵ. بەڵام (ئوسمانو) شتەکەی ڕوون دەکردەوە: "من لە ئەستەمبووڵ بووم و ئەوەش کچە هاورێکەمە.." هاوارمان دەکرد: (ئەڵلاّ. تۆ زیرەکیت ئوسمانو) (کچێکی کاڵ) هەندێکمان سەیری یەکتریمان دەکرد یان لێمان دەپرسی (ئایا کچە هاوڕێکەت زمانی کوردی دەزانێت؟ (ئوسمانو) بەسووکایەتییەوە تێمانی دەڕوانیّ و دەیگوت ئەو زۆر زۆر شارستانییە..! شارستانییەتیش لەلای ئوسمانو جلی کورت و شێوەیەکی ڕووت و زمانێکی بیانی بوو هەقیشی بوو چونکە جلی دایکەکانمان زۆر ئاڵۆز و درێژ بوو و میکیاجی ئاڵکردنی لێویان بەکار نەدەهێنا، هیچ زمانێکی سەر زەمینیان نەدەزانی هەموان لە دڵی خۆماندا هاوارمان دەکرد ئای لە ئوسمانۆی مەزن! ئیتر (ئوسمانۆ) مان بیر دەچوویەوەو مامی ئەویشمان بیر دەچوویەوە ئەو مامەیەی کە بە هەڵهاتووی لە تورکیاوە هات کاتێ کە ئێوارەیەک لە بەردەم ماڵی (ئەحمەد سالو) دا ڕاوەستاو خەنجەرە خوارەکەی هەڵکێشا لەسەر دەستی ئەو دووانزە تەرم لەوناوەدا کەوتن تەرمی دە پیاوو و دووژن. مناڵان لە هۆی قەسابخانە ناپرسن بەڵکو سەرسامن بەو دەستە بوێرانەی کە خاوەنەکانیان ڕوو زەردناکەن لەوەشاندنی تەورو خەنجەردا.لەبەر ئەوەش کە ئێمە سەرسامین بە شتی لە ڕادەبەدەر (خارق) و بە پیاوی بەجەرگ و ڕۆنمان دەدزی و لە کەنار ڕووبارەکەدا جەستە لاوازەکانمان پێ چەور دەکرد لە مانۆرێکی پێکەنیناویدا هەندێ جموجوڵمان دەنواند.. مانۆڕی وەرزشی کە (ماسولکە)ی تیا نەبوو بەڵکو ئێسکی تیابوو، پاش ئەو مانۆڕانە خۆمان دەخستە ئاوەوەو بەڵام ڕۆنەکە نەدەڕۆیشت دەگەڕاینەوە بۆ ماڵ جلەکانی ژێرەوەمان بووبوو بە بەشێك کە لە پێستی ڕەشی سوتێنراو دەچوو لە شوێنێکی تەریکدا دامان دەماڵین وتا دووردوور فرێی بدەین. پاشان بە دزی ماڵەوە جلی ژێرەوەی پاکمان لەبەر دەکرد کاتێکی دوورو درێژی دەبرد تا ئەو کەمکردنەیان درك پێدەکرد لە جل و

بەرگەکانماندا بەڵام ئێمە لەوێ لە کەنارەکانی خاپوور هیچ ناچار نەبووین بە پراکتیزەکردنی ئەو دزینەوەیە چونکە هەر کاتێک دووربووین لە ماڵ و گەورەکانەوە دوور دەبووین لە ترسیشەوە، دوور دەبووین لەو تاریکە سەلاتەی منالێتی دەترساندین.. ئەو وەرزە لێوان لێوەش بەسەربەستی تەنها لە هاویندا هەبوو، ئەو دەمەی کە مامی گەورەمان بانگی دەکردین بۆ پاسەوانی عەمباری دەغڵ و دانەکانیی خۆی بە تەنیشت زێی خاپوورەوە بەشداریکردنی ئێمەش بەشداری کردنێکی بچکۆلانە بوو تەنیا کۆکردنەوەی ئەو دەغڵە ڕژاوانەبوو کە لە گونیەکانەوەڕژابوون پاش ئەوەی کە گەلابە گەورەکان چەندین تەنیان لەسەر زەویی لێ هەڵگرتبوو ڕۆژ بە ڕۆژ هەستمان بەوە دەکرد ئەوەی کە ئێمە کۆمان کردبۆوە بەشی مەسروفی درێژایی ساڵێکی تەواوی خێزانێکی تەواوی دەکرد، سەیارە بارهەڵگرەکان بە پڕی دەهاتن.. و بارەکانیان خاڵی دەکردەوە، یان بە بەتاڵی دەهاتن و پڕدەبوون لە نێوان هاتن و چونیاندا ئاوی زێی خاپوور بە گەشتێك دەیبردین. خاپوریش میرە (قەراڵ)ە لە نێوان ڕووبارەکاندا.. فراوانە و وەکو ڕەشەبا هەڵدەقوڵێ.. دار کالیپتۆز بە کەنارەکانیدا ئاپوورەیان کردوەو بەستراونەتە تۆڕی عەلیقەوە. ئەوانەی توویەکی سووری کێویلە دەگرن، یان داری خۆرئاوا بوون کە جلەکانی خاو دەکردەوەو وەکو قژێکی داهێنراو بە ئاوەکەدا دەینارد ئێمە بۆ گەشتەکانمان ئەو جێگایانەمان هەڵدەبژارد کە نزیک بوون لە ئاعوورەکانەوە، جلەکانمان دادەکەندو خۆمان دەخستە ئاوەکەوە و کاڵەکی سوورمان لەگەل خۆمان دەبرد، کاتێکیش ساردەبوویەوە دابەشمان دەکرد، ئێمە لە نیوەڕۆ گەرمەکانی باکوردا کە لە ڕۆژدا شۆستەی شەقامەکانی تیا دەتوایەوە.. و لەوێ بە تەنیشت ناعورەکان و هەناسە برکێ ئەبراوەکانیەوە، کچە لادێییەکان وەکو پۆلە قەتێ هەڵدەنیشتن، لەگەرمای نیوەڕوان هەڵاتبوون و دەهاتن بۆ لای ئاوەکە.. کچە لادێییەکان لە کێڵگەکاندا کاریان دەکرد بەروبومی باینجان و بیبەرو کولەکەو خەیاریان دەچنی بەرامبەر هەندێك لەوانەی کە چنیبوویان.. هەموو ڕۆژێك و پۆلێکی تازە دێن.. هەموو پۆلێکیش لەنیوەڕواندا هەڵدەهاتن بەرەو ئاوەکە.. ئەوەش خووی ئەوانە..

ئەوان بە جلە شۆڕەکانیانەوە خۆیان دەخستە ئاوەکەوە، پاش ئەوەی کە لە جلەکانی ژێرەوە ڕزگاریان دەبوو کچە لادێییەکان هەمیشە پێیان پەتیەو جلی ژێرەوەش لە پێ ناکەن.. ئەو کاتە ئێمەش منال بووین، بە لامانەوە گرنگ نەبوو کە جلە تەڕەکانیان دەنووسا بە گیانیانەوەو لە هەموو نوشتانەوەیەکدا خزانێکی بەلەززەتیان دروست دەکرد.. گوێمان نەدەدایە دەستبازی هەندێکیان بۆ هەندێکی تریان یان هەندێکیان لەگەڵ ئێمەدا.. ئێمەی بە تەواوەتی ڕووت. جلەکانیان سەر ئاو دەکەوت و کاتێکیش ڕۆدەچوونە ئاوەکەوە جلەکانیان تا گەردنیان بەرزدەبوویەوەو کاتێکیش هەڵدەستان، لەسەر خۆخاویان دەکردەوەو ئێمەش زۆرمان بەلاوە سەیر بوو کە جەستەی ئافرەت تووکی لێ دەڕوێ، وامان دەزانی کە ئەوە تایبەتە بە پیاوان، بەڵام سەیر ئەوەبوو. ئەوان هەرکاتێ بێزار دەبوون لەگاڵتە و گەپی نێو ئاوەکە. جلەکانیان لەبەر دادەکەندو هەڵیاندەخستە سەر چڵەکان تا وشك دەبوونەوە.. و بەڕووتی دەمانەوەهەندێجار خۆیان لە پشتی دارەکان دەشاردەوەو هەندێ جاریش بێ گوێدان بە ئەو چاوانەی کە دەیخوێندنەوە خۆیان هەڵدەخست.. ئەو کاتانەش ئێمە لەوهۆیانەمان دەپرسی کە بۆ بەجلەکانیانەوە خۆیان دەخەنە ئاوەکەوە مادامێك کە ئەوان پاش ئەوە بەڕوتی وشکیان دەکەنەوە..؟ بەڵام دوژمنایەتیەك لە نێوان ئێمەو ئەواندا دروست دەبوو کاتێ کە دەستەسڕ یان جلی یەکێکیان ون بایە، ئەوان یەکێکی خۆیانیان تاوانبار دەکرد کە ماندوودەبوون لەمشت و مڕو شەڕە قسە ئێمەیان تاوانبار دەکرد و ڕایاندەکێشاینە پەنایەکەوەو ئێمەش گازێکمان لێ دەگرتن و ئیتر ئێمە لێیان هەڵدەهاتین و دوور دەکەوتینەوە- و هێشتا هەر ڕووتبووین کە مەرمان لە جوڵەیەکی سەیردا دەجوڵاند، کە ئەوەش لە جوێن بە ئازارترو ناخۆشتر بوو لەلای ئەوان و درێژەمان دەدا بەو جوڵە سەیرە کە ئەوەش تووڕەی دەکردن. چڵێکی وشکمان دەگرت و دەمانخستە نێوان هەردوو ڕانمانەوەو هاوارمان دەکرد (یەڵە کچینە!؟) ئیتر ئەوان بەردبارانیان دەکردین..

پاش زەمەنێك لەم گاڵتە و گەپە، کە زەمەنێکی کورت بوو..! ڕقمان لە خاپور دەهاتەوە چونکە "عبدالمجید جاجان"ی لێ فڕاندین چوار ڕۆژ کەس و کارەکەی بەدوای جەستەکەیدا گەڕان.. و کاتێکیش کە دۆزیانەوە وەکو تەپڵ بای کردبوو و ماسی چاوێکی خواردبوو.. بەڵام ڕقی ئێمە خاپووری نەوەستاند هەر بە قەراڵی مایەوە لە نێوان ڕووبارەکاندا، قەراڵێکی بە ئاپوورە کۆمەڵە گوندێکی قەرەباڵغی بە دەورخۆیدا کۆکردبۆوە گوند گەلێك کەجوگرافیا و داب و نەریت و میوەهاتیان دەگۆڕیەوە هەر لە ئاشووریەکانەوەتا دەگاتە کوردو یەزیدیەکان.. گوندە ئاشورییەکان ناسرابوون بە چاندنی هەنجیر و گوندە کوردو یەزیدی نشینەکانیش بە شوانکارەیی و مریشك بەخێوکردن و چاندنی هەندێ کشوکاڵ وەکو لفکەو پەموو.. ئەمانەش بە پێوانە لەگەڵ نامۆیی یەزیدییەکاندا هێندە سەرنج ڕاکێش نەبوون ئەوکاتە ئێمە منداڵبووین ئەو مێژووەمان هێندە لا مەبەست نەبوو کە یەزیدیەکانی پۆلێن دەکرد بۆ چەند تیپێکی ناوەکی بنەڕەتیانمان لا مەبەست نەبوو، یان ڕۆڵی بەریتانیا لەوەی کە کەمایەتیەکیان لێ دروست بکات وەکو کەمایەتیەکانی ڕۆژهەڵات، هەر وەکو ڕاهاتبوو وا لەو جیهانەمان بکات کە تا خنکان لە ڕابردوودا ڕۆچووبوو، یان لە ڕازیبوندا تا خنکاندن گۆشەگیر بووبوو ئێمە لەنێوان سەرسوڕماو و سەرسام بووندابووین ئەو دەم بەو پیاوانەی کە پرچەکانیان وەکو ژنان کردبووە پەلك یان سمێڵە چڕەکانیان و لێوەکانیان دیار نەبوون پیس بوون خۆیان نەدەشوشت مەلیك تاوسیان پیرۆز ڕادەگرت یان شەیتانی گەورە وەك دەڵێن مامم کە خاوەن عەمبارەکانی نزیك خاپووربوو شەریکێکی یەزیدی هەبوو ناوی (حاجی) بوو کە قەت بۆ ماڵی خودا نەڕۆیشتبوو بەڵام بە (حاجی) ناوبانگی دەرکردبوو لەوەمان نەدەپرسی بۆچی؟؟ حاجی بازرگانێکی لێزان بوو.. ئێمە هەستمان پێدەکرد کە هەموو شەوێ هەڵدەستێ و نوێژێکی نامۆی لەبەر خۆیەوە دەووتەوە. ئەو کاتەی هەموومان لە هۆڵێکی لە سەنگەر چوودا ڕادەکشاین.. بەڵام بەڕۆژ بە ئەنقەست دەگەڕاینەوە بۆ یاریەکانمان لەگەڵ ئەو پیرەدا جوێنمان بە شەیتان دەدا یان هەرکاتێك بەلایدا تێپەڕین ئەفرەتمان لێدەکرد ئەویش ڕوومەتی سوور هەڵدەگەڕا و ئەفرەتی لێدەکردین لە ڕقەبەرایەتیەکی دیاردا تفمان دەخستە سەر زەوی. چونکە شەیتان لە چڕیدایە: لە زەمەن و لە تاریکیدایە.. ئیتر ئەفرەتی لێدەکردین و لە

کۆتاییدا بە دەوریا لەسەر زەویە خۆڵینەکەدا بازنەیەکمان دەکێشا و ئیتر یەزیدی تامردن لەو بازنەیە نایەتە دەرێ.. یان لەوێنەکەیدا دەیسڕێتەوە "حاجی" لە ترسێکی ئاشکرادا هاوار دەکات:بەچکە سەگینە بازنەکە بسڕنەوە ئێمەش هاوارمان دەکرد تۆ لە نەوەی شەیتانیت و بەچکە سەگیت. تا لە کۆتاییدا یەکێك لە گەورەکان دێتە فریای "حاجی"وەو بازنەکە دەسڕێتەوەو ئێمە ڕاودەنێ. ئیتر ئەو ڕۆژە مامم قەساسمان دەکات.لە توند وتیژیەکدا قەساسمان دەکات تا هەندێ جار دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە یەکێکمان بگەڕێتەوە لەبری ئێمە داوای لێبووردن لە "حاجی" بە هەیبەت بکات..

.. و گەڕانەوەمان لەو سەربەستیە، لە سەربەستیخاپووری قەڕاڵ و ئەو کەنارانەی کە بەرامبەر چیای "عبدالعزیز"ن ئەوەی کە هێلانەی کۆترە کێویلەی زۆر لێیە، گەڕانەوەیە کە بۆ ترسی عادەتی، گەڕانەوەیەکە بۆ تەپوتۆزو قەساس بوون، گەڕانەوەیەکە بۆ منالێتیەکی خەڵتان بە پایزی شارو قوتابخانەکانی، بەو بارانەی کە تۆزی هاوین لە بەرزاییەوە ڕادەماڵێت و جگە لە قوڕ هیچ نابارێنێت.. بەڵام ئێمە لە گەڕانەوەماندا بۆ قەفەسی گەورەکان و دەسەڵاتە کۆنەکەیان ڕاڕەوێك بۆ حەز و خولیاکانمان دەکەینەوە، ڕاڕەوێك لە وێرانەو ئازارەکان، پاشماوەی منالێتی تێك و پێك دەشکێنین و خەونی گەورەکانیش بە منالێتی ئێمە، ئەو کاتەی گاز ڕۆدەکەینە سەر پشیلەیەکدا و لە کلکەوە گڕی تێبەردەدەین.

پشیلکە شێت و هار دەبێت و غار دەدات، دەکێشێ بە دیواری ماڵەکاندا و چەند مەترێك لە زەمین بەرز دەبێتەوە ئاگرەکە لە کلکیەوە بەردەبێتە گشت جەستەی. غاردەدات و ئێمەش بەدوایدا غار دەدەین دەگاتە ئەو کۆردەریەی کە بە تەنیشت ماڵەکانەوەیە پێش ئەوەی کەلەی سەری وەکو فوودانکەیەك (میزڵدان) بتەقێتەوە. سوتانی کۆردەرش لەلای خۆیەوە چەند سووکە.. باوەش، باوەش ئاگرەکە درێژدەبێتەوەو مەتر مەتر گڕەکە بەرزدەبێتەوە.. دێینەوە لە گەورەکان دەپارێینەوە هەر وەکو ئەوەی ڕوویداوە هیچ پەیوەندی بە ئێمەوە نەبێت.. گەورەکان بە دۆڵەکەی ئاوەوە دێنە دەرەوە ئەو کاتەش ئاو سوودی نامێنێ خاکەنازدێنن و خۆڵ دەڕژێنن بەسەر ئاگرەکەدا، ئەوکاتەش گەورەکان بە خاکەنازو ژنانیش بە چاوەچاوکردنەوە سەرقاڵن ئێمەی منال دزە دەکەینە حەوشەی ماڵی "عقدال"ەوە باروت دەبەستین بە کلکی گوێرەکەکانەوەو دەرگا دارینە گەورەکان دەکەینەوە فتیلەکان ئاگر دەدەین خێرا دەڕۆینە دەرەوە دەژمێرین یەك دوو سێ تەواو ناکەین لە حەوشەدا ئاژاوەیەك ڕوویداوە گوێرەکەکان بە دەوری خۆیاندا دەسووڕێنەوەو مێخەکانیان لەبن دەردەهێنن و شێتانە لە دەروازەوە بۆی دەردەچن

خێڵی "عقدال" ئەو ڕۆژەیان بە ڕاونانی گوێرەکە هەڵاتووەکانیانەوە دەبەنەسەر بەنێو گەڕەك و کێڵگەکاندا. کاتێ کەوەگێری دەخەن لە ماندوێتیدا ئەفرەت لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لەمانگ و ئەستێرە دەکەن.. ئێمەش ئەفرەتیان لێدەکەین. ئەفرەت لە مانگ وئەستێرە دەکەین لە لوورەیەکی بێ دەنگدا وەکو گیانلەبەری بریندارى دەشتاییەکان هاوارمان دەکرد. بەرەو ڕوی تاریکیە سیحراویەکە دەڕۆیشتین، ئەو تاریکیەی کە شارەکەی دەسڕیەوە و دەیکرد بە زەریاگەلێك کە قامیشەکانی کەنارەکانی دەشکان. دەشکان بە غاردانی شێتانەی جەستەگەلێك نیوەیان پێی گامێش بوون و نیوەکەی تریان ڕووەکی حەرشوف نیوەیان جربۆع بوون و نیوەکەی تریان پرچێکی داهێنراو بوون وەکو پرچی ژنان.. لە هەمان ڕووگا ورد دەبووینەوە هەر وەکو پێکانمان سەرچاوەی هەڵکردنی شاراوەی نێوان "عامودا" "حلکو" بێت تەپوپۆز تەپوتۆز، زەمینیش خۆی بۆ تیرەکانی منالێتیمان دەرناخات تەنها لەشێوەی گایەکدا نەبێت کە تۆپی گەورەی مردوانی بەشاخەکانی هەڵگرتووە..







بەشێك لە ڕۆمانی:

# پەڕ

نووسینی: سەلیم بەرەکات
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
جەوهەر کرمانج

**ئەو کەسایەتیانەی بۆ ئەم چارەنووسە هەڵبژێردراون**

1-کوردستان- وڵاتێکە حەمدێ ئازاد دەتوانێ دەس[illegible]انی بکات.

2-"مەم"[illegible]ی کوڕی حەمدێ ئازاد" ئەو لاوەی حەقیقەت [illegible]ەکاتەوە"

3-حەمدێ ئازاد" کوتاڵ [illegible]ن"

4-مەلا سەلیمی بەدلیسی" خاوەنی شۆڕشێکی غەدر لێکراو"

5-کونسوڵی ڕوسیایی و ژنەکەی" خانە خوێی مەلا سەلیم"

6-شێخ محەمەد سەعید نەخشبەندی" سەرکردەی یەکەم ڕاپەڕینی کورد"

7-" پیاوە گەورەکە" "کەسێکە لە ڕۆمانەکە دەرناکەوێ"

8-چوار پیاو" چاو ساخی مەم بۆلای" پیاوە گەورەکە"

9-پیاوێك دەستەکانی وەکو باڵن" دراوسێی مەم"ە

10-حسێن موکریانی" خاوەنی یەکەم چاپخانەی کوردی"

11-" سێ درەختۆکەی گوڵ" تەنیا درەختۆکە"

12-بڕکە بیبەرێکی پووچ" گیایەکی ئازار کێشە"

13-دوو باڵندەی سەر بە پۆپنە "باڵندەی کێڵگەن زۆر دەردەکەون"

14-گۆڕێکی ناتەواو" گۆڕێك لە چۆڵەوانیەو بە جادەیەکەوە نووساوە"

15-ئەحمەد کەلیم" ڕاوچیەو لە ژیانیدا ئاسکێکی ڕاو نەکردووە"

16-دینۆ "جمك"ی مەمە.

17-ئەحمەدی خانی"شاعیرێکی دێرینی کوردە.. مەم و زینی داناوە"

18-هیڤین "18" ساڵانە "وڵات" "16" ساڵانە "عەیشانە" "14" ساڵانە "ڕەحیمە" "12" ساڵانە"ڕووهات" "9" ساڵانە "هێلین" "5" ساڵانە کچی حەمدێ ئازادن.

19-کەسپۆ (دایکی مەم، ژنی حەمدێ ئازاد)ە

20-قازی محمد(سەرکۆماری یەکەم کۆماری کوردی)

21-مهاباد "شارێکە یەکەمین کۆماری کوردی بەناو کرا"

22-ئیسماعیل سمکۆ ئاغا "پیاوێکە سەربردەکانی گرژن"

23-"خاوەن پۆستاڵەکە" کچێکە ناوەکەی پشتگوێ خراوە.

24-شێرۆ بابان"خاوەن دەراسەیەو بەدبەختە"

25-قادر حەمۆ "وێنەی سمکۆ ئاغای لە گیرفانە"

26-جۆمەرد "کوڕی خوشکی کەسپۆیە"

27-جەببوور مەرقەس"دراوسێی خێزانە سریانەکەی حەمدێ"

28-بارام جور" میرێکی داستانانە".

29-ڕادیۆیەکی تازە"شەپۆلی زۆری هەیە"

30-دوو درەختی(کینا) جیاوازییان لەگەڵ درەختەکانی دیکەی(کینیا)نیە کوتاڵ، تەختێکی نووستنی گەورەی دار.. ئەسپێکی ڕەش.. چەند دەراسەیەك تورگ.. زێ.. نەخۆشخانە.. کێڵگە.. ئاسمان.. با.. چارەنووس.. باران..و.. زۆربلێیی.

## "بەشی یەکەم"

**نەخشە کێشانێکی ناهەمواری کات**
**بەر لە خۆکوشتنی"مەم" وردەکاریە**
**ئاشکراکانیش هەر خۆیان ئاشکران.**

### فەسڵی یەکەم

کە هەموو جلەکانم لەجانتا چەرمیەکە دەرهێنا، لەپڕ، لە بنە بانە تاریکەکەیدا پەڕێکی بۆری گچکە بەحەوای کەوت، پاشان بەلاری لەو بنە بانەدا جێگیر بوو کە لۆچەکانی بەچاکی دیارن کە زبرن. ئەو کەسەی ئەم جانتایەی دروست کردووە هەرگیز بەخەیاڵیدا نەهاتووە کە من بەم دیقەتەوە تەماشای بنەکەی دەکەم و داوە ئەستوورەکانی دەبینم کە سەرەکانیان بەدەست قرتێندراون نەك بە مەقەست.

دەستم درێژ کردو پەڕەکەم هەڵگرتەوە، لەبەر ڕووناکیدا بۆر نەبوو، لەدەرێی جانتاکە لە سەروبنی ورد بوومەوە، سپی و بۆر بوو.. یەکجار گچکەو گەچلاو بوو.. ویستم فڕێی بدەم بەڵام هەڵوێستەیەکم کرد، پەنجەم لێ بەردا دیسان کەوتەوە بنی جانتاکە.

لەخۆم نەپرسی داخوا کێ هاویشتویەتە ناو جلەکانم، یەکەمین جار خواروخێچ بوونەکەی لە بنی جانتاکەدا سەرنجی ڕاکێشام بەو ڕەنگەشیەوە کە هاتە بەرچاوم تا دوایی لەبەر ڕووناکیدا بۆم دەرکەوت چۆنە، ئەوە وای لێکردم جارێکی دیکە بیهاوێمەوە بنی جانتاکە، بۆ ناو ئەو تاریکیەی لەسەر لۆچەکانی ڕاکشاوە کە دیارە گرێیەکانی داوەکە لەسەر چەرمەکە پاڵیان پێك داوە.

جا بۆ سەبارەت بە یەك پەڕ لەخۆم بپرسم..؟ چما ئەز لە بەڵگەیەك دەگەڕێم تائەوە بسەلمێنێ کە حەقیقەت قەباحەتێکە هەندێ کەس دەتوانن وەك پارچە نانێك فڕێی بدەنە سەر تەڵەی خەڵکانی دی..؟ پەڕێك.. یەك تاکە پەڕ وەك بەناو خۆکوشتنەکەی منە! کەس هەیە دوو جار خۆی بکوژێ؟ دووجار هەوڵ دەدا بەڵام دووجار خۆی ناکوژێ.. ئەگەر تەقەللا بدات ڕەنگە دەربازیش بێت، ئەگەریش خۆی بکوژێ ئەوا دەمرێ، مردنیش واتە مردو هیچ واتایەکی دیکەی نیە، منیش بڕیارم دا خۆم بکوژم، بەڵام پێش ئەوەی ئەم جانتایە بکەمەوە کە ئەم پەڕە بۆرە لەبنە بانە تاریکەکەیدا بەرز بۆوە.

کەمێك بیرم لە هێندێ بابەتی فەلسەفی کردەوە کەهەر لەو چەترەی من دەچوو کە لە سووچێکی پشت دەرگاکەوە هەڵمواسیوە، لەبەر ئەوەی باران تەڕی کردبوو.. بەخۆم گوت:- هەڵوێستەکەش پێویستی بەم جۆرە قرقەپیە نەبوو-"مرۆڤ بە سروشتی خۆی شەڕانگێز لە دایك دەبێ، کەچی هەموو تەمەنی خۆی لەوە بەسەر دەبا تا بیسەلمێنێ کە شەڕانگێز نیە". لە ناخەوە پێم وایە کە هەڵوێستەکە نەدەبوو ڕێ بەو هەموو تەرزە زۆر بلێییەی ناوەوە بدات، مادام کەسەکە-خۆم-م دەیەوێ خۆی بکوژێ. خۆکوشتنی بێ زەوقانە شتێکی گاڵتەجاڕیە تا ڕادەی دەربازکردنی ڕۆح لەپێکەنین، مەبەستم ئەوەیە ئێمە کاتێك خۆمان دەکوژین کە لە ڕادەی

ئەو پێکەنینە بێزار بین کە بەسەر رۆح دا زاڵە، رووداوەکەش بە ئەختێ ئاسان کردنەوە، وەك ئەو کەسە وایە لەپێکەنیناندا دڵی بتەقێ.

ئەوها.. لاسەنگیەکی کەم لە رێژە ئاساییەکانی ژیان کە پێویستە رەچاو بکرێ، پێدەکەنێ جا دەتەقێ. تووڕە دەبێ جا دەتەقێ دەخوا تا دەتەقێ. برسی دەبێ تا دەتەقێ، دەخەوێ تا دەتەقێ رووناك دەبێ تا دەتەقێ حوکمرانی دەکا تا دەتەقێ، کۆیلایەتی دەکا تا دەتەقێ، هەناسە هەڵدەکێشێ تا دەتەقێ. دەخنکێ تا دەتەقێ ئەوها.. لاسەنگیەکی کەم لە رێژەکاندا وەك چێشت لێنانە.. ژیانیش خۆی چێشتە.. بۆیە ئەو رۆژەی بریاری خۆکوشتنم دا لە بارانم دەنۆڕی کە بەخوڕ دایکردبوو. لەو دیو پەنجەرەی ئاشپەزخانەکەم دا جووتێ باڵندەی ئاقاری"سەربەپۆپنە"م لە چۆڵەوانیەکەی پشت ماڵەکەم دا بینی. چەترەکەم هەڵگرت و لە دەرگای ئاشپەزخانەکەوە بەرەو ئەو جێگایە چووم کە هەردوو باڵندەکە لێی هەڵنیشتبوون. خۆیان لە ژێر بارانەکە کورژ کردبۆوە. بەجۆرێك کە ملیان دیار نەبوو. کە نزیك بوومەوە هەڵفرین.. تێنەگەیشتم بۆ هەڵفرین..! خۆ منیش وەك ئەوان بەخۆم و چەترەکەمەوە لەژێر بارانەکە بووم.ویستم وەکو خۆم بیانپارێزم. نازانم لەو چۆڵاییەی پشت ماڵەکەم دادەنیشتم یان هەر بە پێوە رادەوەستام تا بارانەکە لێی دەکردەوە..؟ ئەوەی بزانم دەمویست لەناخەوە ئەم دووباڵندەیە بپارێزم. بەڵام هەڵفرین.

"باڵندە لە من ناگەن" لە ناخەوەو بە باوەڕێکی تاڵەوە ئەم بریارەم دا پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵ.. زۆر خەمناك. هەر ئەوەش زیاتر هانی دام لەسەر خۆکوشتن. لە کاتێکدا من پێویستیم بە ئەگەری زێدە نەبوو. بەڵام هەرشتێکی زیادە مانای درێژەدانی دواخستن لە حسێبەکە ناهێڵێ: "دەبا ئێستا بمرم".

بەڵام من دەمەوێ رێ بە دەروونی خۆم بدەم کەلەبەری بریارەکەم بزانێ ئەویش پەیوەندی بە ئەگەری زیاد هەیە کە بێ چەندو چوون پشتم پێ بەستوە. بەڵکو بە وەرسیەکی زۆریشەوە - تا رۆحی خۆم بەرکەنار- بکەم.

زیادبوونی هۆکارەکان.. مایەی سەرنجن، دانی پێدا دەنێم.. هەر درێژە پێدانێك چەندیش گچکە بێت سەرنج راکێشە. بەقەدەر ئەو سووربوونەی کە هەتە. بەو توانایەی کە هەیەتی بۆ رازی کردن، بەتەواوی وەکو سەربردەکەی من و ئەو دوو باڵندە ئاقاریەی کە هەڵفرین- جا چ جای ئەوەی کە وەك من بیربکەیتەوە:

"هەموو هەر دەمرین.. جا جیاوازی چیە ئەگەر چەند ساڵێك کەمتر بێ یان زیاتر؟". بەڵام ئەوەی وای لێکردم دابمێنم پرسیارێکی پووچ بوو: "بۆ خۆت کوشت؟".. واتا یەکێك لێم بپرسێ بۆخۆت کوشت، پرسیارەکەش لەجێی خۆیدا نیە، بە هەر حاڵ، دوای خۆکوشتنم کەس لێم ناپرسێ. تەنانەت لەدیداری کەس و کاریشیاندا، بەڵام من ناتوانم ئەو ئەگەرە ببوێرم، واتە ئەگەر یەکێك لێم بپرسێ: "بۆخۆت کوشت"؟ "خۆم کوشت"! لەوانەیە بە مالۆسی وەرام بدەمەوە "خۆم کوشت" ئەوها "خۆم کوشت" لەبەرچی..؟ ئەم لەبەر چیە چیرۆکێکی دیکەیە، ئەوە وردەکاریە.

"کەواتە خۆ کوشتنم دوورو درێژە" وا بەخۆم دەڵێم.. بۆ نموونە من هەموو بەیانیەك یەك سەعات خەریکی خۆ شووشتنم، تا وای لێهاتووە بەیانی لەکن من بۆتە ئاو و سابوون و کەف، هاورێکانم دەڵێن: ئەوە چی دەگەیەنێ. هەڵبەتە مەبەستم لە بەیانیانە- کوڵهەڵگرێك کە لەناو کوڵهەڵگرەکانی شاردا نابیندرێ، بەگوێرەی قسەی ئەوان بەیانی سفرەیەکی بەتامە، چێشتێکی خۆشە، رامانێکی خێزاندارانەیە، فاتوورەیەکی جێ وەرس بوون دەدرێتە رۆژ، کە من ئەوە نازانم. چونکە من کە لە خەو رادەبم یەکسەر بە چاوی نووقاوەوە بەرەو گەرماوەکە دەچم، یەك سەعات خەریکی خۆشووشتن دەبم. سەعاتێکی تەواونا، بەڵکو بە هەموو کلك و گوێکانیەوە، دوای ئەوەش پەلە پەلمە بۆ لەماڵ دەرکەوتن.

درێژ دادریەکی بێزارئامێزە، بەڵام مکومە، لە ناوەوەی ورد دەبیەوە چونکە دیلی ئەویت. بەڵام لە هەموو شتێ سەیرتر لەناو ئەم درێژ دادریەدا بوونی منە. مەبەستم بوونمە لەم ماڵە گەورەیەدا، کە باخچەیەکی گچکە لە لای سەرەوەیەتی و چۆڵەوانیەکی گیاییش بە گوڵە دالیا رازاوەتەوە و دار هەنجیرو زەیتون لای رۆژهەڵاتیەوەن، زەویەکی بەیاریش کەوتۆتە لای خوارەوەی. دوو هەنگاو دوای لیتۆکەی نزیك تارمەی ژوورە نزمەکەی نووستنیش پیادە رۆیەك کە هەر جێی ئۆتۆمبیلێك دەبێتەوەو لەنێوان ماڵی ئێمەو ساختمانەکەی رۆژاوادایە، پونگە کێوی لێ دەڕوێ لەگەڵ گوڵە مێلاقەیەك کە زۆر نامێنێتەوە دەمرێ، کە دەڵێم "زۆر نامێنێتەوە" قسەکەم وا دەگەیەنێ کە من زۆر لەوێ دەمێنمەوە بۆیە ئەم سەرنجەم لا دروست بوە. بەڵام دیسان دێمەوە سەر درێژەی سەربردە سەیرەکە! ئەویش پرسیار لەمەڕ لێرە بوونم..!

رقم لەوە دەبێتەوە بیرۆکەم بگێڕمەوە سەر زنجیرەی سەربردەکە، بیرۆکەکەم تەمبەڵە، خۆیشم وام حەز لێیە.هەر لەبەر ئەوەیشە ئەو هەموو ساڵەیە لێرەم. لەم ماڵەدام، بێ ئەوەی هیچ سۆزێك وام لێ بکات هەست بەوە بکەم کە ئەم هەموو ماوەیەی لێرە ژیاوم درێژبووە و پێویستە وابکەم شتێکی ناخم ئاوڕ لە رابردوویەك بداتەوە.

بیرۆکەم تەمبەڵە، خۆم تەمبەڵ، سۆزم تەمبەڵ، هەر لەبەر ئەو لاسەنگیەشە هەنگاوم بەرەو خۆکوشتن تەمبەڵە. کە ئەمڕۆ جلەکانم لە ناو جانتا چەرمیەکە دەرهێنا، چەند ساڵێك دەبوو لە ناو ئەو تاریکیەدا راکشابوون چونکە بەراستی ویستم لەسەر قەرەوێڵەکە پەرتیان بکەم، تا ئەوانەی دوای خۆ کوشتنم تەرمەکەم لە ماڵ دەبەنە دەر بیانبینن. بەڵام ئەم پەرەم هەر لە خەیاڵیش نەبوو، مەبەستم ئەم پەرە بۆرەیە کە لە بنە بانە تاریکەکەی جانتاکەم دا بەرز بۆوە.

لە بیرم چوو باسی ساکەگۆڕی ئەسپ سواریەکە بکەم، کە ئەویش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ماڵەکەمان، کە دەتوانم لە باخچەکەی پێشەوەڕا بیبینم لەلای زەویە بەیارەکەش ڕا، پێکەوە، باسی رووناکیە نارنجیەکەشم لەبیرچوو کە بەسەر دارتێلێکەوە باخچەکە رووناك دەکاتەوە، ئەم رووناکیەیان تازە داناوە، لەجیاتی چرا کزەکەی جاران، کە بەقودرەتی خوا پێشووڵە هار دەکات، دراوسێ پیرەکەشم لە بیرچوو کە هەمیشە باخچە مردوەکەی ماڵەکەی بە زەمان گرتوە کە دەکەوێتە سەرەوەی شەقامەکە، هەر ئەوەندە بوو لەبەر خۆمەوە گوتم لەوانەیە بمرێ. دەق مرد! دڵگیربووم، کە دەبینم ژنەکەشی بەهەمان شێوە لە ناو باخچەکە دادەنیشێ. بەڵام ئەو نەمردوە، چونکە دەروونی خۆم نەدواندوە کە لەوانەیە بمرێ، نەبادا ئەویش بمرێ. ئارەزوەکانیم گەلێ لا سەیر بوو، زۆری حەز لە شیرینی دەکرد، هەر ئەوەندە گوێی لە کابرا پیرە عەرەبانچیەکە بوایە کە بە بڵندگۆیەکەوە بانگی شیرینی دەکرد، پیرەژن یەکسەر دەردەپەڕیو بە

دارەدارە خۆی دەگەیاندێ و تۆپەڵێك شیرینی رەنگاو رەنگی دەکڕی و هەڵیدەلووشی.

هیچی دیکەم لەبیر نەکردوە..؟ بەهەرحاڵ لەکاتی خۆیاندا وەبیرم دێنەوە. با بێمەوە سەر مەسەلەی ئەو هەڵبژاردنە تەمبەڵ و وەڕسەم، کە مەسەلەی خۆکوشتنمە. بەلاّم ئەم پەڕە گەمژەیە لێی تێك دام. بەڕاستی لێرە چی دەکات..؟ بۆ نموونە قەتم بالیف نەخستۆتە ناو ئەم جانتایە. ئەوە چەندین ساڵە لەم ماڵەمان دایەو هەر جلەکانی خۆمم تێ هاویشتوە، دوای ئەوەش نەمکردۆتەوە، جلی زێدەم هەبوون، رۆژ بەڕۆژ کریومن و جانتاکەم نەکردۆتەوە، بەتەماش نەبووم هەرگیز بیکەمەوە، چونکە کە ئێرە بەجێ دێڵم تەنیا ئەو جانتایە دەبەم، هەموو شتێکی دی بەجێ دێڵم. مەبەستم ئەوە نیە کە سۆزێك پێیەوەم گرێ دەدا تا کچێنی ئەم جانتایە بپارێزم وەك دیاریەکی بچووك لە کەسێکی نادیارەوە بەڵکو لەبەر تەمبەڵی هێشتوومەتەوە، بۆ حەزێکی سەیریش کە منیش نهێنی‌یەکم هەبێ تا ئەم تە، زە قەباحەتە هەموو شتێکم لەو گۆڕە نەبێ: ب مۆز، بێ گەمە، بێ سەربڕینەش، ئەوەتا ئێستا جۆرێك زیرەکی لەخۆم دا دەبینم کەپێشتر لەخۆمم نەدیوە. جانتاکەم دەکەمەوە. وەك دیاریەکی سەخاوەتمەند لە تەمبەڵی خۆمەوە وەك مرۆڤ بۆ مردن وەك شەریکێکی تازە.

دەمرم.. مەبەستم ئەوەیە من بڕیاری ئەم مردنە دەدەم وەك تۆڵەسەندنەوەیەك لەمەرگی ناکاو. مەسەلەکەش بە گشتی چەند چرکەیەك دەست نیشان دەکات کە هۆشیاری و بوورانەوەی دلۆڤان لێك جیا دەکاتەوە. چاوقوچسانێك، هەناسەیەك، شکستێکی گچکە کە ژیان تا ئەو رادەیە فێڵی لێ کردوویت. یان کەمترە لەوەی هەرکاتێ بتەوێ بۆ خۆت سنوورێك لەخشتە ببەی و رۆحی خۆت لفاو بکەیت تا لەگەڵ یەقینێکی ناکامڵ بەرخورد نەکات. زۆر بیر لەوە ناکەیتەوە کە دوای ئەم ماوە خێرایە چی روودەدا، کە هەموو شتێك بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا ئامادە دەبێ بەحساب، تەنك یان ئەستوور، بیرناکەیتەوە لەوەی کە روودەدا. پێت وایە لەو قەباحەتە رەت بووی کە بە-شێتانە- بەرەو کامڵ بوونی خۆی رایکێشای، مەبەستم مردنە. من کە دەمرم، مەبەستم ئەوەیە شڵەژانێك بخەمە ناو گەمەکە.. هەموو خۆکوشتنێك شڵەژاندنی گەمەکەیە.

بەلاّم بوونم لەم ماڵە شڵەژانێك دەخاتە نێو ئەم ئاخەم کە متمانەی بە بوێری خۆی هەیە لەخۆکوشتن. منیش سەرسەخت و رەقەکارم خەم ناخۆم. بەڵکو خۆم دەدەمە دەست ژان وەك ئەوەی ئەمەم تایبەتمەندیەکی خۆم بێ و وام لێ بکات زۆر هاوسەنگ بم. ناشڵەژێم ناشڵەژێم چونکە زیرەکیەکم تێدایە کە بە خێراییەکەی زیرەکی و قورسایی خەڵکی دی سووکتر دەکات؛ هەروەها لە قورسایی ئەو هەڵوێستانەی کەحیسابیان بۆ ناکەم. ئەم خێرا زیرەکیەم کە شڵەژانم لێ دووردەخاتەوە خۆی هەڵچوونێکی تووڕەیە. بەمەش چەند و چوونەکان یەك لا دەکەمەوە. ئەوەتام، لەناکاو لێرەم. لەم ماڵەدا، پێویستە لەسەرم زانستیانە بیر لەچۆنیەتی لێرە بوونم بکەمەوە. بێ ئەوەی هەڵبچم. چونکە من لەگەڵ کەس لە ڕووبەڕووبوونەوەدا نیم، هیچ هەڵوێستێکیش لەئارادا نیە ئەوە بخوازێ خۆمی لێ دەرباز بکەم وەك کارێکی بوێرانە لەسەر کردەوەیەکی قەڵەبالّغ، بەکورتی من لەماڵێکدام کەپێشتر لێی نەبووم و لەسەرم پێویستە شوێنەکەی دەست نیشان بکەم، سنوورەکەی، مێژوویشی، پێش ئەوەی ئەو حەزە سەرکێشەی خۆکوشتنم جێ بەجێ بکەم، کەئەمەش حەزێکە وای کردوە کەخۆم لێرەدا ببینمەوەو ئەم جانتایە بکەمەوە کە ئەم پەڕە بۆرە زۆر گچکەیە لە بنەکەیدا بەرز بۆوە، ئەو پەڕەی کە بۆتە لەمپەر لەنێوان من و خۆکوشتنم. ئەم پەڕە، ئەم لاربوونەوە رێکەی کە لەگەڵ بنی جانتاکەدا گونجاوە وەك کشانی منە بۆلای دەلاّلی خانوو بەکرێ دان، کە ژنێك ئەم ماڵەی نیشان دام و قسەکانی جۆرە پۆخڵیەکی تێدا بوو.

خۆشم لێ هات. هەرکە ئەم ماڵەم دیت خۆشم لێی هات، بۆیێ پێم وایە بوونی من لێرە بەپلان بووە نەك کت وپڕی، وەك پێشتریش باسم کرد، بەڵگەش ئەوەیە ئەو باخچەیەی پشتەوە باخچەیەکی وەبیر هێنامەوە لە یادم کردبوو. چۆڵەوانیەکەی لای خوارەوەش چۆڵەوانیەکی وەبیر هێنامەوە کە هێشتا هەر لە یادمە وام لێ هاتوە خەیاڵ بکەم کە ئەوتیشکە خۆرەی لە کەلێنی دار لیمۆکەدا لە ژووری نووستنەکەم دەدا. هەرهەمان تیشکی گۆرینە کە لە ساڵانێکی دووردا کە لە ساڵانی ئێرە ئاچن سبەینان بە ئاگایان دێنام. خۆیشم، بەهەرحاڵ لەوانە نیم لە جیاوازی نێوان ساڵانی ئێرەو ئەوێ بگەڕێم چونکە بابایەکم سۆز تەمبەڵ، بەتەمای خۆکوشتنم. لە ئاخمدا جێی شتێك نەماوە جگە لەو پەڕەی کە لە بنە بانی جانتاکەم دا بەرز بۆوە.

نازانم بۆچی ئەم بڕیاری خۆکوشتنەم وامنی کردە ئەو پیاوە خاوو خلیچە-! زۆر هێمن، بێ ئارەزوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا توانیم جلەکانم لەسەر ئەم قەرەوێڵەیە پەرت بکەم. بۆ ئەوەی کەسانێ کە تەرمەکەم هەڵدەگرن بیانبینن.

بێ ئەوەی لێی ورد ببمەوە بۆ ویستم ئەو دوو باڵندە ئاقاریە بەچەترەکەم بپارێزم کە تەفرەیان دام. بەلاّم ئەم پەڕە کە دووبارە لە بنەبانی جانتاکەمدا جێگیر بۆوە هۆشی گوشاردام و بە ئاگای هێنا کە دەبێ بە سووربوونەوە بیر لەچی بکەمەوە.

سەرلەنوێ دەستم بۆ بنی جانتاکە درێژکردەوە، پەنجەم پێدا گێڕا پەڕەکە بدۆزمەوە، بەلاّم لەبەر گچکەیی نەکەوتە بەردەستم، بۆیێ جانتاکەم بردە بەر رووناکی باخچەکەی پشتەوەو بەوردی سەرنجم دا بەهەمولایەکدا هەڵگێڕو وەرگێڕم کرد تا رووناکی بگاتە بنەکەی، دیتم پەڕەکە لەوێیە. بۆرە وەك چۆن دیتبووم. بەدوو پەنجە گرتم ودەرمهێنا، ورد ورد لێم نۆڕی، بەشکستەوە.

هەستم بەجۆرە شکستێك کرد. ئەوە یەکەمین جارە هەست بە شتێکی وا بکەم. ئاخر من سەرسەختم. لە تووڕەیی بەولاوە مەیلێکی دیکەم نیە، بەهێواشی تەماشام لەسەر پەڕەکە لادا بۆسەر دار لیمۆکان، کە لە پشت ژووری نووستنەوە بەرزبوونەتەوە، وەك ئەوەی بزانم ئەگەری شکستەکەم لەوێیە. لەنێوان لقە تێك ئالاّوو گەلاّچڕەکانیدا، لەسەرەتای ئەم بەهارەی کە هێشتا خۆی نەناساندووە جەستەم راچڵەکی. لەنێوان ئەوان و لق و گەلاّیاندا هیچم بەرچاو نەکەوت، بەلاّم شتێکم کەوتە بەرگوێ. یان وام بەخەیاڵدا هات- باڵندەیەك خۆی بەگەلاّکاندا دا. وەك بیەوێ هەڵبنیشێ و پارسەنگی تێك چووبێ، پاشان پەڕێك هەڵوەری، وەك ئەوەی ئێستا لەنێو لەپمدایە وابوو. لە لقێکەوە بۆ لقێکی دی دێتە خوارێ. هەتا لەسەر زەویە تەڕەکەی بن دارەکان گیرسایەوە. کە هێندێ گوڵە (خەزێم)ی کورتە بنەی لێ روابوون لەگەڵ هێندێ گوڵ قەوان هێندێ دەوەنی دڕکاوی کە بەخۆڵەکەوە نووسابوون.

بەکوورە کوور چوومە پێش، تا لەخوارەوەرا بنۆڕمە لقەکان، هیچ باڵندەیەکم نەدی، بەڵام پەڕەکە لەوێ بوو، چەند سەنتیمەترێك لەولای پێڵاوە سپیە بۆیاخ نەکراوەکەم بوو، هەڵمگرتەوەو بەهەمان کوورە کوور گەڕامەوە لای جانتاکەم نەبادا خۆم لە لقە نزمەکانی بدەم، پاشان هەردوو پەڕەکەم بەراورد کردن، لە خۆڕا، دیتم بەقەد یەکتر بوون و هیچ جیاوازیەك لە رەنگیشیاندا نەبوو.

شکستیەکەم زێدە بوو، تەنانەت چاوم پڕ ئاو بوو، بەزۆر لە گریانم راگرتن، چونکە پێشتر من بەگریان رانەهاتبووم، بەڵکو بەوە راهاتبووم دەوروبەرم یان خۆم وردو خاش بکەم، ئەو دەمە چی لێهات؟ داخوا کارەساتێك لە شوێنێك روودەداو ناتوانم لغاوی بکەم..؟ خۆکارەسات لەهەموو جێگایەکدایە، ناچاریش نیم هەموو دەمێك وەبیرخۆمیان بێنمەوە، ئەمە حیکمەتی مانەوەیە، بەڵکو بەچاکیش دابەش کراوە کە جێی رەزامەندیە، بەجۆرێ دڵە لاوازەکان هەر بەلاوازی دەمێننەوە و بەهێزەکانیش هەر بەهێز.

ئەوەتا من بەهێزم.. بەڵام کەمێك شکست خوردەم، کە نابێ یەکێکی وەك من وابێ، کە تەمای خۆکوشتنی هەیە، ئەگەر هەستت بە شکست کرد ئەوە مانای ئەوەیە دڵی خۆت دەدەیتەوە، مانای ئەوەیە کە لەسەر کارێکی پڕ لە هەرای وەك خۆکوشتن نایبووری.. بۆیە بەردەوام دەبێت لەسەر دواخستنی، چاوەڕوانی تا لە هەموو هەستێك بەتاڵ ببێ.. بۆ ئەوەی پەلاماری ئازادیت بدەیت، بەمەش سەربردەکە دەکەوێتە نێو گێژەنێك ئەگەری پڕحسێب و ئەندازە، ئازادیەکەشت هۆ لەوێ، لەنزیك خۆتەوە دەمێنێتەوەو ناوێری پەلاماری بدەیت، چونکە دیلی ئەویت.

منێك.. کە بڕیارم دابوو نەبمە دیلی دەست ئازادیم، بەڵکو خۆم بهاوێمە هەرشوێنێ کە دەبێ لێی بم، ئێستا کەمێك شکست خوردەم، بێ ئەوەی تەماشام لەسەر پەڕەکان هەڵگرم، لەپڕ شێبایەك هەڵیکردو هەورە بۆرەکان بەگورگە لۆقە هاوڕێ سپیەکانی خۆیان رامالی، جانتا چەرمیە بەتاڵەکەم هەڵگرت و هێنامەوە ژوورێ. هەردوو پەڕەکەشم فڕێ دایە بنە بانە ئاوەڵاکە، کە وەك دەمی سیسمار کرابۆوە.

لە گۆنگەری هەراوهۆریایەك کە لە پشت باخچەکەیماڵەوە لەبەر دەرگای حەوشەکەوە دەهات، دەرگای ئاشپەزخانەکەم لە دوای خۆمەوە داخست، لەنێو شکستی خۆم دا ختم بووم، لەناو خۆمدا، تەنانەت لەو کونە سپیەشەوە کە خۆمی تێداوێم لە ناو خۆمدا تا بە خۆیم دەگرێ بەڵام کە جانتاکەم لەو پیادە رۆیەی نێوان ژووری نووستن و دانیشتندا نایە سەر زەوی ئەو دەمە هەراو هۆریاکەی دەرەوەم زیاتر دەبێت، لەو پەنجەرەیە چوومە پێش کە دەنۆڕێتە باخچەکەی پێشەوە، بۆ ئەوەی لەپشت پەردە تەنکەکە بزانم ئەو-چیە، ژن و پیاوێکم بینی لەناو دووساقۆی ئەستووردا نقوم ببوون.. چەند بوخچەیەکی گرێ دراوو تەلیس و هێندێ شت و مەکی دیکەی لەپێست لول دراویان دەگواستەوە بۆ ناو خانوە چۆڵ کراوەکەی سەرووی باخچەکەی پێشەوە.

خانوویەك بوو چەند ساڵ بوو بۆکرێ داندرابوو، سێ بوو-چوار بوو؟ ئاگاداری کرێچیەکانی پێشتری نەبووم، پێم وایە خێزانێك بوون نە نیوەڕۆیان کە دەگەڕامەوەو نە سبەینانیش کە لە ماڵ دەردەچووم دەمدیتن بەڵام زۆر کەڕەت گوێم لەهات و هاواریان دەبوو، چەند ئافرەتێك و یەك پیاو بوون.

هەروەك خۆ تێهەڵقورتاندن سەنەگەم لەسەر ئەو دووە هەڵنەگرت کە تازە دەهاتن، ناشزانم ژن و مێرد بوون یان خوشك و برا، کە دوای مشتومڕێکی بەچپە چپ، پارچە پارچە کەرەستەکانیان گواستەوە واش پێدەچوو ئەو ئۆتۆمبێلەی کە ئەوانی هێنابوو شت و مەکەکانی هەروا ئەڵڵا خوایی فڕێ دابێتە سەر جادە قیرەکەو شۆستە زیخەڵانەکەو رۆیشتبێ.

رۆح سووکم هاتنە بەرچاو، نەخێر جووڵانەوە، لە خۆڕازیبوونیان سەرنجی راکێشام، کە قسەیان دەکرد وەك ئەوە وابوو کە بە باڵەکانیان ئەو مەودایە بپێون کە لەو دیمەنەیان جودا دەکاتەوە کە بەچپە چپ کێشابوویان، ئەدی ئەم دوو ساقۆیە..؟ بۆچی ساقۆیان لەبەردایە؟ بەهار کە هێشتا خۆی ئاشکرا نەکردوەو بەداوی ئەو گوڵە خەزێمەوە بەندە کە تازە پشکووتووە.

ژنەکە کورتە باڵایە، دوو برۆی چڕی هەن، وام سەرنج دا، بەچاوانیش بزۆز دیاربوو، کەمێك ناڕەحەت، یان دوو دڵ، پیاوەش لاواز لەو درێژتربوو، بە لچ شۆڕیو چاوە خێلەکانیەوە رەقەکار دیاربوو.. تەماشای ژنەکەی دەکردو نەدەکرد، رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ چونکە ئەو کەل و پەلانە پێویستیان بە بازووی پیاوێك بوو رایانگوازێ.

پەنجەرەکەم بەجێ هێشت بەرەو ژوور، لەجلەکانم روانی کەلەسەر قەرەوێڵەکە پارچە پارچە لەتەك یەك ریز کرابوون و چاوەڕێی دەستێکیان دەکرد تا پاش خۆکوشتنی من کۆیان بکاتەوە، ئاخر زۆر جاران مردووەکان بیانووی زیندوەکان رەت دەکەنەوە کاتێ کە دەیانەوێ شوێنەواری مردوەکان لەماڵێکدا بزرکەن، بەهەرحاڵ بیانوویەکی نەبیستراوە، ئەوە قسەی خەڵکانێکە کە لە پۆزش خواستن ماندوو بوون بۆ کەسانێك کە پێویستیان بەو پۆزشانە نیە. بەڵام گوێم لەو دەستانەیە کە ئەم جلانەم کۆدەکاتەوە، بەپەنجەی نەرم یا زبرەکانی پێکەوە، لەسەرخۆ قەدیان دەکا نەبادا جەستە زەرد هەڵگەڕاوەکە واگابێ کە کارمەندە تەرم شۆرەکان بردیان بۆ تەرمخانەی شار، یان ئەوانەی کە سوورن لەسەر دوور نەخستنەوەی هەر لەباخچەکەدا دەینێژن.

نازانم بۆ حەزدەکەم لە باخچەکەی پشتەوەم بنێژن..! یان دوومەتر هەورازتر لە زەویە بەیارەکە، ئەگەر ئەمڕۆ لەوێ بوومایە، لە بن ئەو توێژاڵە زیخەڵانەی ئەو دوو باڵندە ئاقاریە لێی هەڵنیشتن، لە خوارێ ڕا هەردوو دەنووکەکانیانم دەبینی کە بەچینەیەکی نەخشە کێشراو بڵندو نەوی دەبوون، دەشمتوانی شوێن پێیەکانیان بژمێرم بەدرێژایی راکشانم لەو تاریکستانەی کە ناوە ناوە بە ڕەگی گوڵە کێویەکە، یان بە ڕەگی(قەلۆغان)کەی گەلا زبرەکانی بەسەرم دا شۆڕبوونەتەوە ختۆکەم دەدا.

بەڵام لەوێ نەنێژراوم، کە لە جلەکانم دەنۆڕم لەسەر قەرەوێڵەکەن وێنەی دووکەسەکەم دێنە بەرچاو کە دەرگای ماڵەکەی تەنیشتمانیان لەدوای خۆیانەوە داخست و گوێم لەتەقەی بوو- ساقۆکانیان زۆر درێژ بوون، هەتا سەر پاژنەی پێیان بوو، یاخەکانیان تا بناگوێیان بەرز بوون، وەك ئەوەی ژنەکە خۆی لەپیاوەکە وەشارێ و پیاوەش لە ژنەکە، ژنەکە سەری خۆی بە داوێکی پان بەستبوو، بێ ئەوەی سەرپۆشێك پرچی داپۆشێ کەبەهەردوو لادا وەك کەزی شۆڕ ببۆوە، پیاوەکەش سەرکۆت، پرچ ئالۆزکاو، وەك چەند رۆژێك لەسەر کورسی پاس نووستبێ- لەوانەشە وابێ، بەڵام قەت دەستی راستی خۆی

لەگیرفانی دەرنەدەهێنا، کەل‌و پەلەکانیشی هەر بەدەستی چەپ ڕاگوازتن، بەلای چەپیش قسەی لەگەڵ ژنەکەی دەکرد، مەودا نادیارەکەشی لەقسەکانیدا هەربەلای چەپ دەپێوا.

زۆرم بیر لێ نەکردنەوە، چونکە پاشان گەڕامەوە سەر مەسەلەکەی خۆم، هاتمەوە سەر قازانجی بلاوکردنەوەی جلەکانم لەسەر قەرەوێڵەکە، هەر ئەوها کۆم کردنەوە، بێ ئەوەی بەدوای وەرامێکدا بگەڕێم، دەبوو کۆیان بکەمەوە ئاخر ئەو درێژ دادڕیەی وام لێ دەکا خۆم بە بیرۆکەی خەڵکانی دیوە هەڵبواسم، کوێرانەیە، ناڕەحەتکەرە، ئەوەی کە من دەیکەم قەت ناخوازێ واناکات کشانم لەناو خەڵکی دیکەدا بەهێزبێت، وەك قەرەبۆیەك بۆ ئەوشتەی کە ژیان ناتوانێ بۆم دابین بکات لە کشانێك لە ئاویا. کە بڕیار دەدەم خۆم ڕەت بکەمەوە، بەخۆکوشتن، بۆچی لەناو جلەکانمدا بوونی خۆم دەسەلمێنم..؟ ئۆی.. جلەکانم فڕێ دانە نێو جانتا هەمیشە کراوەکەم، وەك لەبیر چوونەوەیەکی کراوە، بە قاچیشم بۆ سووچێکیم پاڵ دان‌و دووبارە گەڕامەوە بۆ ئاشپەزخانەکە، دواتریش لە دەرگاکەیەوە بەرەو باخچەکەی پشتەوە چووم، کە هەواکەی ئەختێ شێدارە، ئەو دەمە هەورەکان وەك دوو سەعات لەمەوپێش پاکەمتر تا دەهاتن چڕتر دەبوون، وەك ئەو کاتەی ئاخە تەڕەکەی خۆیان بەسەر هەردوو باڵندە ئاقاریەکە پەرت کرد، ئەوانەی کە وای لەم دووباڵندەیە!

لە بەیارەکەم نۆڕی، کە لە پشت باخچەکەوە ڕاکشاوە، وەك ئەوەی جارێکی دی دەیانبینمەوە، یان تاپۆیان دەبینم، بەلام بێ ئەوەی ئارەزووی چەتر هەڵگرتن بکەم تا لە بارانێکی وەکات بیانپارێزم.

دەفڕن ئەم دوو گەلحۆیە کە لێیان نزیك دەکەومەوە دەفڕن، سەرەتا دەنیشنەوە، پۆپنەکانیان بەرز دەکەنەوە تا بزانن با- ڕوو لەکام لایە وەك ئەوەی بە دەسیسە لەگەڵ ئارەزووی باڵەکان ئاڕاستەیان بکەن لە کشانێکی فەنتازی تر ئینجا دەفڕن. کە هاتمە ئەم وڵاتە پێم وانەبوو ئاوا بە شکستەوە بەرامبەر دوو باڵندە دەوەستم شەش ساڵیش دەبێ بیرم لەوە نەکردۆتەوە بەم تەرزە، یا تەرزێکی دی لەبەردەم چۆڵەوانیەکی پەڕپووتدا بوەستم، کە هاوینان تراکتۆر لە بۆتکەوە دەیکێڵێ و ئەوەی لێی ڕوابێ هەڵیدەکەنێ، بە گوێرەی ئەو تۆوەی پێی وەرکراوە، با- لەباوە:

قەلۆغان و گوڵە خەزێم و زیوان و گیاو دڕك و داڵ، پاقلە کێوی و شەیتانۆکەی بەتاڵی زەمق وشك هەلاتوو.

ئەو چۆڵەوانیەی پشت باخچەکەی دواوە جگە لە شەیتانۆکە هیچ پێناسەیەکی سەقامگیری نەبوو، کە لە هەموو وەرزێکدا دیوارو سەوزایی پێکەوە دادەگرێ، هێندە نامێنێ بخزێتە ناو نوێنییش، بەلام ڕووەکە شەرمنەکەی دەسەلاتی لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دی دەگۆڕا، لە وەرزێکەوە بۆ وەرزێك، جار وابوو گوڵە خەزێم زێتر دەبوو، جاریش وابوو قەلۆغان بەهەرحاڵ ئەم دووە بەختیان زۆرتر بوو. لەوانەشە چەودەر کە نە جۆیەو نە گەنمە- زێتر چۆڵەوانیەکە داپۆشێ. یانیش گولاڵە سوورە و ترشۆکەو سیری کێویلەو هێندێ تێکەڵ و پێکەڵی دی کە دەبێ لەنزیکەوە لێیان بنۆڕی.

چۆڵەوانیەکی پەڕپووت بوو بە بوێری ئازادی خۆی، منیش دەمەوێ ئەندازەیی بێ، سەربەست بێ لە کۆیلایەتیەکەی. کە دەڵێم من مەبەستم منێکی چندراوە لە چاوەڕوانیەکی کوشندەدا. لە پایتەختی ئەم دوورگەیەی کە بە یۆنانی دەدوێن، جگە لە چەند وشەیەك کە مایەی پێکەنینە هیچی دی فێر نەبووم لەم شەش ساڵەدا. من کە پیاوی چاوەڕوانیم، خاوەن ورەیەکی بەهێزم وەك بێ هوودەیی، وە گەرنا چۆن بۆ خۆم‌و هەرکەسێکی دی ڕوون بکەمەوە ئەم تەلانەم بۆچی کڕیون..؟ کێ لە شارێکدا کە بە پایتەخت ناسراوە تەڵە دەکڕێ..؟ کە پڕیەتی لە ساختمانی گەورەو ئۆتۆمبیل و ماتۆڕو پایسکل و سەکۆی ئەسپ سواری و هێزی نەتەوە یەککگرتوەکان کە جنێو وە بازبازۆك بەسەر پەرژینە نەرمەکانیدا بازدەدات. جنێوی ئەوانەی لە مەتەرێزە بەرامبەرەکاندا کە چەند مەترێك لێك دوورن دابەشیان کردوە.

دوورگەیەك کە وەك قاقای پێکەنین دابەش کراوە، منیش هاتووم تەڵەو فاقم بۆ چۆلەکەکانی کڕیوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە زانیم ڕاو مۆڵەتێکی گران بەهای دەوێ، وەك ڕوخسەتی مانەوەی من کە ئەو پیاوانە بۆ دیدەنی "پیاوە گەورە" کە بانگیان کردم. ئەوەتا من دوای وەڕسیەکی لە ڕادە بەدەر تەنانەت لە ڕاو بەهۆی تەڵەو فاقیش خەریکم ئەو دوو باڵندەیە دەپارێزم کەچی هەڵدەفڕن.

بۆ وا بزۆزن ؟ من بەدرێژایی ئەو شەش ساڵانە بزۆز نەبووم، شەش ساڵان جلەکانی خۆم لەناو جانتاکە جێ هێشت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەخۆم نۆڕی، خزامە نێو بێنەو بەردەیەکی زێدە حەکیمانەتر لەو بێدەنگیەی دەورووبەرم. زمانم گەشەی دەکرد، وەك ئەوەی بەو ڕەوانبێژیەی هەمە ئێسك و پروسکی خۆم لە بەردەم کاتدا ڕیسوا بکەم بۆ ئەوەی ئەو نائومێدیە سیحر ئامێزە پاکانە بکەم.

تا دێ گچکە دەبمەوەو قسەش گەورە دەبێ، بە تەنیا زمانە کە لە بێدەنگیدا گەشە دەکات، ساڵەکان گەشە دەکەن، یەقینیش.. باوەشێنێکە بە دەست کۆیلەیەکەوە، لەبەر ئەوەی من وەك دیلێك ئازادم، کەواتە من نائومێدتر دەبم، وەك ئەوەی نائومێدی تەواوکەری دانایی بێت، خۆم دەکەمە سەرپەرشتیاری چاوەڕوانیم، وەك چۆن داوەرێك سەرپەرشتی یارییەك دەکات.

"بۆ فێرە یۆنانی بم"؟ زۆر کەرەتان لەخۆمم پرسی، پێویستیم بە ئاخافتن نیە، چەند وشەیەك نەبێ، ئەویش بۆ ئەوەی سەوزی و میوەی پێ بکڕم. ئاخافتن شتێکی دیکەیە، ئاخافتن ڕسکانی خۆی لە بێدەنگیدا دەبینێ نەك لە قسەکردن و دەربڕین. بەهەر حاڵ.. شتێکی ئەوتۆم نەبوو بەخەڵکی ڕابگەیەنم شتێك نەبوو بگوترێ، ئەوەندە بەسە بەدەست ئاماژە بۆ لای چیا بکەم، تا دراوسێکەت بزانێ ڕۆژت لەناو سنۆبەرەکان بەسەر بردوە، یان بۆلای دەریا، تا بزانن کە لە لۆقنتەیەکدا ماسیت خواردوە، خۆ ئەوانەش کە بە زمانەکەی تۆ داخڤن هەرگیز قسە ناکەن، ئەوان دەنگدانەوەی دەنگەکانی خۆیانن، یەك سەربردە بەیەك شێوە دەگێڕنەوە، تا قسە خۆی هیلاك دەبێ، لەبەر پێك چوونی ڕۆژەکانیان لە سەرنجی ئەو چێژەی کە لە جیاوازی بەهاراتەکان بەری دەدەنەوە. تەنانەت جاری وایە تۆ لە جیاتی ئەوەی گوێیان بۆ هەڵخەی کونی لووتیان بۆ دەکەیتەوەو قسەکانیان هەڵدەمژی.

سەخت بوو فێری زمانێکی دیکە بم، لەکاتێکدا من وردە وردە شۆڕدەبوومەوە نێو بۆشاییەکی داخراوی خودی زمانەکەی خۆم، لە گۆنگەری چاوەڕوانیدا کە تەنیا پێویستیت بە کەسێکە دەست بخاتە سەرشانت و ئاماژەت بۆ بکات کە بەبێ دەنگی دوای کەویت. سەخت بوو

بێدەنگی ئەو نامۆیە بشکێنم کە منەتباری بێدەنگیەکەی خۆی بوو، لەمندا، لە زمانی یۆنانیدا گرێیەکم دەبینی وەك هەر زمانێکی زێدەی دی لە نێوان قسەکەراندا، کە پێویستی بە نەختێك گەڕان هەبوو لە دوای دەروازەیەك بۆ نەودیوی وەحشەتناکی. بەڵام من وەحشەتگەر نەبووم. بەڵکو پێویستیم بە نەهێشتنی خودی هۆگری بوو، بۆ نەهێشتنی هەر شتێك هۆگرم بکات. ئەمەش تایبەتمەندێتیە کە لە گوێ گرتن لە قسەی ڕۆژانە فێری بووم. کە ویزە بەویزە دووبارە بوو، لە ویزەکانی ورد دەبوومەوە، جا ئەگەر وا نەبوایە، چۆن تا ئێستا خۆ نەکوشتنی خۆم ڕاڤە بکەم؟

بەڵام ئەمڕۆ خۆم دەکوژم، خۆم دەکوژم.. ئەم دوو باڵندە گێلە سەرسام و شێتگیریان کردم، ئەوە دەبوو هەر بفڕن..؟ ئەدی من بەشێك نەبووم لە جوڵانەوەی زەویە بەیارەکەی پشت باخچەکە؟ من با-ی زەویە بەیارەکەی پشت باخچەکەم، بەچاو کراوەیی و نووقاوی لە نامێزی دەگرم، پێش شەپۆلی ئەو با-یە دەکەوم کە هێشتا لە بۆسەگای ماڵە ئاوەڵاکەمەوە نەگەیشتۆتە دوا گەڵا کە وا پێدەچێ زەرد هەڵگەڕابێ لەنزیك دیواری سەکۆی "ئەسپ سواری"یەکە. پێشتر گرەوم لەسەر خۆم نەکردوە، لەسەر با-ش نایکەم، بەڵام ئەو جووڵانەوەیەی کە گیا دڕکاویەکەی پێ لار دەبێتەوەو ئەوەی کە جەستەم بۆلای ئەم دووباڵندە گێلە دەباتە پێش، هەردوو خواستی یەك با-ن، ئاخر بۆ هەڵفڕین؟ لەوانەیە ئەم دوو باڵندەیە وایان بەچاك زانیبێ لە شوێنەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بپەڕنەوە کە لە نێوان هەردوو بەشی دوورگەکەن. لەوانەیە ئەم دووباڵندەیە ڕاسپێردرابن فرت و فێڵێك ئەنجام بدەن تا با- بکەن بەیەك، بەڵام ئەوان وەك ئۆتۆمبیلە سپیەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بزۆز بوون، ئەوانەی کە وێنەی تابووتێکی خڕوشینی لەشێوەی گۆی زەویان لەسەرەو لەگەڵ هات و چۆکەراندا بەرخورد دەکەن، لەگەڵ باخچە، دیوارەکان، چۆلەکەکان، شۆستەکان و ئەو ڕۆحە شەیدایانەی کە نابیندرێن.

ئەو ئۆتۆمبیلانە هەمیشە خێرا بوون لەو دوورگەیەی کە پەنا بۆ شەڕ نابات، پیاوە زۆر سپیەکان، هەندێکیش لە ڕەشەکان ئەوانەی کە شێوەی ئاخافتنیان وەك شەپقە شینەکانیان تەفرەدەر بوون، ئەوانە وەکو لەشکرێکی خوێن شین لە شەقامەکانی شارو لە بارەکانیا هەڵس و کەوتیان دەکرد، خەڵکەکەش بە ڕێزو ستایشەوە وەریاندەگرتن، بە ناوی پاکیزەی ئەو دیو دەریاکان.

ئەوانە مۆڵگەکانیان وەك پێستەکانیان کە کوللە بەژێریدا دەڕوا خۆشگوزەران بوون. کەچی سەربازە تورکەکان و سەربازە یۆنانیەکان مەتەرێزە هەژارەکانیان لەو ساکە گۆڕەبوو، لە ناوەڕاستی گوڵە شەوبۆکاندا، تۆزاوی وەك بای جەزیرە. جوێنی قورس تێك دەگرن تا سامناکی شەوی پێ بڕەوێننەوە، بەڵێ مەتەرێزەکان سنووری جەستەی دەکێشان و هاواریش یەکی دەخستن.

چاڵێك لە پشت باخچەکەم هەبوو، لە دامێنی خوارەوەی ئەو چۆڵەوانیەی کە چاودێریم دەکرد- چاڵێکی کەمێك تەفرەدەر بوو، تاك و تەرا سەرباز ڕۆژانی یەکشەممە دەهاتن لێیان دەنۆڕی، ئەو چۆلەکانەی کە لە دەوری فاقەکانم بوون بە هەڵەداوان ڕایاندەکرد، کارەکەش هێندە لێ وردبوونەوەی نەدەویست بۆ ئەوەی بزانم چیان دەوێ: دەیانویست بزانن ئەو چاڵە چەند بە کەڵك دێ، جار دوای جار، دەهاتن، بزانن بە کەڵکی ئەوە دێ تۆپی "هاوەن"ی گچکەی لێ دابمەزرێنن، کەمێك دایاندەنا، پاشان بە دەست یا بە دار ئاماژەیەکیان بۆ ئەم لاو ئەولا دەکردو سەر لە نوێ دەیانگوازتەوە بۆ سەر "جێب"ە سەربازیەکەو لێیان دەدا دەڕۆیشتن، بەڵام چاڵەکە هەروەك چاڵ دەمایەوە، لە ڕۆژەکانی دیکەی هەفتەش دا منداڵە وردەکە دەچوونە ناوی و لە سەر زگ لێی دەهاتنە دەر، دوای ئەوەی پڕیان دەکرد لە هەراو هۆریا.

من بەم چاڵە نادیارەی ئەولای باخچەکەی پشتەوەم ناڕەحەت دەبووم، دەتگوت بانگێشەیەکی ئاشکرایە بۆ ناڕەحەت کردنی فاقەکانم لە پێشدا، دواتریش هەڵکوتانە سەرێکی بێ مانا بوو بۆ سەر ئەو بێدەنگیەی کە پێویستە دەوری گۆڕەکەم بدات- کە هیوا خوازم لەوێ بێت.

پێم خۆشە لە زەویە بەیارەکە بنێژرێم، دوو مەتر لەو لای باخچەکەی پشتەوە، لە ژێر ئەو توێکڵە زیخەڵانەی کە باڵندەی گچکە گچکە لێی دەنیشنەوە، هی خێراو لەسەرخۆ، پیرو کەم، سەرکێش و وریا، لە کۆترو کلك تەقێنەو سۆفیلکەو جوڕە، پێم خۆشە ئەو تاریکایی توێکڵەی زەوی بۆ من بێ، سەرەوەشی هی فاقەکان:

من لە ژێرەوە، ئاسنە ساردە دەم کراوەکانیش بە هەموو شەهوەتێکی ئاسنینەوە لە سەرەوە بن.

چوار فاقم کڕین، دوای ئەوەی هیچ چەکێکی دیکەم دەست نەکەوت، پێم گوترا: "پیاوە گەورەکە" هەموو شتێکت بۆ دابین دەکات، تەنانەت تفەنگێکی ڕاویش، بەڵام من فاقی بێ دەنگم بە باشتر زانی چونکە ماڵەکانی دەوروبەری چۆڵەوانیەکە هەراسان ناکات، ئەو چۆڵەوانیەی کە لە لای ڕۆژاوا جگە لە "سەکۆی ئەسپ سواری"یە ئاوەڵاکە شتێکی دیکەی لێ نیە، کە تەلبەندێکی کۆن کونی لە چوار دەورە.

لە بن ئەو تفرە زەویە زیخەڵانە حەکیمانەتر دەبم، تەنانەت ئەگەر بە فاقەکانم هیچیش نەگرم، بە هەر حاڵ من هیچ ناگرم، پێم وا بوو ئەو چۆلەکانە بە دەنووکەکانیان کرم و مێروولەو تۆو زیخ و بەردی وردی سەر جادە قیرەکە پێکڕا هەڵدەلووشن؛ سیکڵدانۆچکەکانیان بە گەرمی پاڵیان پێوە دەنێ. بۆیە لە فێڵەکەم دڵنیابووم و فاقەکانم دانانەوە، بەڵام کوورِ بوومەوە، بەڵێ کوورِ بوومەوە.. گوێم لە جومگەکانم بوو دادەکەلان، لەسەریەك دەترازان، تەقە تەقیان دەهات، بەڵام ئێسکەکانم بە ئاستەم هەناسەیان دەدا، دەمارەکانی دەورو بەری خۆیان ئانومێدانە پاڵ دەدا تا لە دەرەوەی گۆشت هەوا هەڵمژن، ئەو گاڵتە جاڕیەی چۆلەکەکان تەحەمول نەدەکرا.

ماوەیەکی زۆر فاقەکانم شاردنەوە، بەو هەموو شارەزاییەی ئەو شوێنەی کە لێیەوە هاتبووم بۆ ئەم دوورگەیەی لەسەر خۆڵێکی شلدا مەلە دەکات کەپێی دەگوترێ ئاو، کەلەبەرێکم جێ نەهێشت ئاسنی فاقەکانی لێوە دیاربێ، پاشانیش گیام بەدەست ورد کردو پێم وەرکرد، بۆ ئەوەی وەك زەوی دیاربێ. بیرم لەوە کردەوە کە بۆنی شوێنەکەم بسڕمەوە تا پاکیزە بێ وا بێتە بەرچاو کە نامۆیەکی وەك من پێی لێ دانەناوە. بەڵام پێکەنیم: "ئاخرچۆلەکە لە ژێر تووکەکانیاندا تووتکە سەگ خۆیان حەشارداوە" وای لەو گاڵتەیە، ڕۆژانە هەنگاوی زۆر بەسەر ئەم شوێنەدا ڕەت دەبن چۆلەکەکانیش گوێ نادەنە بۆنەکەی وهەڵدەنیشن، بۆ بە تەنیا من بۆنەکەم بیانڕەوێنێتەوە..؟ لەوانەیە خودی بیرۆکەکە بۆنی هەبێ، شایەد فاقەکان بۆنیان لێ بێ. یان ئەم ئارەزووەی داوێنی گرتووم، وەك ئەوەی بۆنێکی لێ بێ.

کوورِ بوومەوە، گوێم لێ بوو "شانە"کانی جەستەم وێك دەهاتنەوە کە دەمبینی چۆلەکەکان



له فاقه‌كانم نزیك ده‌بنه‌وه و دواتر ده‌ورو خولی ده‌ده‌ن، به بێزه‌وه ته‌ماشای ده‌كه‌ن، به‌ڵام خۆ من پێشبینی راوم نه‌ده‌كرد، به‌هه‌رحاڵ وێڕای تفتی ئه‌م هه‌ستەم كه‌پێبه‌ندی دۆڕانێكی ئاشكراو پێشوه‌خت بوو، به‌ڕاستی ئه‌ز له‌وێ له گۆڕه‌كه‌ی خۆم ورد ده‌بوومه‌وه، نه‌ك له پێی چۆله‌كه‌كان و به‌و تاریكیه‌ی كه له ناو ئه‌ندامی له‌شمدا كۆبۆته‌وه هه‌ست به‌تاریكایی ژێر تفره زیخه‌ڵانه‌كه‌ی ئه‌و چۆڵه‌وانیه ده‌كه‌م، له‌وێ، له‌خودی یه‌قینی خۆم پتر فراوان ده‌بم، هه‌موو ئه‌وشتانه‌ش كه به‌سه‌ر ئه‌م تفره هه‌ڵپڕوكاوه‌وه‌ن بۆنی منیان لێ دێ. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ڵمی خووی وه‌حشه‌تناكم سه‌رده‌خه‌م بۆ سه‌ره‌وه، دوای ئه‌وه‌ی نامه‌ی بارستایی ده‌ده‌مه بارستایی‌و"شانه"تواوه‌كانی خۆم شۆڕده‌كه‌مه‌وه بۆ خواره‌وه.

هۆ له‌وێیه گۆڕه‌كه‌م، گوڵه بابۆنج وسه‌رخه‌س وگیای شه‌رمنۆكه‌ی شه‌كه‌ت به‌هۆی ناڕه‌سه‌نی زه‌ویه زیخه‌ڵانه‌كه، به‌ڵام ده‌وروبه‌ری من شێداره به‌هۆی ئه‌و نه‌رمه بارانه‌ی پێناسه‌یه‌كی زبری بۆ ئه‌و به‌هاره كرد كه یاده‌وه‌ری له ده‌ست داوه. ده‌سته‌كانم شێدارن، چه‌تره‌كه‌م هه‌ڵگرت تا ئه‌و دوو باڵنده‌یه بپارێزم كه‌چی هه‌ڵفڕین، پاشان هاتمه‌وه ژووره‌وه تا به‌و بزماره‌ی هه‌ڵبواسم كه له دیواری ئاشپه‌زخانه‌كه‌یه. دوای ئه‌وه دووباره چوومه ده‌ره‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی له‌به‌ر خوردی ئه‌و باڵنده‌یه وێ بكه‌وم كه جگه له په‌ڕێك هیچی دیكه‌م نه‌دیت. بۆیێ ده‌سته‌كانم ته‌ڕن، خۆشم ته‌ڕم له به‌ر ئه‌و گه‌لحۆییه‌ی تێم دایه بۆ به دواچوونی كاروبارێك كه كۆتاییان نایێ، له‌و ڕۆژه‌وه كه بڕیارم دا خۆم بكوژم، له‌و سبه‌ینه‌وه تا ئه‌م ده‌می عه‌سره كه خه‌ریكه به‌په‌له تاریك دادێ، ده‌ڵێن كاتیش له‌لای خۆیه‌وه له بیرۆكه‌ی به‌هار راده‌كات.

گۆڕه‌كه‌م له‌وێیه، به‌ڵام -من- له سه‌رمه له‌گه‌ڵ رۆژاوای به‌كرێ گیراوی ناوه‌خت هاتوو بچمه‌وه ژووره‌وه، چونكه به ته‌مام رتووشی زیاتری خۆكوشتنه‌كه‌م بكه‌م تا جوانتربێ و دڵنه‌وایی به خۆتێهه‌ڵقورتاندنه‌كه‌م بدات وه‌ك میوانێك له ته‌رمێك نزیك ده‌بێته‌وه كه ته‌رمی خۆیه‌تی بۆ ئه‌وه‌ی له‌وپه‌ڕی كه‌ماڵدا ببیبنێ! ئارام، نه‌رمۆكه، له‌وانه‌یه ده‌م به خه‌نده له بارو دۆخێكدا بێ ره‌قه‌كاری، سه‌ره‌كه پاڵی به شانی‌دا دابێ، قاچه‌كانی درێژكرابن، پرچی شانه كرابێ و چه‌ند داوێكی به‌سه‌ر پێشانه‌یدا شۆڕ بووبێته‌وه، چاوه‌كان نیوه نووقاوبن وته‌ماشای كاغه‌زه سپیه مۆركراوه‌كه ده‌كه‌ن كه له‌سه‌ر قوماشه شینه خاوێنه‌كه، كه چه‌ند وشه‌یه‌كی پرسه ئامێزی له مردوێكه‌وه بۆ زیندووه‌كان تێدایه: "ناڕه‌حه‌ت مه‌بن.. چاره‌نووس سه‌رگه‌ردانه ". نا.. به‌ته‌مای ئه‌وه‌نیم كارێكی ئه‌وتۆ بكه‌م خۆكوشتنه‌كه‌م جوانتر بكات، به‌ڵكو وه‌ك خۆی چۆنه وای ده‌خه‌مه روو، توندكار به‌و هه‌وه‌سته‌ی كه تێیدایه به‌ره‌و كامڵ بوونێكی لاڵ كه دووبست له‌ولای جه‌سته‌وه دێ، یان ئه‌و كامڵ بوونه‌ی كه له جه‌سته‌دا واگادێ دوای ئه‌وه‌ی گه‌ڕه‌لاوژه‌ی خوێن ئارام ده‌بێ. خوێنه‌كه‌م له قوژبنێكی ماڵه‌كه‌دا په‌رت ده‌كه‌م، جله‌كانیشم له‌یاد ناكه‌م كه‌له ناو جانتاكه نووستوون، پارچه پارچه له خوێنیان هه‌ڵده‌كێشم، بۆ ئه‌وه‌ی میراته‌كه‌م قورس بێ و شووشتنێكی به‌هێزی بوێ، یان له‌ناوبردن، چۆڕاوگه‌ی خوێنه‌كه‌م له ژووری خه‌وتنه‌وه ده‌به‌مه ئاشپه‌زخانه‌كه، ژووری دانیشتن، راره‌وه‌كه‌ی ماڵ، لای پنجه گیا كه‌مه‌كان، دیواره‌كانیش له‌بیرناكه‌م، به‌ده‌ستم چه‌ند پروشكێكیان پێدا ده‌كه‌م هه‌ر جاره‌ی كه گۆلم پڕبوو، دوایش به ده‌م پف له‌و پۆقژانه ده‌كه‌م بۆ ئه‌وه‌ی به‌شێوه‌یه‌كی ناڕێك په‌رت بن، كاتی خۆشی وامان له مه‌ره‌كه‌ب ده‌كرد كه دڵۆپێكی ده‌كه‌وته سه‌ر ده‌فته‌ر، پفمان لێ ده‌كرد، به‌ده‌م وێنه‌ی"شانه"مان لێ ده‌چنی، وێنه‌ی جاڵجاڵۆكه‌و هه‌زارپێ ".

ئه‌گه‌ر مه‌ره‌كه‌ب بڕژابا سه‌ر ده‌فته‌ره‌كانی قوتابخانه‌م، نه‌مده‌هێشت وشك بێته‌وه، پفم له دڵۆپه شینه‌كه ده‌كرد، ئه‌ویش ناخی خۆی به‌و هه‌موو شێوازه نه‌خشینه‌وه ته‌سلیم ده‌كردم، پێم راده‌بوارد ئه‌ویش پێی راده‌بواردم، من به‌هێواشی پفم له‌و ده‌كرد، ئه‌ویش به ئارامی پفی له‌من ده‌كرد ئه‌گه‌ر به‌توندیش پفم لێ كردبا ئه‌ویش به‌توندی پفی لێ ده‌كردمه‌وه، من شێوه‌م لێ دروست ده‌كرد، ئه‌ویش به‌شێوه‌كانی خافڵگیری ده‌كردم. به‌ڵام جیاوازیه ناڕه‌حه‌تكه‌ره‌كه له‌وه‌دا بوو كه‌هیچ پف كردنێكی من نه‌بوو له‌وی دیكه ئایری بێ، "به هێزه‌كان به‌هێزو هێواشه‌كان هێواش" كه‌چی ئه‌و شێوازانه‌ی دڵۆپه مه‌ره‌كه‌به‌كان به‌خۆیانه‌وه ده‌گرت، دوای پف لێ كردنیان، هه‌رگیز پێك نه‌ده‌چوون.

كه‌واته خوێنی خۆم ره‌ها ده‌كه‌م، له‌وه‌ی كه ته‌نیا ببێته چه‌ند داوه چۆڕاوگه‌یه‌ك به‌سه‌ر دیواره‌كاندا، یان ته‌نیا گۆمێكی گچكه‌ی ئه‌م قوژبن وئه‌و قوژبن. پفی لێ ده‌كه‌م له كاتێكدا ده‌خلیسكێمه نێو ئه‌و بوورانه‌وه‌ی كه چاوساخیم بۆ ده‌كات به‌ره‌و قه‌باحه‌تێكی به زه‌وق تر، به‌ڵام پێش ئه‌وه‌ی ئه‌م كاره ئه‌نجام بده‌م له‌و گه‌ڕه‌لاوژه‌یه ده‌نۆڕم كه ئیدی له ده‌وروبه‌ری ماڵه كپه‌كه‌م ناوه‌شێته‌وه. به تایبه‌تیش لای سه‌ره‌وه‌ی، كه ئه‌و ماڵه‌ی لێیه كه هه‌ردوو كرێچیه‌كه لێی دابه‌زیون وله ناو ساقۆكانیاندا ختم بوون. به تووڕه‌ییه‌كی كپه‌وه به‌ره‌و په‌نجه‌ره گه‌وره‌كه چووم كه په‌رده ته‌نكه‌كه‌ی پێوه‌یه‌و ره‌ونه‌قێك به باخچه‌كه‌ی پێشه‌وه ده‌به‌خشێ، هه‌روا به جاده‌كه‌و دار ته‌ڵی كاره‌باكه‌ی كه رووناكیه‌كی نارنجی پێكه‌نین ئامێزی به سه‌ره‌وه‌یه، تاقمێكی سه‌یری پیاوو ئاژه‌ڵم پێكه‌وه بینی له به‌رده‌م ساكه گۆڕه‌كه‌ی ئه‌و ماڵه راوه‌ستاون كه ماوه‌یه‌ك له‌مه‌وبه‌ر ئه‌م دوو كرێچیه‌ی لێ دابه‌زیبوون په‌رده‌كه‌م لادا تا باشتر بیانبینم، دواتر لاپه‌نجه‌ره‌یه‌كیشم كرده‌وه، كزه بایه‌ك هه‌ڵیكرد بۆنی خۆڵ و گوڵی لێ ده‌هات، بۆنی چپه‌ی ئه‌و جووڵه‌یه‌ی لێده‌هات كه له جه‌سته‌ی پیاوه‌كانه‌وه به‌دی ده‌كرا، نه‌ك ده‌میان.

# خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی الاقر ابازین

ناوی كتێب: الاقر ابازین

نووسەر: سەلیم بەرەكات

ساڵی چاپكردن: 1999 ستۆكهۆڵم

هاوكات لەگەڵ دەقە شیعرییەكانی سەلیم بەرەكات دەیان وتاری شیعر نامێزی لەگۆڤار و رۆژنامەكاندا بڵاوكردۆتەوە. وتارەكانی پەراوێزن بۆ تێگەیشتن لەدنیای شیعری سەلیم، واتە ئەوەی لەشیعرەكانیدا فریای وتنیان ناكەوێ، یا بەپێویستی نازانی بیڵێ، بەوتاری پڕواتا دەریان دەبڕێ.

"الاقرابازین" كۆمەڵە وتارێكە لەزانستی بینین و ئەمساڵ دوای گەیشتنی شاعیر بۆ سوید ونیشتەجێ بوونی لەستۆكهۆڵم لەلایەن خانووی A pec چاپ كراوە . "الاخرابازین" بەوتەیەكی بەناوی "پاشماوەی دەسپێك" دەست پێدەكاو دەڵێ: خاسینەكانی ئەم جۆرە نووسینە بریتییە لەپابەندبوونی كوێرانە بەوەی كەپێناسە ناكرێ".

كتێبەكە بەسەر چوار تەوەردا بەشكراوە بەناوی" یاخی بوونی مەنتیق، مەترسییەكانی دۆزینەوەی ماقوول، زانستەكانیهەوایەك كەلەژێر لێكۆڵینەوەدایە "، هەرتەوەرەو چەند وتارێكەو هەموویان 23 وتارن. بۆنەوەی خوێنەر ئاشنای هەندێ بیروبۆچوونی كوردانەی سەلیم بەرەكات بێ، ئەم وتارەمان هەڵبژارد كەبرای چیرۆكنووس یوسف عیزەدین وەری گێڕاوە. گەلێك لەكێڵكەكانی گوللەباران كردندا ئەمجارەیان مریشكەكانیان، و مەڕەكانیان،وخاڵە كوردییەكانیان لەگەڵ خۆیان دا دەبەنە ئەوروپا. رەچەڵەكە خۆشگوزەرانەكان یەكیان ئەوی دیكە بەدوای خۆیدا دێنێ و لەزستانی جیهاندا دوای سێڵاوی مرۆیانە دەكەون. دواتر چی؟ تەنها پەرتەوازەییەكی رەچەڵەكەكانی خۆرهەڵاتە، كەزەبرو زەنگی سوپاكان و گوشاری نەداری، خستونیەتیە ئەو دیمەنەوە، كەدەبێت بەپاكژی بهێڵرێتەوە. لەقومەوە تا كۆشكی سپی، كەس لەوە دەربازی نابێت، و بەشەریكی غەدر دەدرێنە قەڵەم. بەڵێنیان بەكورد دا كەبرای دینیان بێت، بەڵام لەزماندا سوكایەتیان پێكرد. بەڵێنیان پێداكەلەبەردەم یاساداو پاش لەناوبردنی زەبروزەنگ سەری بخەن، بەڵام لەئابڵووقەیەكی نادیاردا هێشتیانەوە . بەڵێنیان بەدادپەروەرییەك دا، كەبیكاتە هاوكارێكی چارەنووسی ون بووی، دواتریش چەكیان دایە راودو نەرەكانی. روخاندنی رژێمی عێراق لەخەیاڵی داكۆكی كەرەكان لەكوێت نەبووەو ناشبێت. ئەوان هاتن تاعێراق بگەڕێننەوە بۆ نێو نەشكەوت و خۆیان لەبەردەم دەروازەكەیدا بمێننەوە. تا خۆشگوزەران بن بەدادۆشینی كیشوەری نەوت و لەچاككردنەوەی كەشتی هەڵگرەكانیان و پارێزگاری لەجەستەی سەربازی خۆرئاوایدا سەرفی بكەن. ئەو كوردەی كەهەلهەلەی بۆ ئەو بەناوسەركەوتنە لێدا، شاباش كرا.. هەروەك عێراقییەكانی تریش شاباش كران: كوردیان گەڕاندەوە بۆ پاشەگەردانی یەكدی سەربڕین لەبۆشایداو عێراقییەكانی تریشیان گەڕاندەوە بۆ سەددام. هیواكانیان پتەوكردن بەئابڵوقەیەكی تان و پۆكراو لەبرسێتی و پەردەیەكی تەنكیش لەشوێن جێگە لەت لەت كراوەكەدا دادرایەوە. گۆڕەپانی كورد وەك راستیەكەیەتی: زەوی نۆڵای هەیەو لەلایەكیەوە فریاگوزاری كیانەكەی پێدەگات و ئەوەتا گەیشتیش، بەراستی، فریاگوزاری كۆشتنە. ئێرانی تایفەگەری بەپێی دەستووری خودا، برایەتی بزووتنەوەی نەتەوەیەكی دراوسێی ناكات، كەدەماری گیانیان رەچەڵەكێكی لە ئێران دایە. بەدەستوری خۆی هەڕەشە لەهەموو سەرپێچی كارێك دەكات .

لەئیسلام بوونیشیدا، ئەوەندەی مەبەستە كەئیسلام بكاتە داردەستێك بۆ پارچە پارچەكردنی ئەوانەی كەهەر لەباوانیانەوە لەپشتەوە پێكراون. چەكێكی زۆر بۆ وێرانكاری دەنێرێت، پاشان دەڕواننە باڵای مەرگ.

توركیاش دێتە دیمەنەكەوە، لەدەروازەی "پڕكردنەوەی " ئەو بۆشاییەی كەخۆرئاوا وەك پێخەفی ژن و مێردایەتی بۆی سازكردووە، خۆرئاوایەك كە تەرازووی عەتاری بەدەستەوە گرتووەو . شاڵاو لەدوای شاڵاو شوێنەكە پەلامارەدا پاشاگەردانیەكی بەدوادا دێنێ كە لەداهێنانەكانی كیانە ئاڵۆزەكەیەتی :

بۆتەیەكی خۆرئاوایی رۆنی ئیسلامی تێدایە، چێشت لێنەرێك دەیباتە چێشتخانە پەردە داراوەكەی كەقاپ و قاچاخی تەڵخن . توركیاش بەنمایش كردنی گیانی كورد وەك كێڵگەیەك بۆ گوللەباران كردن، داوای خەڵاتی شیاو لەخۆرئاوا دەكات بۆ ئەو رۆڵە پۆلیسییەی كە لەبەردەم دیواری خۆرهەڵاتدا دەیبینێت.رۆڵ بینینی وەك پۆلیسێك كە جڵەوی ئەو كاروبارانەی بەدەستە كەخۆرئاوا پشت گوێ ی خستوون ولەئەنجامی تێكەڵە و پێكەڵەی سیاسەتەكانی لە كوردستاندا، كە باڵادەستی یەك یاسایتێدا نابینرێ.

توركیا درك بەو پارێزگارییە مەبەستدارە، پلان بۆ دارێژراوەی خۆرئاوا دەكات، بەبەهرە داركردنی كورد بەئیدارەیەكی خۆیی، پاش نەمان و خاڵی بوونی كوردستان لەسەددام، كەخەڵاتێكی نائاشكرایە، ئەویش بەنازكردنەوە سیفەتی شكست بەخەڵاتەكە دەبەخشێت: جێماوێك لەپاشا گەردانی، توركیا دەیگرێتە خۆی، ئەمەیە كەبەئاشكرا دەیڵێیت و لە كاروبارە دیارەكانیدا وەدەری دەخات.

خەڵاتەكە تەموومژاوییە لەووریاییەكی ئاشكرادا. سەرباری ئەوەی كەخۆرئاوا هیچ پشگیرییەكی ئەزموونی كوردان ناكات، بەپێداویستی ئابووری و ئیداری و راوێژو پلانی ماقووڵ. چەكی ئەڵمانی، وەك كۆڵەكەیەكی تەرسانەی توركیایهاوپەیمانی لەناتۆدا دەمێنێتەوە، سەرباری چاوپۆشینی ئەمریكا لە پێشێل كردنی مافی مرۆڤ و پەلوپۆ دەبەنگەكانی لەباوەشی كچە بەنازەكەیداو پاڵ پێوەنانی بۆ هاوپەیمانێتی كردنێكی پتەو و دروستكراو لەگەڵ ئیسرائیلدا، بۆ سەلماندنی ناسنامەی پێكدادراوەكەی لەرۆژهەڵاتی تاریك دا.

ئەگەر فیكر سەلمێنراوی زیاتر بدۆزیتەوە ئەوا توركیا لەقایل نەبوونی ئەوروپا بۆچوونە نێو یەكێتییەكەی، خۆراكێكی پاك دەدۆزێتەوە... تا جەستەی رژێمەكەی پێڕاست بكاتەوەو لاری یەكەی نەمێنێ، هەرچەندی بەرەو گۆشەیەكی تەریك پاڵی پێوە بنێن، لەرێچكەی وتووێژەكانی بوون بەئەندامیدا، توركیا سكاڵای زوڵم لێكراو بەرز دەكاتەوەو ژەنەراڵەكان و شەقامە تەعمیم كراوەكان پشگیری دەكەن، بەردەوامیش دەبێت لەتۆڵەسەندنەوە لەگەلێك كەدەیەوێت بەزمانی خۆی بدوێت، كە دیارە ئەمەش لەپێداویستییەكانی هەڵگرتنی ناسنامەی ئەوروپی بوونە، لەژێر سایەی یاسادا.

"گرتنە خۆ" گوتراوێكی ئاگادار كەرەوەیە لەلایەن رەبەنی سزادانەوە بۆ رەوتی جیهان، چارەسەرێك كە لەمیانی پسپۆڕی ئەودایە، كاتێك كارەكە

پەیوەست دەبێت، بەناسنامەی مرۆڤێکی حەق خوراو. زوڵم زۆر وەخۆناگیرێت، ڕەخنە لەزوڵم دەگیرێت وەك ڕەخنەگرتن لەلادانی گلەیی لەویژدانی کەسێکی گلەیی کەردا، بەڵام وەخۆناگیرێت.

یەکێتی ئەوروپا دەتوانێت تورکیا لەگرفتە قەدەریەکەی ڕزگاربکات، بەگرتنەخۆی لەیەکێتیە کەیدا ، وجەستەی خۆشەبکات، بەمەسڵی چاودێری کردنێکی توند لەستاڤەکانی دا، بۆری و موولوولە خوێنەکانیشی لەگەڵ داواکارییەکانی هاوکاری و هاوبەشیان لەپەیماننامە سەپێندراوەکەدا رادێ، بەڵام فێڵی ئەو دواخستنی ڕزگارکردنەی، دەکەوێتە ئەستۆی مێژووی یۆنانی نا تەبا لەگەڵ بیرۆکەی لەدەست دانی قۆستەنتینەی ون بوودا، کەدیارە ماندوو بەگرێ چنین وبەهانەهێنانەوە.

لەراگەیاندنێکی بەبەرستکەردا، هیلمۆت کۆڵ دان بەنیوەی ڕاستیەکەدا دەنێت: "تورکیا موسڵمانە"... "ڤان دربرۆك"ی راوێژکاری مفەوەزیەی ئەوروپا، کۆششێکی نەخلاقی دەکات، لەراستکردنەوەی ئاراستەی واتاکە:

"یانزەملیۆن موسڵمان لەئەوروپادا هەیە".

نیوەی دیکەی ڕاستیەکە دابەشکراوە بەسەر خۆیدا لەلایەنگیری کردنی "کۆڵ"یان "ڤان برۆك". خۆری کورد، لەم تاریکستانە ئەتك کراوەدا، هەڵدێت ... بەهەڵگیراوی وەك دروێنەی پووش ... بەسەر سەری کچانی یەئس و دایکانیانەوە .. ئەوانەی کەرەتێنراوی بەپیت و بەرەکەتیان لێدەکەوێتەوە .. لەمیانی ململانێی مانەوەی چاکتردا، لەسەر زەوییەکی وێرانکراو بەبۆشاییەکی تێك شکێنەردا.

لەم ئیفلیج بوونەنەخلاقییەدا هەمووان یەکسانن و کەس لەسەر ڕاست نیەو ناتوانێت پینەو پەڕۆی شتێك لەڕاستی بکات. بەڵام نیوەی لۆمەکردنەکە دەکەوێتە ئەستۆی حزبە شەڕکەرەکانی کوردستان، ئەوە ڕاستییەو ڕاستییەکی ماندوو و بێ هیواکەرە. ئەی چی چاوەڕوان دەکرا لە کوردێك کەڕێگەی ئامادەبوون و هاوبەشی پێنەدراوە؟

بەچ ئازایەتی یەکەوە داوا لەرەتێنراوێکی وەك ئەو دەکرێت، تابێتە نمونەیەکی پاکژوباڵا لەڕێخستنەوەی دروستی بارو هەوای کوردستانی لەت لەت کراودا؟" ئەزموونی کوردان؟ لەخاکێکی بەردەڵاندا کە دروێنەی تێدا ناکرێت، بەلاوازی ڕوا...

ڕێگە بەکورد نەدرا تا بتوانێت لەپانتاییەك، لەدڵنیایی پێویستدا نیشتەجێ بێت ، تا بتوانێت دەسەڵاتی خۆقایم کردنی لەباری ڕێکخستن و پەیوەندییەکانیەوە تاقی بکاتەوە.



خەیاڵ پلاوێك لەوەدەرکەوتنی خێرای هیوای ڕوخانی سەدام، زیندانی بێ دەرگای دروست کرد.. بەپشت بەستنی بەبەڵێنی خۆرئاوا بەپارێزگاری کردنی؛ کەدیارە دواتر کەلێنی تێ دەکەوێت و گاردی کۆماری خوێنڕێژ دەگەڕێتەوە بۆ "خاکی ئازاد" "پارێزگاری" هەر بەقسەو لەئاست وتندا ، پارێزگارییەکی بەرژەوەند ئامێزە، لەگەڵ مانەوەی سوڵتانی هەڕەشەلێکراو، پارێزگارییەکە بەبێ ئەوەی ڕێگە بەپارێزراو بدرێت تاخۆی قایم بکات لەڕووی بەدەست هێنانی پێداویستییەکانی ژیان.. بەئیدارەکردنی کۆڵەکەکانی پیشەسازی بچووك و لابردنی ئابڵووقە لەسەر ناوچەی پارێزراو، کەدیارە سوود وەرگرتنی لەکونۆچکە گومرکیەکان، پزیسکێکە بۆ وەهۆش هێنانەوەی کەسی هەڵخەڵەتاو.

لەگەڵ ئەوەشدا کەلەخودی ناوچە پارێزراوەکەدا ،کەم وکورتیەکی بنەڕەتی هەیە لەچەشنی پارێزگاری لێکردنەکەو ئەو واتایەی کەلەسەر تەنافی سەربازەکانی ئەنجەرلێك هەڵواسراوە.

ناوچەکە بەزۆرێك لەو کەم وکورتی و کەلێنانە مایەوە کەفرستادەکانی دراوسێ، لێوەی دەهاتنە ناوەوە بۆ خستنەڕووی بە لێنەکانیان، پاش" بارودۆخی کتوپڕی "وەك ئێران و ڕژێمی بەغدادو تورکیا . پێکەوە هەوڵ و کۆششی نەپساوەیان دا بۆ لەناوبردنی هەر جۆرە دیاردەیەکی پێکهێنانی کیانێك، کەرەنگ بێت ببێتە مایەی خۆشگوزەرانی .. وەك مافێکی مرۆیانە لەبوونێکی عادیلانە لەدەوروبەری داگیرکەر، بە ڕکوکینەوە پەل دەهاون بۆ دەرەوەی دەریاکانی جیهان.. تا سەرکوتی یاخی بووەکان بکەن. وەك تریێ ی تشرینی دووەم هۆکارەکان پێگەیشتوون ، بۆ لەناوبردنی کۆڵەکەکانی بنیادنانی کیانێکی کوردانەو جێگرتنەوەی بەکۆڵەکەکانی "پاراستنی جۆر" : تورکیا بەنەخشە بۆ کێشانێکی ئەوروپیانە، بیەوێت یان نا، لەدەرەوەی چاودێریەکەیە .. ئێران لەهەمان شوێنی ئیعرابی..هەرێمایەتی دایە بەبەرژەوەندییەکانی. سبەینێش گاردی کۆماری دەگەڕێتەوە ناوچە پارێزراوەکە.

دەبێت کورد چی بکات ، بەو حەقیقەتەی کەدەموچاوی داپۆشیوە وەك دەمامکی ئاسنینی ئەلێکسەندەر دۆماس. لەچۆڵەوانیەکدا کەگڕەو پشکۆی ئاگر دەمووچاوی دەکوتێتەوە؟ هەر بەش و پارچەیەك و دەست و پێوەندێك خۆی دەهاوێتە باوەشی پارێزگاری لێکەرێکی درۆزنەوە، هەر لەوکاتەوە کەبوونی بووە مایەی قەیحە کردنەوەی کوڕەکانی عەرەب و عەجەم و تورك . لێرەو لەوێ، هەڵدێت.. لەبەغداوە بۆ تاران و لەتارانەوە بۆ بەغداو لەوێشەوە بۆ دیمەشق. سێگۆشەیەك کەبەکاری دێنێت، بۆ گوشار خستنە سەر ڕژێمی بەرامبەرو بگرەو بەردە لەگەڵیدا ..گەر یاخیش بێت دەستبەرداری نابن.. مەگەر سواری کەشتییەکی بێ چارۆکە ببێت و بەرەو ئۆقیانووسی ئاوەکان بکەوێتە ڕێ.



# تاراوگە ڕێگا لە ئافراندن ناگرێت . . .

وەرگێرانی : گاوە ئەمین

لە کتێبەکانی (سەلیم بەرەکات)دا،باڵندەکان هەمیشە لە فڕیندان،بەڵام ئەو بۆخۆی بەبێ باڵ ملی ئاوارەیی گرتووە. لە سوریاوە بۆ لوبنان، لە لوبنانەوە بۆ قوبرس و لە وێشەوە بۆ سوێد. ئەم پایزە یەکەمین دیوانی شیعری سەلیم بەرەکات بە زمانی سوێدی بڵاودەکرێتەوە.
نووسینی:ئان دالین لە شارێکی تەپوتۆزاوی باکووری سوریا(مەبەست باشووری ڕۆژئاوای کوردستان)ە،کە دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا (باکووری کوردستان)،کوڕێک گەورە دەبێت. ئەو دڵ پڕلەقینە لە خوێندنگا، کۆمەڵگا،خێزان و جادە قوڕینەکان،لە هەموو شتێك. بەڵام لە بەردەم گەورەکان و دەوڵەتدا،بێ دەسەڵاتە. بۆیە داخی دڵی خۆی بە ئازاردانی گیانلەبەران و سەربزێوی منداڵانە دەردەبڕێت. بەنزین دەکات بە پشیلەیەکدا و لە کلکیەوە ئاگری تێبەردەدا.

لە ڕۆمانی "کوللەی" سەلیم بەرەکاتی کورد دا کە بیرەوەریەکانی خۆی دەگێڕێتەوە،بە بەشێك لە ژیانی ئەو کوڕە ئاشنا دەبین. سەلیم بەرەکات دەڵێت: ئێمە وەکو خانەوادەیەکی کورد،سوکایەتی و بێڕێزیمان پێدەکرا،ئەمەش دەبێتە هۆی برینداركردنی ناخی كەسێك. ئەمەش دەبێتە ئامرازێك بۆ گەورە بوونی ڕق و کینە،ڕەشوەیەك لە ناخدا. من دەمویست ڕاستییەکان نیشان بدەم،نەك منداڵییەکی گوڵاوی کە بوونی نییە.

هەروەها لە ژیانی ڕاستەقینەی سوری- کوردانەی سەلیم بەرەکاتدا، دوو برا هەبوون،ڕۆژێکیان لەلایەن پۆلیسەوە ڕاپێچ دەکرێن،ئیتر لەو کاتەوە هیچ کەسێك سۆراخی نەکردوون. باقی خێزانەکەی بە شێوەیەکی گشتی ژیانیان لە تاراوگە،لە وڵاتانی وەکو میسر،لوبنان، ئەڵمانیا و سوێد،بەسەر بردووە.

جۆرێکی تری چەوساندنەوە کە ڕووبەڕوی کوردەکان بووەتەوە ئەوەیە کە یەکێکی وەکو سەلیم بەرەکات، کە یەکێکە لە ناودارترین نووسەرەکانیان،ناتوانێت بە زمانی خۆی (کوردی) بنووسێت یان بخوێنێتەوە. هەموو کتێبەکانی سەلیم بەرەکات کە لە 23 کتێب پێکدێن،ڕومان و شیعر و کتێبی منداڵان لە خۆ دەگرن،بە زمانی عەرەبی نووسراون. کتێبێکی تری سەلیم کە وەرگێردراوەتە سەر زمانی سوێدی،ڕۆمانی "پەڕە"،کە ئەویش باس لەهەمان ئەو سروشتەی ڕۆمانی "کولله" دەکات،دەکرێت ئەویش بە شێوەیەك لە شێوەکان بەردەوامیەکی سەربەخۆ بێت.

قارەمانەکانی ناو ئەم ڕۆمانە،مەم و دینۆ کە بە سکێك لەدایکبوون،دایك و باوکیان و شەش خوشك و برا،پێك دێن. کاتێك مەم گەورە دەبێت،باوکی ڕەوانەی قوبرسی دەکات. لەوێ دەبوو لەلایەن پیاوێکی بە شەخسییەتی نادیارەوە سەرپەرشتی بکرایە. مرۆڤ لە ڕۆمانەکەدا وا تێدەگات،کاتێکیش کە وەختی خۆی هات،ئەو کوڕە ئەرکێکی پێدەسپێردرێت کە بۆ گەلی کوردی بکات.

بەڵام کابرا بەهیچ جۆرێك پەیدا نابێت،کە لە سەرەتای ڕۆمانەکەدا بە مەم دەگەین،پاش شەش ساڵ چاوەڕوانی بێ مانا،دەیەوێت خۆی بکوژێت. بەڵام بە هۆی ڕووداوی جۆراوجۆرەوە،بەرنامەی خۆکوشتنەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە: پەڕێك لە ناو جانتایەکدا،دەیباتەوە دنیایی خەیاڵ،دوو باڵندە لە حەوشەی باخچەکەدا،هەواری لێدەخەن، جوتێکی سەیر دەبنە هاوسێی. گێڕانەوەکە لە یەك جێگادا وەقرە ناگرێت،جار بە جارێك پچڕپچڕ دەبێت، بەهۆی پەشۆکان و گفتوگۆ خەماوییەکانی نێوان مرۆچەکان،ئاژەڵەکان یانیش گژوگیایی ناو باخچەکە. کاتێکیش لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێت کە مەم هەر لەتەمەنی لاوێتیدا لە شارەکەی خۆی خنکاوە،بەڵکو ئەوە (دینۆ)یە لە جیاتی مەم دەنێردرێت بۆ جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکە، ئیتر بە جارێك ژێر پێی خوێنەر دەکەوێتە لەرزە. ئایا ئەمە هەمووی خەوێکە؟ سەلیم بەرەکات دەڵێت: شتە بێ واتاکان "absurd"، دەلالەت لە ئانارامی پاشەڕۆژیی کورد دەکەن.ئەمە ئەو دیالۆگەیە کە مرۆچ ناتوانێت لەگەڵیدا بڕوات. دەرد و خەمەکان، وان لە هەناوی مندا،من ئا بەوشێوەیە دنیا دەبینم.

لەوماوەیەی کە ئەو بەنووسینەوەی مێژووەکەوە خەریك بووە،لێی ڕوون نەبوو کە ئاخۆ گۆڕانکارییەکان بە چ ئاقارێکدا دەڕۆن،لە ڕەوشێکی وادا هەموو کتێبەکانی نووسراون.

– من دایمە تووشی هەمان سەرسوڕمان دەبم،چونکە ئەم دەزانی کە ئەو ڕووداو و مرۆچانەم لە ناخمدا هەڵگرتبێت. ئەمەش بەو مانایە دێت کە ئەو وەکو مرۆچێك سنوورێکی نییە. ئەم بێ سنووریەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئیحساسە بەهێزەی کە هەیەتی بۆ ئاژەڵەکان،بەتایبەتی بۆ باڵندە. ئەو دەڵێت: ئاژەڵەکان بەشێکن لە ڕۆحی مرۆچ.

– پەیوەندی نێوان خۆ و ئاژەڵ،پەیوەندی نێوان من و خۆمە. هەر جارێك تۆ بیر لە باڵندەکان بکەیتەوە،شێوەیەکی نوێ لەخۆی دەگرێت. هەروەك ئەوە وایە کە لێکۆڵینەوە لەسەر گەردوون بکەیت- بەڵام هەمیشە لە ناخی خۆتدا.

سەلیم بەرەکات لە ڕۆمانە تازەکەیدا کە لەم هەچتانەی پێشوودا بە زمانی عەرەبی بڵاوکرایەوە،بەتەواوەتی دەست بەرداری قەفەزەکەسایەتییەکەی و، دنیا کە وەك ئێمە دەیبینین،بووە.

– لەو ڕۆمانەدا،مرۆچێك یانیش جێگایەك نییە کە پێشتر بینیبێتم. باسی (Centaurer)ە،ئەو ئاژەڵانەی کە نیوەیان مرۆچ و نیوەکەی تریشیان ئەسپە. من لەم گیانلەبەرانە کۆمەڵگایەکی گەورەم بنیاتناوە. ئەم کتێبە تا بڵێی بە زەوقە،ئەوە قسەی سەلیم بەرکات خۆیەتی. بەڵام ئەو لەوە دڵنیا نییە کە ئەم کتێبەی وەربگێڕدرێت. زمانی کتێبەکانی بە تێپەربوونی کات زیاتر جێگیربوون،بۆیە وەرگێرانیشیان زەحمەتترە.ئەو پێیوایە کە چاپخانەکان ئەو پارەیە نادەن بۆ ئەو کاتەی کە بۆ وەرگێرانەکە پێویستە.

بەڵام بەهەرحاڵ لە پایزی ئەمساڵدا،دیوانە شیعرێکی سەلیم بەرەکات بە زمانی سوێدی بڵاودەکرێتەوە.ئەم کۆمەڵە شیعرە کە ناوەکەی بە

ئینگلیزی "The recklessness of rubies" "یاقوتی بیّ پەروا"،خەریکە لەلایەن چاپخانە بچکۆلانەکەی (Tranan) وە دەکریّت بە سویّدی.

پیّدەچیّت ژیـانی تاراوگـەی لـەم لا بـۆ ئـەو لا،نـەیتوانیبیّت هـیّزی ئافراندنی سەلیم بەرەکات دادۆشیّ. ئەو بۆ خۆی دەڵیّت: ئەوە نووسینە کـە توانیویـەتی هاوسـەنگی هـەبوونی ئـەو نائارامییـە ڕابگریّـت. ئیّستا ئیتر ئەو هیّندە نادڵنیا نییە،چونکە مۆڵەتی مانەوەی (ئیقامـە)ی وەرگرتووە لە سویّد.ئەو لەگەڵ منداڵە سیّ ساڵانەو هاوسـەرەکەیدا،بە ئیسراحەت لـە سكوگۆس کـە دەکەویّتـە خـواروی ستۆکهۆڵمەوە،پاڵیـان لیّداوەتەوە. لە حەوشەکەیاندا،خانوچکەیەکی دروسرتکردووە و ژنەکەشی پەنجەرەکـەی بـە ڕەنگـی ئـاڵاوالای ڕۆژهەلاتیانـە ڕازاندۆتـەوە.

بەڵام هەندیّك جار بیری باخچەکەیان لە نیکۆسیای قوبرس دەکات،کە شانزە ساڵ تیّیدا ژیاوە.

– 225 دارم ڕواندبـوو،یەکەبەیـەکیانم دەناسـی. وەکـو جیّگایـەکی حەسانەوە وابوو لە بیابانیّکدا.

– لە نیوە شەودا،لەخەو هەڵدەستام و ئاوم دەدان،چونکە هەفتەی دوو جار ئاومـان هـەبوو. لـە سروشـتیّکی وادا،ناچاریت کـاتیّکی زیـاتر بـۆ ئەمامـەکانت دابنیّـی،مـرۆچ پەیوەندییـەکی زیـاتری هەیـە لەگـەڵیان،لـیّرە ئەگەرخۆشت نەبیت ئەوان دەتوانن بژیین.

**سەرچاوە**
www.stpress.se/zino
, 10:50 2004 Jun 04



# ئێمە لەبەردەم جیهانێکی جەنجاڵی پڕ ڕوداوداین

ناوی کتێب: شێرە کوللەی ئاسنین

ناوی نوسەر: سەلیم بەرەکات

خوێندنەوەی: هەورامان وریا قانع

یەکەم پرسیار کە لە دوای خوێندنەوەی ئەم کتیبەوە دێتە بەردەممان پرسیارێکە سەبارەت بە قۆناغی منداڵی و ساڵانی سەرەتای تەمەن، ئەو ساڵانەی کە دنیا و گەردون و بوون، ژیان و لەدایك بون و مردن، کۆمەڵێ پرسیاری بێ وەڵامن.

قۆناغی سەردەمی منداڵێ ئەو قۆناغەیە کە ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێت لە دروست بون و پێگەیاندنی کەسێتی مرۆڤدا، قۆناغێکە پڕە لە پرسیاری هەمەجۆر، منداڵ ڕۆژانە کۆمەڵێ پرسیاری جیاواز جیاواز بە مێشکیدا گوزەر دەکەن، بێئەوەی وەڵامێکی گونجاوی دەستدکەوێت، ڕۆژانە دەیان حاڵەتی سەیر دەبینێ کە نە لێیان تێدەگات و نە کەسێکیشی دەست دەکەوێت بۆی لێکداتەوە، هەر لە لەدایکبونی براکەی، خوشکەکەی، هاتنی وەرزەکان، سەرماو گەرما، تادەگاتە پرسیار سەبارەت بە خودا و مانگ و ئەستێرەکان. زۆر بەدەگمەن کەسێك هەبێت وەڵامێکی ڕاستی منداڵ بداتەوە، هەموان لەسەر ئەوە کۆکن کە نابێ بە شێوەیەکی دروست وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێتەوە، بگرە پرسیارکردن لەسەر هەندێ بابەتی یاساغی وەك سێکس بەجۆرێك قەدەغەیە کە باسکردنی لەلایەن منداڵەوە دەبیتە شوێنی توڕەبونی گەورەکان و هەندێ جار بە لێدانی منداڵەکە کۆتایی دێت.

نەبونی وەڵام بۆ پرسیارە بێشومارەکانی منداڵ یەکەم هەنگاوە بۆ کوشتنی ڕۆحی پرسیار و خەفەکردنی ئەو دەنگەی کە دەیەوێ لە ڕێگەی پرسیارکردنەوە لە دنیا تێبگا و پەی بە نهێنیەکانی بەرێت، یەکەم هەنگاوە بۆ ئەوەی منداڵ هەمیشە فێری ئەوە بکرێت تەنها لەسەریەتی گوێبگرێ و خۆی هەوڵی دۆزینەوەی وەڵامەکان نەدات و هەقی بەسەر نیشی گەورەکانەوە نەبێت، وەك ئەوەی پرسیارکردن تەنها تایبەتبێت بە گەورەکان.

سەرەڕای ئەوە ئێمە لەم کتێبەدا لەوە دەگەین دنیای منداڵی دنیایەك نییە هەمووی هەر بەرائەت و سۆز و خۆشەویستی بێت، هەمووی هەر پرسیار کردن و گەڕان نییە بەشوێن نهێنیەکان، دنیایەك نییە لێوان لێوبێت لە گەمە و گاڵتەی منداڵانە، بەڵکو دنیایەکە بەشی خۆی ساتی شەڕانگێزی و شەڕوشۆڕی تێدایە، بەشی خۆی فرۆفێڵ و هەڵخڵەتاندن و فریودانی تێدایە. منداڵی زۆربەمان لە منداڵی سەلیم بەرەکات دەچێ، پڕە لە ساتی عاجزبون و توڕەبون و هەڵچون، سەرشارە لەو ساتانەی بە ڕاوەچۆلەکە و تەڵە نانەوە و گرتن و کوشتنی باڵندەکانەوە بردومانەتە سەر.

سەلیم بەرەکات لەم کتێبەدا بە ئاشکرا و بێشاردنەوە و شەرمکردن، باس لە منداڵی خۆیدەکات، منداڵییەك بە ئاسانی تەسلیمی ڕوداوەکان نەبوە و لەبەرامبەر زۆر ڕوداویاندا جۆرێك لە سەرکەشی و هەڵەشەیی نواندووە. لەگەڵ دایکدا توڕەبووە و بووە بە ناخۆشیان و لە ئەنجامدا بۆ ماوەی بیست ڕۆژ ماڵی بەجێهێشتوە و لە کێڵگە پەموەکەی نزیك ماڵەوەیاندا نوستووە.

سەلیم بەرەکات باس لەو توندوتیژیە دەکات کە لە قوتابخانەکانەوە سەرهەڵدەدات و تەلەبەکانی پێ گیرۆدە دەکەن، باس لە هاتنی سەرۆك بۆ قوتابخانە دەکات و باس لەو ئامادەباشییەی دەکات کە دەبێ خوێندکارەکان پێش هاتنەکە بە هەفتەیەك جێبەجێی بکەن، هەر لە هەڵواسینی پۆستەری سەرۆك بە ژورەکانی قوتابخانەکەدا و لەبەرکردنی هۆتاف و سرودی نیشتیمانی و کردنی وێنەی سەرۆك و ئاڵای بچکۆلانە بە کراسەکانیانەوە، تا دەگاتە ڕاوەستان و چەپڵە لێدان بۆ کەژاوەی قەرەباڵغی سەرۆك. سەلیم بەرەکات ئەو حاڵەتی هاتنی سەرۆك و تێپەڕینە خێراکەی بەناویاندا و ئەو هەموو خۆ ئامادەکردنەش بە سەرەتای توندوتیژی لەقەڵەم دەدات، سەرەتایەك دەچێتە پاڵ سەرەتا توندوتیژییەکانی دیکەی خێزان و گەڕە و قوتابخانە و شەقامەکانی شار، ئالەو سەرەتایانەوە منداڵ هێدی هیدی لە نێو تۆڕێکی فراوانی توندوتیژیدا گەورەدەبێ و چاودەکاتەوە، ئالەو سەرەتایانەوە تێدەگات پێویستە لەسەری خۆی بکات بە بەشێك لەو توندوتیژیە و بتوانێ لەگەڵیدا هەڵبکات. لەم کتێبە بچوکەدا ئێمە لەبەردەم دنیایەکی گەورە و فراواندا ڕادەوەستین کە دنیای منداڵییە، فراوانی ئەم دنیایە هێندە بەر بڵاوە کە جێگای هەموو شتێکی تێدا دەبێتەوە، هەر لە شەڕ و ڕق و زیزبوونەوە تا دەگاتە ئاشتبونەوە و گەمە و یاری و گاڵتەکردن پێکەوە.

سەلیم بەرەکاتی نوسەر لەم بیرەوەریانەیدا باس لەو سەردەمە دەکات کە بە چەقۆی چێشتخانەکەیانەوە لەگەڵ منداڵانی گەڕەك خۆیان گەیاندووەتە سەر ئەو سەلوێنکانەی کە پڕ بوون لە کەلاکی ئاژەڵی تۆپیو، چونەتە سەر ئەو گوفەکانەی کە بۆگەنی گیانەوەری مردارەوەبوو نەیتوانیوە هەراسانیان بکات، لەوێ بە چەقۆ و گوێزانەکانی دەستیانەوە کەوتونەتە لێکردنەوە و داماڵینی خوری و پێستی ئاژەڵەکان، ئەمەشیان لە پێناو چەند لیرەیەکدا کردووە. ئەو دڵڕەقی و حاڵەتە بێبەزەیانەی لەم کتێبەدا سەلیم بەرەکات دەیگێڕێتەوە، بەجۆرێکە لەئاستیدا سەرسام دەبین و تێدەگەین ئێمە نەك تەنها لەبەردەم منداڵییەکی هێمن و لەسەرخۆدا نین، نەك تەنها لەبەردەم جیهانێکی بێکێشە و بێ گرفتا نین، بەڵکو لەبەردەم جیهانێکی جەنجاڵی پڕ ڕوداوداین کە تا سەرئێسقان شەڕانگێزی و توندوتیژی تێدایە.

ڕوداوەکانی ناو ئەم کتێبە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە قۆناخی منداڵی قۆناخێکی دوولایەنە، لایەنێکی جوان و سۆزئامێزە و پڕە لە تریقەی پێکەنینی منداڵانە، لایەنەکەی دیکەیان لێوان لێوە لە ساتی دزێو و ناشرین، لایەنی یەکەمیان ئاشکرایە و جێی شانازی باوك و دایکە، لایەنی دووەمیان شێوەیەك لە نهێنی لەخۆدەگرێ و جێگای گلەیی و گازەندەیە، ئەم دوولایەنە پێکەوە گەشەدەکەن و دەچنە پێشی، پێکەوە کەسێتی منداڵەکە دەنەخشێنن، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە ئەم دوولایەنە لە ڕەوتی گەشەکردنیاندا پێویستە لایەنی یەکەم هێدی هێدی شوێن بە لایەنی دووەم لەق بکا و کاڵی بکاتەوە، بەجۆرێك دواجار ئەو شەڕانگێزی و ناشرین و دزێویە ببنە بەشێك لە زاکیرە و لە یادەوەریدا هەڵبگیرێن، ببنە شوێنك بۆ لێڕوانین و چیتر لەگەڵ گەورەبونی منداڵدا نەپەڕێنەوە بۆ قۆناخەکانی دیکەی ژیان.

# بەشێك لە"كڵێسەی جەنگاوەر"

سەلیم بركات

و: حەسەن یاسین



(1)

هەركەسە پەتوەكان و پێویستیەكانی بپێچێتەوەو، بیخاتە نێو لاندرۆڤەرەكەوە. چونكە لاندرۆڤەرەكە تەسكە، ناچارم خۆم بەپاشەكەیدا شۆڕبكەمەوە. پیتەكانم دەخەمە سەر دەعامیەكانی، خۆم بەوشیشەیەدەگرم كە كەوانیەك لەسەر لەشی ئۆتۆمبیلەكە دروست دەكا.

لەڕێگا بەرەو"كفارسلوان" لەگەڵ ئۆتۆمبیلەكەدا هەڵدەبەزم و دادەبەزم. لە"كفار سلوان" دا ناچار دەبم بەكێشانی نیشانەی سەركەوتن، وەك چۆن دەبێ جەنگاوەر وێنەی بكێشێ، وەڵامی منداڵەكان بدەمەوە، بێئەوەی لە چاڵەكان و خێرابیەكەی شوفێر هەراسان بم.

لەدەرەوەی"كفار سلوان"دا لە ئۆتۆمبیلەكەدا دادەبەزین و چاوەڕێی ئەو هێسترە دەكەین كە پێویستیەكانمان دەگەیەنێتە سەرلوتكەكانی"جبل الكنیسە".

(2)

روخسارمان وەك روخساری كاروانێكی(بەدوو)ە كۆچەرییەكانی سەرلێواری ڕێگایە. منداڵەكانی دەورمان دەدەن و چەند پرسیارێكی ساویلكانەمان لەبارەی شەڕ لێدەپرسن. وەك گەورەكان بەمكوڕییەوە فەرمووی ماڵەكانیانمان دەكەن. بەو منداڵییەی خۆیان بەچەك و جلەكان تاساون... داوای لێبۆوردنیان لێدەكەین. دوای دوو كاتژمێر لە چاوەڕوانیی ئێسترەكە بەهەنگاوە بوكانیەكانی گەیشت، وەك بڵێی پێمان رابگەیەنێ ئەوەی بەسەر چیاكە سەربكەوێ سەردارە: چەند ئازناوێكی جوامێرانەی لێئەنێن. پاشان كەل و پەلەكانمان دەخەین سەرپشتی. ڕێگا خۆڵەكە دەگرینە بەر. لەڕێگادا دارگێلاسەكان لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا هەروەستەمان پێدەكەن و، بەرەكەی سەرنجمان رادەكێشن و دەستەكانمان پڕ دەكەین لەو دەنكە شیرینانە، بێ ئەوەی گوێ بەتۆز و غوباری لێنیشتووی بدەین، لەپارووپەكی بێ قرەوبرەدا هەڵی دەلوشین پەیتا پەیتا هەنا سەبركێمان زیاتر دەبێ. ماوەكەمان بەدوو كاتژمێر یان سێ كاتژمێردانابوو، بەڵام بەرزاییە تاشەبەردەكان رازی نەبوون لەژێر هەنگاوەكانماندا پشت بدەن وەك چۆن بێداریك پیدەنێتە سەر زین. رازیش نەبوو یاریمان لەگەڵ بكات، یارییەكی گاڵتە ئامێز.

"ئەبو کامل" چاوساغمانبوو، خەڵکی"کفارسلوان" بوو لە تاریکاییدا ڕێگاکەی بزر کرد، لەنێو دۆڵەکاندا هەڵبەزودابەزی پێدەکردین تا سەرەگێژەمان گرت، کەچی هێسترەکە لە هەموومان زیاتر سەری گێژببوو. ئیدی ناچاردەبووین دەستی پێوە بگرین هەتا لەگەڵ چەوو تاشەبەردە لەرزۆکەکاندا خلۆر نەبێتەوە. مەسەلەکە تووشی نیگەرانیەکی زۆری کردین. هەندێ جار وامان خەیاڵ دەکرد"ئەبو کامل"ی خاوەن پەیکەری بۆش،بەرەو خۆکوژی پەلکێشمان دەکا، جارێکیان لێمان ونبوو، لە هەڵدێرێکی سێمەتریدا دۆزیمانەوە، لەسەر پێیەکانی وەستابوو، بەڵام بێگومان لە ئێسترەکە زیاتر بەرگەی دەگرت، ویرای ئەو بارەی خستبوویە سەرشانی.... بەردەوام بوو لەسەر ڕێبەری کردنمان، ئێمەش لەدوایەوە دەڕۆیشتین، بێنەوەی جێپێیەکانمان ببینین.

دەڵێین: قەیدی ناکا.. لەسەر تاشەبەردەکان دادەنیشین و هەناسەمان لەگەڵ هەناسەکانی بەردو ئەستێرەکان دێتەوەبەر و دەڵێین: قەیدی ناکا... ڕێگاکەمان لە بۆشاییە پڕەکەدا تەواو دەکەین، تا جارێکی دیکەش لە سەر تاشەبەردەکاندا دەگیرسێنەوە، بۆ ئەوەی هەناسەمان لەگەڵ هەناساکانی لێژاییەکانی رۆژئاوادا بخوێنەوە.

پاش کەمێك دەرك بەوە دەکەین کەئێسترەکە لە جیاتی ئەوەی بارمان سوك بکات، بۆتە بارگرانی بەسەرمانەوە.

لەکوێوە هاتووە بۆ ئەوێی دەگێڕینەوە کەل و پەلەکانی بەش دەکەین لێرەدا کوێرەوەری و هەناسە بڕکێمان زیاتر دەبێ.

هەندێ لە جەنگاوەرەکان بەسەرکەوتن ڕەت دەکەنەوەو، چاوەڕێی ڕۆژبوونەوەن، هەندێکیش دەیانەوێ ڕیگا کەتەواو بکەن. دواجار بیروڕاکە لەسەر ئەوە دەگیرسێتەوە کە کامیان لە هەموویان شارەزاتر لە ڕێ وبانەکان ئەو ڕەوان بکەن تا یەکێکمان بۆ بنێرن کە لەسەر لەبەیانیدا بەشێکی بارەکەمان بۆ هەڵگرێ... بەراستیش"ئەبو کامل" و دوو گونجی تر بەتەواوی بەسەرکەوتن، لەکاتێکدا چوارکەس لە ئێمە پەتوەکانیان لەسەر چەقی تاشەبەردەکاندا ڕادەخست گومەزە ساردەکەی ئاسمان و ئەستێرەکان خۆی دادەپۆشێ، بۆ یەکەمین جار دەرکمان بەکوشندەیی سەرما لەهاوین و، کوشندەیی تینوێتی کرد. کەپاڵی بە"ئەمیل" و"لوئەی"ەوە نا بەقامیشێکی وشك ئاوی پیسی چاڵێکی گچکە بخۆنەوە.

لەنێوان بێداری و خەوتندا کەبەدوای یەکدا دێن، شەو بەسەر دەچێ، چیا لە ڕۆشناییدا شێوەیەکی تر وەردگرێ، لوتکەکە بەپەیکەرە رووتەکەی خۆیەوە و، بەو تاشە بەردانەی لەسەر پێیەکانیان وەستابوون دڕندانەتر لەوەی ئێمە بۆی چووبووین، دێتە بەرچاو... بەسادەییەوە: لوتکە تەحەدامان دەکاو، بەزەیشی پێماندا دێتەوە.

پەتوەکانمان کە بۆشەورامان خستبوون کۆمانکردنەوە، دووبارە دەیانپێچینەوە، لەکاتێکدا"ئەبوکامل" پێدادەگرێ لەسەر ئەوەی خۆی بەتەنیا هەڵیانگرێ. بەم شێوەیە بەسەرکەوتنی دووەمجار دەستی پێکرد.

(3)

پێنج جەنگاوەر چاوەڕێمان دەکەن. تاشەبەردەکانی بەرازیش چاوەڕێمان دەکەن. وەك دۆستە لەمێژینەکان تەوقە لەگەڵ یەکتر دەکەی، قۆناغی یەکترناسین لەنێوان ئێمە ولەنێوان بۆسەو ڕێ و بانەکان دەست پێئەکا. بەهۆی چاویلکەیەکی زەڕەبین دەست دەکەم بەژماردنی سوپای سوری و، لوولەی تۆپەکانی کەریگاکان بەرەو(ضهر البیدر) لێ هەڵە ببوو. لەبەرامبەر ئەم هەڵەیەدا بریارماندا گفتوگۆکەم لەرێی"ب7"ەوە بێت، چونکە عومەر غایب بوو، ئارپیجیەکەش لەلای من بوو.

(4)

دەبوو لەنێوتاشەبەردەکاندا شوێنێك هەڵکەنین بۆ ئەوەی چەند مالۆچکەیەك چیبکەین کەجەستەکانمان بگرێتە خۆی، پاش ئەوەش کەدەستمان لێێدەبێتەوە، دەوری چاڵەکان بەبەرد دەچنین، بە پەتوەکانیش سەریان دەگرین. ئەم ماڵۆچکانەمان بەسۆزبوون، بەسەر ئێمە و ئەوبایەشدا کووڕ دەبوەوە کونیلەکانی بەردەوە گۆشەگیریەکەمانی دەشکاند.

بیرمە لەیەکەمین سپێیدەدا، لەوێ باڵەکانی پاساریەکان بێداریان کردینەوە، چونکە دەستەیەك دەچوون، دەستەیەك دەهاتن، نامۆیەك بەهێمنی و ترسەوە نامۆیەکی دیکەی بەسەر دەکردەوە.

(5)

هەموو ڕۆژێك شتێك دەخەینە سەر ماڵەکانمان کەوای لێبکات لە چاوەڕوانیە پەرۆشەکەمان بۆ کانزایەکی پەرۆش، بەسۆزتر بێت.

(6)

ئیشەکەمان لەشەوەوە بۆ شەو، لەگەڵ تەمومژ لەرۆژگاردا دەست پێدەکات: هەردووکیان پەردە پۆشکردنی ئەو پاچانەکە گۆشەگیریی چیاو بێدەنگیی بەردەکانیی بڕی.

هەوڵماندەدا ئەو ڕێ وبانانەی بەبناری چیادا ڕەتدەبوون، کۆنترۆڵیان بکەین.سەنگەرێك لێرەو یەکێکیشمان لەوێ هەڵەکەند، پاشان گونیە بەتاڵەکان پڕخۆڵ کران، کردمانن بەسوورەی سەنگەرەکانمان. ئەوەشمان بیرنەدەچوو پاش ئەوە شوێنەواری خۆمان ون کەین

ئیشکردن لەنێو بەردی لاساردا پڕئێش بوو، بەڵام ئێمەهەندێ جار شەکەتیەکەی خۆمان لەبەردەم دیمەنی لەدوورەوە سوتانی بەیروت، لەبیردەکرد.

(7)

ئەو ئاوەی بۆ خواردنەوە دەیکێشین، گران لەسەرمان دەوەستێ، چونکە ئەو تاکە لێژاییەی لەکانیەکەوەنزیکە پێویستی بەیەك کاتژمێرو نیو هەڵزنان بەشێوەیەکی نیمچە شاوڵیەوە هەیە، کە هەناسە بڕکێی پێدەخستین. لەماوەی دوازدە رۆژدا مافی ئەوەمان نەبوو دەمووچاوی خۆمان بشۆین. ئەوەی بەرەو کانیکە بۆ ئاوهێنانشۆڕبوبایەوە لەو ڕێسایە بەدەربوو.

(8)

بەتەنیاو بەپەشتەماڵێك و پارچە سابوونێکەوە دابەزیمە سەر کانیەکە. لەخروری بەردا خۆم شوشت،پاشان لەسەر زەویەکە لەسایەی لێشاوی تەمومژی تێکەڵ بەنیگەرانی چیادا، ڕاکشام.

(9)

لەناکاوڕا چیا ڕۆشن دەبێتەوە. لەناکاویشڕا سەنگەرەکە قوتمان دەدا.

من وهاوڕێ باشورییەکەم لە پاسەوانیدا دەستمان بەهەناسەی خۆمانەوە گرتبوو تا بۆمبە روناکی پژێنەکەی سەر سەرمان تەواو دەبێ.

پاشان بەتەنیا دەکشێمەوە بەرەو ئەو سەنگەرەی دەڕوانێتە سەر ڕێ و بانە خۆڵەکانی خوار بناری ڕۆژئاوای چیاکە، ڕادەکەم. هەستم دەکرد پێدزەیەک بۆ نێمان کراوە، یانیش ڕەنگە بۆردومان بکرێن، بۆمبێکی دیکەی ڕووناکی پژێن بەرزیوەوە. لەنێو بەردەکاندا ڕادەکشێم تادەکوژێتەوە. دەست بۆ دەزگای بێتەل سەرشانم دەبەم و پێوەندی بەسەرکردارییەتیەوە دەکەم:

-هیچی تازەنیە..ئەمشەو دوو بۆمبی ڕووناکی پژێنیان بۆمان کردە دباری.

-چاودێری زیاتر بکەن. وریابن.

-وەرم گرت

-تەواو

-دەزگاکەم داخست، پاشان چاوەڕێم کرد، تا ئەو دوو کەسەی ترهاتن کەنۆرەی پاسەوانییان بوو.

(10)

ڕاجیمەی موشەکەکان ئەمرۆ لە"ضهر البیدر"دا بێدەنگیە کانزاییەکەی خۆیان دادەماڵێ، وەک چۆن ئێمە کراس لە خۆمان دادەماڵین. ڕووی لوولەکانی لەچیا کرد، ئینجا دەستی بەلوره لورە وێرانکەرەکەی کرد. دوو خورجینم پێبوو کە حەوت گوللەی ئارپێجی"ب7"ی تێدابوو، سەرەرای تفەنگەکەی خۆم و ساجورەکەی. بەرەو سەنگەرەکەی ڕۆژئاوا گورگە لۆقەدەکەم. لە کاتێکدا موشەکەکان ئاسمانی(الجبل)یان بە ئاراستەی(ترشیش)دا بەتاڵان دەبرد.

دووان لەئێمە بەرەو ڕەبایەک کەبەچاو دوور بوو، بەڕێکەوت. سێ نیشانشکێنی(ب7) بەتەواوی خۆیان لەنێو سەنگەرەکانیاندا قایم کرد. ئەوانی تر وەک پاڵپشت و دەستەی پاراستن بڵاوبوونەوە. مستەفا پێم دەڵێ بۆ چاودێری بچمە سەنگەری سەروو، کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتەبەرامبەر ڕاجیمەکان. من و هاوڕێ باشوورییەکەم بەپشت کوورییەوە، بەخێراییەکی وریایانەوە دەچین.

تاشەبەردەکان باڵیان گرت، گوێمان لەگێزە گیزی ساچمە دۆستەکان بوو. کەدەگەینە نێو سەنگەرەکە دەبینین چاڵێکی کوژراوی بێ سیمایە... دەمانزانی ڕاجیمە سوریەکە ڕاستەوخۆو بەسەرکەوتویی ئامانجەکەی خۆی پێکاوە. کەمێک جوێن دەدەین. پاشان بۆ یادگاری ساچمەیەکی گەورە هەڵدەگرین، لەسەنگەرەکەمان دەکشێینەوە، لەو ترسەی ئەوەک گوللە ڕاجیمەی دووەم بۆ سەنگەرێکی هەتا هەتایی بمانگوازێتەوە.

فەرمانەکەمان تاقی دووەمی ڕۆژو، هەموو شەوەکەش دەخایەنێ. بەیانیەکەی دەستمان بەبەرنامە ئاساییەکەی خۆمان، سەبارەت بەکاتەکانی وریایی وژیان کرد.

(11)

ڕووداوەکانی شەڕیەک لەدوای یەک، بەهۆی دەزگای ناردن پێمان دەگەن. ئەمرۆ پێمان ڕادەگەیەنن کەکشانەوەی سوری لە(صوفر)ەوە دەست پێدەکات.. بەڵام ڕووداوەکانی شەو، ڕووداوەکانی دەزگای ناردن بەدرۆ دەخەنەوە.

بەچاوی ڕووتی خۆمان ئەو تانکانەمان دەژمارد کەلەلای (سعد نایل)ەوە بەرەو"صهر البیدر" دەهاتن و لە وێشەوە بەرەو "صوفر" لە ماوەی دووشەودا زیاتر لە سی و شەش تانک هاتن.

داخمان بۆ ئەو سووربوونە لەسەر خیانەتکردن لە مرۆڤایەتی دەخوارد. داخمان دەخوارد کە مەرگ بەم کوێرەوورییە تاقیمان دەکاتەوە، بەڵام مەرگی پڕ کوێرەوەری لە بنارەکەی تری چیاوە بوو.

(12)

جوانیی چیا جەنگاوەر ڕادەماڵێ، تەموژاویی چیا چەندین چەپکی سۆز دەچنێ بۆ ئەو سەردەمانەی لەگەڵ گەردیلەکانی تۆزدا بەرەو درزو کەلێنەکان پێدزەیان کرد.

لەبارەی جیۆلۆجیاوە کەم دەزانین، کەچی چیا کتێبەکەی خۆیمان بۆ تێخوێندنەوە سادەکەی ئێمە وەڵا دەکات: ناو"جبل الکنیسە"ی لەسەردەمێکدا لیوان لێوکردبوو، کەسەردەمی(میۆسینی) یان (ئەرکی)، یان ڕەنگە سەردەمێکی تر، باسەردەمی نیاندرتاڵ بێ، کەمرۆڤ بەرایی تێدا دەرکەوت کە نیوەی لەئاودابوو، نیوەشی لەوشکانی: نیوەی بزن، نیوەشی لەگیای دەریا... ڕەنگە ئەوانی تر بەم مەسەلەیان نەزانیبێ، بەڵام ئێمە دڵنیاین پەیدابوونی سەرەتا بەم شێوەیە بووە.

بەهەرحاڵ، ناو"جبل الکنیسە"ی لێوان لێوکرد، کاتێ ئەم ناوە بەری لێکیدا، زیندەوەرێکی زۆر لە زیندەوەرەکانی ناو بەجێمان و بەفریای شەپۆلەکە نەکەوتن، تابەشێوەیەکی گیانی بەگیانی بەولاتی یەکەمی خۆیان، بەپارچەکانی بەرد، بەپێچاو پێچەکانی لمی قوڵاییەکانەوە نووسان.

دووجار تێبینی ئەوەمان کرد کەبەسەرکەوتنەکەمان لە کانیەوە بۆ بەرزاییەکان: گوێچکەماسییە بەبەردبووەکان و، پارچۆکەی دیکەی پەیکەرەکانی ڕووەک و ماسیەکانی بزرکرد.

(ئەمیل) گەلێ لەو زیندەوەرانەی کۆکردبوەوە، تا لە چۆڵەوانیەوە بۆ شار بیانبات، منیش بۆ تێکەڵکردنی سەردەمەکان لەگەڵیدا بەشداربووم: سەردەمانێک کۆتاییان دێت، تالەسەر بانێژەی ماڵەکانمان بەئارامی و داناییەوە شەو نخونی بکەن.

(13)

ئەمرۆ فریاکەوتنی یەکەممان پێگەیشت(ئەحمەد حەمماد)ی دۆستمان بۆ جێگۆڕکێ گەیشتە لامان. ئێمەشەکەت بووین، ئەویش شەکەت بوو. پاش دوو ڕۆژ بۆ"حەممانا" دابەزی، تا دووبارە بەسەرکەوێتەوە بۆلامان و هەندێ جەنگاوەری نوێ بۆلامان سەرخات. ئەو جەنگاوەرە نوێنانەی بوارمان پێدان ئەوەی ئێمە لە جەنگەکەدا پەیمان پێنەبردووە، ئەوان پەی پێببەن.

*فەرمانە : مەبەست لە"نفیر"ی عەرەبییە.

سەرچاوە

سلیم برکات، کنیسه (المحارب: الیومیات الصغیرة لحرب الجبل، الطبعة الاولی، ت2-1976، ص53-67

# وێنەی شیعری لای سەلیم بەرەکات

## (نامەی دیبلومی خوێندی باڵا)

نووسینی: جیهاد عوسمان وەرگێڕانی: محەمەد سالار

زانکۆی لوبنانی کولیجی ئاداب زانستی مرۆڤلیەتییەکان(لقی یەکەم) بەشی ئەدەبی عەرەبی لە بەیروت بڕوانامەی ماجیستەری لە ئادابی عەرەبیدا بەخشی بە خوێند کار سامی یە سەلوم لەسەر ئەو لێکۆڵینەیەی ئامادەی کردبوو دەربارەی

وێنەی شێعری لای سەلیم بەرەکات کە پێی هەستاوە لە ڕێگای دیوانەکەیەوە: سەرکێشی یاقوت (طیش الیاقوت)، نامەکەی بە پێشەکییەك دەست پێدەکات باسی باری مێژوویی و کۆمەڵایەتی کردووە کە دەبێتە هۆی هاتنەڕووی بەرهەمی ئەدەبی تا دەگاتە جێگا دەستی سەلیم بەرەکات لەم بەرهەمەدا تیشك دەخاتە سەربابەتی گەشەکردن لە ژێر ململانێی جیهانی(سەرمایەداری و سوشیالیستدا) هەروەها تیشکیش دەخاتەسەر ڕەنگدانەوەی ئەو ململانی یە جیهانییە لەسەر هەڵکەوتووان و بلیمەتانی کلتوور و سیاسەت و دواتر دەچێتە سەر بڕگەیەکی تر بۆ ئەوەی بە تێرو تەسەلی قسە لە بابەتی گەشەکردنی ناوچەی بکات لە گۆرەپانی عەربیدا زۆر بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەوڕووداوە گشتییانە دەکات کەشان بە شانی ڕەوتی بەرهەمی ئەدەبی هەنگاوی ناوە ئەمەیش بۆ ئەەی لە ئەنجامدا بتوانێ شوێن دەستی بەرەکات لەم بەرهەمە ئەدەبییەدا دیاری بکات لە ڕاستیدا لەنەوەتەکاندا چامەی عەرەبی گەشەیەکی چاکی بەخۆوەبینی بۆ ئەوەی لەگەڵ دوای نوێگەریدا گونجاو تەبابێت، هەر وەك جەخت لەسەر ئەوەیش دەکات کە نوێگەری لەسەر هەڵوەشاندنەوە و بڵاوکردنەوە و بچڕبچڕکردن دامەزراوە لە باتی ئەوەی لەسەر یەکخستن و کاملبوون دامەزرێ، بەڵام قۆناغی دوای نوێگەری لەسەر ئەم بنەمایانە دانەمەزراوە، بەڵکو دوای نوێگەری زۆران بازی و ململانێی ڕەتکردەوە و لەسەر پێکەوە ژیانی کۆدژەکان (التناقضات) و تەبای دامەزراوە بۆ ئەوەی بکاتە مەبەست و، قسەکەی، ئەوەیش لەچامەکانی دیوانی (سەرکێشی یاقوتدا) دەبینین کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە بە شێوەیەکی سەرەکی بەرەکات بۆ بیناکردنی هزرەکان پشت بەووێنە دەبەستێ و تەواوی سنورەکانی کێش(الوزن) دەبەزێنی، لەڕاستیدا بەرەکات زمانێکی باڵاو تایبەتی هەیە(لغةمتمیزة) کەشاعیرتیادا لەسەر زمانێکی نوێی وەها گرەو دەکات کە تەباو گونجاوبێت لەگەڵ ئەوباری نوێکردنەوەیەدا کە لەسەر دەوڵەمەندی دەقەکەی بە ئیحا دامەزراوە دواتر بۆ ئەوەی بگاتە خستنەڕووی چەند ووێنەیەك کە لە ڕواڵەتا بچڕبچڕن و هیچ پەیوەند ییەکیان بەیەکەوەنییە، بەڵام لە قووڵاوی و ناوە ڕۆکدا پەیوەندو پەیوەستن لەم نوسراوەی خوارەوەدا ئەو بابەتانەی لە نامەکەدا ووت و ووێژی لەسەرکراوە دەیخەینەڕوو:

أ- (وێنەی شیعری لە چەمك و پیادا کردندا و جێگای بەرەکات: )

سامییە سەلوم لەم یابەتەدا دەگەڕێتەوە بۆ دواوە تاکو ئاماژە بە بەشداری کردنی زانایانی پێشینبدا لە چەمکی ووێنەی شیعریدا هەروەها بۆ ئەوەی تیشکیش بخاتە سەر شێواز و ڕێگاو پڕۆگرامیان بۆ تێگەیشتن لە شیعر، هەروەك ئاماژە بەو دەقە قورئانییە پیرۆزە موعجیزەیش ئەدا کە زانایانی پێشین پشتیان پێوە بەستووە و هەوڵیان داوە لە ژێرتیشکی لەبن نەهاتووی ئەودەقە موعجزەدا چارەسەری ووێنە(الصورة) بکەن و شیکاریکەن، لەم ڕووەوە دەڵێ: دۆزی ئیعجاز لە ڕووی ئەدەبییەوە لە دۆزگرنگەکانە، جا ئەو ئیعجازە بۆ تەهۆی ئەوەی قورئانی پیرۆز ببێتە بنچینە بۆ زانستییەکانی زمانی و نەحو، فەرهەنگ و ووێنەو چیرۆکەکان، بۆیە تەنها ئەوەی لە قورئانی بێپەیدا هاتووە بنەماو بنچینەی ڕاست و دروستە ئیتر هەرچی هەیە بێجگە لە قورئانی پیرۆز هەر هەمووی ملکەچی ئەو ئیعجازەیە، دواتر هەوڵئەدا بگاتە پووختەی ڕاو بۆچوونی زانایانی پێشین لەم بوارەدا بۆیە گەلێ لە دۆزە ڕخنەیەکان دەخاتە بەر توێژینەوە، وەك دۆزی هەڵسەنگاندن لە نیوان دووشاعیردا بۆ ئەوەیش وەك نموونەیەك هەڵسەنگاندنی(ئامەدی) دەکاتە بەڵگە لە نێوان(طائیین) ودۆزی کەڵەیدا لە ڕێگای شیکردنەوە و چارەسەرکردنی لەلایەن (ئەلئەسمەعی) یەوە و دابەشکردنی شاعیران بۆ کەڵە شاعیر و شاعیری تر، هەروەها دۆزی چینەکانی شیعر لە ڕوانگەی (ئیبن و سەلامە)وە لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوەکە ئەم دۆزە ڕەخنەیانە بەکەم و کورتدادەنێ بەڵام دۆزی شیعرو پەخشان کە لەلایەن تایبەتمەندان و ڕەخنەگرانی پێشین قسەی لەسەرکراوە و لێیان کۆڵیوەتەوە ئەویش کاتێکبووە کە شیعری عەرەبییان ناسیوە و بەشێوەیەکی ڕوون لە کێش و سەروادا چڕبۆتەوە لەو تایبەتمەندانەیش" ئیبن وطباطبای حاتەمی-مەرزوقی- ئیبن ئەسیرە" ئەم دۆزانە بەدۆزگەلێکی هۆکارکراو دادەنێن دواتر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕەخنەگران دووباڵی سەرکین یەکێکیان موعتەزیلەن کە پشتیوانی ووشەن ئەوی تریان ئەشاعیرەن پشتیوانی واتان. لێکۆڵینەوەکەکێش بەباسەکەی ئەدات و فراوانی دەکات بۆ ئەوەی پەل بۆ ڕاو بۆچوونی فەلاسیفەو موتەکەلمینیش بهاوێژێ لە دۆزی ئیعجازدا بۆ ئەم مەبەستەیش لە کاریگەرییەکانی مەنتیقی ئەرستۆو گرنگ ترین تێورگەلی بەلاغییەکانە وە دەست پێدەکات، و زۆر بەچڕی لە بابەتی ووێنەدەکۆڵێتەوە لەلای ئەوان و هەتا ئەم قۆناغەی ئەمرۆ تاکو لە کۆتاییدا دەگاتە ئەو دەرئجامەی کە ئەوەی لێبەرهەم دێنێ: کە ئەو دۆزگەلەی زانایان و تایبەتمەندانی پێشین پێشکەشیان کردووەدۆزگەلێکی کەم و کوڕ بوون لە ڕووی لێکۆڵینەوە و چارسەرکردنی دەقی شیعری نوێوە دواتر دەچێتە سەر لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی ڕۆژئاوا لە ڕەخنەگەریدا ئەوەیش لەبەرئەوەی کە دیارە ڕۆژئاوا وەك سەنتەر گەلێك کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر ڕەخنەگەری ئەدەبی و عەرەبی هەروەها باسی ڕێبازە ئەدەبییە ڕۆژئاوایەکانیش دەکات هەروەك ڕۆڵی کاریگەریشیان دیاری دەکات لەسەر ڕەخنەگەری عەرەبی هەتا دێتە سەر شیعری نوێ"لەبەر ئەوەی کە شیعری نوێ کاری گەری ئەدەبی غەرەبی لەسەرە بەڵام هێندە هەیە کە لە زمانەوە دەردەچێت ئەوەیش بەرهەمی گەشەکردنی مێژوویيە بۆ شیعری عەرەبی.

### شوێنی سەلیم بەرەکات لەنیوان شاعیرانی نوێگەریدا

سامییە سەلوم لە ڕێگای خستنەڕووی دیاری ترینی ئەو ناوانەدا کە لەو ماوە یەدا دەرکەوتن وەك: یوسف الخال و، خەلیل حاوی و ئەدۆنیس کە دیارە ئەدۆنیس لە یوسف الحال و خەلیل حاوی بەرهەمی زۆر ترەو

لەوانیش دیارترە نامەکەی سەلوم شوێنی سەلیم بەرەکات دیاری دەکا لە نێوان شاعیرانی نوێگەریدا دەبینین سەلیم بەرەکات لەو ناوانەیە کە زۆر دیارن و زۆر بەهێزو تواناوە لە گۆڕەپانی ئەدەبیدا دابەزیون، بەرەکات لەگەڵ ئەوەدا کە خاوەنی بەرهەمێکی زۆر زۆرە شێوازێکی باڵاو دیار و ئاوازەی هەیە لە نووسیندا و توانیوێتی زمان و شیعری عەرەبی دەوڵەمەندو خەنی بکات و ئەزموونێکی نایاب و باڵای وەهایان پێببەخشێ کە جێگای سەرنج و تێرامان بێت.

دواتر سامییە سەلوم دەچێتە سەر برگەیەکی تر بۆ ئەوەی شوێنی دیوانەکە(طیش الیاقوت) لە شیعری شاعیردا دیاری بکات بۆ ئەمەیش دەست دەکات بەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵە شیعرەکانی و هەندێک لە سیما تایبەتیەکانیان جالە ڕێگای ئەو ڕوونکردنەوە و خستنە ڕوووە وە شوێنی(طیش الیاقوت) کە هەشتهەم دیوانییەتی دیاری دەکات. شاعیر لەم دیوانەدا ووتو ووێژ لەگەڵ دراوسێکەیدا دەکات کەمەرگە لە بارەی کاروباری ژیانی گشتییەو، کارەکان لەگەڵ جیوازییەکانیاندا یەکسانن لەبەردەم مەرگدا لە یەکەمیاندا تاڵانکردن پۆلێن دەکات لەدووهەمیشدا لەسەر تایبەت گەلێکی ڕواڵەتی دەنوسێت کەدارێژراوی خەیاڵێتی لەسێهەمیشدا درێژە ئەدات بە سیاقێکی کورتکراوە لە داڕێژانی ئەزموونەکەیدا کە لە مەرگی ئاسایی ئەفرێنێ و ژیانێکی نوێی پێدەبەخشێ لە سیاقەزمانی یە باڵاکەیدا.

بینای گشتی چوونیەکە لەگەڵ چامەگەلی دیوانەکەدا: لێرەدا بابەتەکە چەقدەبەستێ لەسەر پێکداچوون و تێک ئالان لە بینای گشتی سێ چامەکەو هەستانی بەجێ بەجێکردنی ڕۆڵی بەڵگەیی بەچاکترین شێوە، لە ڕاستیدا شاعیر بەرەکات ئەوەسێ دەقەی یان بڵێین: ئەوسێ چامەیەی بە شێوازی دارێژاوە کە شیعرییەتیان لێ هەڵدەقوڵێ هەروەها دووریشی خستوونەتەوە لەو ڕابوردووەی کە کەرەستەکانی لە شێوەکانی مەرگ و ژیان وەردەگرێ، لەبەر ڕەچاوکردنی سەرکەوتنی کردار گەلی فەرمان و کردار گەلی بەڵگەیی لە فەزای سێ چامەکەدا بەسەرداهاتووا دەبینین بەداهێنانەکانی لە ژیاندا ڕوو بەڕووی مەرگ دەبێتەوە بەڕاشکاوی گوزارشت لە نەیاری خۆی ئادا بەرامبەر بە سەرمایەداری بەڵکو وێنەگەلێکی نیگا نامێزی هێما بەخش دادەبەزێنێ و لە ڕێگای وێنە گەلێک و هەرسێ چامەکەوە کە ئەمانەن: تەصنیفی تاڵانکردن- قوفڵەکان پۆلێن کراونکانی تالانی(تصانیف النهب)،-قوفڵەکان- ووتارێکە لە تایبەت گەلێ ڕواڵەتدا، درێژەپیدان لە ڕیتمێکی کورتکراوەدا.

شاعیر سەلیم بەرەکات بەشێوەیەکی ڕوون حەزی لەبەکارهێنانی تەمومژەو (الغموض) پەیوەندیشی لەگەڵ قسەدا پەیوەندییەکی هێماییە نەک پەیوەندییەکی هێماییە نەک پەیوەندییەکی ڕوون بەرەکات خۆی لە سەرەتای چامەکەدا ئەم ڕاستییە ئاشکرادەکات پشتگیری کردنی شاعیر لە نادیار و خەیاڵ لە کۆتای چامەکەیدا ڕوون و ئاشکرایە هەروەها لە کۆتایی دیوانەکەیشیدا ئەو لەو خەیاڵە ئازادەدا دەژی کە جێگایەکی ئەدەبی دەخولقێنی و ژیانی خەستەیی لە شاعیردا دەکوژێت و ژیانێکی ساغ و دروست و خاوێنی پێدەبەخشێ لە خەیاڵێکی ئازاد دا کەتیایدا ڕووبەڕووی کوتانەوە و داپڵۆسینی ژیان دەبێت.

لەکۆتای بەندی یەکەمدا نامەکەی سەلوم ناونیشانی دیوانەکە(طیش الیاقوت) تەئویل دەکات: ئەو یاقوتەی کە گوزارشت لە گەوهەرێکی گران بەها ئەدات دێتگوزارشت لە خەیاڵی خاوەنەکەی و زمانی خاوەنەکەی ئەدات ئەو یاقوتە لەگەڵ ئەو بەها باڵایەی خۆیدا دەبێتە بەردێکی ڕێکخراو وەک بەشێک لە سیستەمی سروشت، چونکە شاعیر بەشێوەیەکی تەواو لە سیستەمە تەقلیدییەکەی دەردەکات وای لێدەکات سەرکێش بێت.

هەروەها لەو بەردەدا گوزارشت لە باری ژیان دەدا بەو سەرکێشییەی هەر هەموو سیستەمە تەقلیدییەکان هەڵدەوەشێنێتەوە

## وێنەکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگدا

دەکرێ هەندێجار دوورگەیی(المنفی) یان نامۆی یەکێک بێت لەو هۆکارە ڕاستەو خۆیانەی کە تێڕوانینی بوونەوەر بۆ ژیان ڕەشبینکات جالەو ڕووانگە ڕەشبینەوە بۆ ئەم ژیانە ووت و ووێژ لەگەڵ ئەو مەرگەدا دەکات کەلێی نزیک دەبێتەوە، ئائەمە حاڵی بەرەکاتە لە چامەکەیدا کە ڕووبەڕووی مەرگ دەبێتەبەمەرگێکیداهێنەر کە دەبێتە هاوبەشی لە داهێناندا دواتر ئەمە سەردەکێشێ بۆ ژیان لە ڕێگای خولقاندنی ئەدەبییەوە.

شاعیر کارگەلێکی واقیعی دانابەزێنێ بەڵکو لەو واقیعەی کەوا حەقیقەت و خایاڵ یەکدەخات چەند ووێنەیەکی شیعری وەهادا دەڕێژێ و دەخولقێنی کە لەڕێگای ئەووێنانەوە بەڵگە گەلێکی دیاری کراوی وەها بەرجەستە دەکات کە هەڵویستی بەرامبەر ژیان و مەرگ و سیستەمی کۆمەڵایەتی ووێنابکەن.

سەلیم بەرەکات لە کۆمەڵە شیعرەکانیاو لەڕێگای ووێنە شیعرییەکانییەوە- بەگوێرەی ئەم لێکۆڵینەوەیە- پەیوەندی خۆی دیاری دەکات بەمەرگەوە و بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێ بۆ ئەمەیش لەدڵەڕاوکێی ژیان و مەگەوە دەست بەم گەشتەی دەکات هەروەک بەگاڵتەجارێکی داهێنراو ڕووبەڕووی خەمی ڕاستەقینە دەبێتەوە لەواقیعدا ئەمەیش وەک شێوازێکی پەیوەندی نامێز لە نێوان ژیان و مەرگدا هەروەها بەڕاشکاوی هزرە کەیشی بەجەنگی مەرگی زمانەوانی دەشارێتەوە.

## بەشی سێهەم وێنە لە نێوانی ڕواڵەت و درێژەپێدانی کورتکراوەدا

لەم بەشەدا نامەکەی سەلوم باس لە چامەی دووەم دەکات(قوفڵەکان) ووتارێکە دەربارەی تایبەتگەلی ڕواڵەت، هەروەها چامەی‌سێیەمیش(درێژە پێدان لە سیاقێکی کورت کراوەدا) لەباسەکەیدا تیشک دەخاتە سەر ڕۆڵی وێنە لەجێبەجێکردنی بینای گشتی هەردوو چامەکەدا. لە چامەی دووەمدا شاعیر بە زمانە شیعرییە باڵاکەی ڕووبەڕووی واقیعی نەبینراو دەبێتەوە و کارەکان ڕاپێچ نەبینراو دەبێتەوە و کارەکان ڕاپێچ دەکات بەبێ ئەوەی پشت بەبەخت ببەستێ دواتر پێشبینی کردن بەرەنگاڵەی ئەم ومژ(الغموض) دادەڕێژێ، بەهۆی ئیلهامەکەیشییەوە بەئارەزووی خۆی قوفڵی بەختەکان هەڵدەسوڕێنێ، لەڕواڵەتدا ئەمە لەسەر ڕەمڵ لێدان و جادوبازی دامەزراوە ئەمەیش سەردەکێشی بۆ ئەوەی‌ئەوە بگەیەنێ شاعیر ڕووی وتارەکەی بکاتە جێگایەکی ڕەهاو فراوان وەک نەبینراو(الغیب) وپێک گەیشتن لەگەڵ شوێن و ئەوەی لەسەر شوێنە سامییە سەلوم جەخت لەسەر ئەوە دەکات کاتێک شاعیر گوزارشت لەو قوفڵگەلە دەکات کە کەسی

بەرامبەر (المخاطب) لەواقیع و لە ئێستادوور دەخاتەوە بۆ ئەمیە لە ڕێگای ئەو خەیاڵەوە کەڕابووردو وەك ئەلتەرناتیفێك لەئێستا بۆ داهاتوو دەخاتە پێش چاو:

ئەمانە بەڵگەگەلی سنورن تۆ بەمەرکەب بادەگری بەسەریانا و دەیان پارێزیّ لەوەی کە یەقین (الیقین) ئابڕویان بەریّ بەووشەکان ئیمزادەکەیت بۆ ئەوەی بەڵگەگەل لە مشت ومڕبی بە ئاگابن و بسرەون، شوێن گوللەی خەیاڵەو ئەتپێکیّ و بۆ ئەوەی سەرفراز و ئازاد بێت، لەوێدا وویلبوون هیوایەو گەردوون بە سیپاڵەکانییەوە دەمەجەنجەڕی یەقینە(الیقین)** بڕگەیەکە لە دیوانی سەرکێشی یاقوت(طیش الیاقوت) لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بۆ ئەو دەکات و دەڵێ: بەپێچەوانەی ئەوەوە کە لە درێژەپیدانا باوبلاّوە کەووشە لەسەر حسابی واتا زیاد و فراوان دەکریّ، شاعیر لەم چامەیەدا درێژە بەواتا دەدات لەسەر حسابی ووشە، سیاقەکە کورت کراوەیە و نیگائەدا(یوحی) بەچڕییەکی بەڵگە ئامێزی بەرهەم هێنراوی بیّ کۆتایی ئائەوەیش شیعرییەتی‌یەکی بالاّی ئەوتۆ کە دەرنجامی بەرجەستە بوونی ژمارەگەلێك گریمانە بۆ تێگەیشتنی واتا و مەبەست دەبڕیّ بەبالاّی دەقەکەدا هەروەك دەبینی شاعیر لە پەیمانە گرەو ئامێزەکەیدا لەسەر زمان و نویّ کردنەوەی زمان هەروەها ئەو تەم و مژەییە (الغموض) کە ڕووبە ڕووی واقیع و خەیاڵی دەبێتەوە ئەمانەی هەموو تەنها بۆ ئەوەیە کە ڕەگەزی کوردی لە زمانێکی عەرەبی بەهێزدا پێشکەش بکات، هەروەك تێبینی ئەمیش دەکریّ کە لەچامەکەدا بینراوە (مەشهەدەکە) لە چەند ڕەگەزێکی دوورلەیەك پێکهاتووە لەو مەشهەدانەیشدا مەشهەدی یەکەم سادەیەو لە چەند ڕەگەزێکی بەیەك نامۆ پێکهاتووە و هەروەها ووێنەکەیش لەو مەشهەدەدا لەسەر ئاوێزەکردنی هەستی ڕووت دامەزراوە دواتر شاعیر ڕەگەزێکی مرۆڤی(تۆ- انت) دە بەخشیّ بەمەشهەدە گشت گیرەکە، بەلاّم لە بارەی کوردییەوە وادەر دەکەویّ شاعیر ژوانەکانی لەگەڵ کوردیدا لە دەنگی فیشەکدا دیاری بکات لەشتێکی ناماتریالیزدا وەك ئەوە وایە شاعیر لە ڕێگای دەنگ دانەوەی مەرگەوە بە کورد بگات یاقوتیش خۆی خودی شاعیرە یان خەیاڵی شاعیرە، شاعیر لە شێوازەکەیدا بەسەرکێشی گوزارشت لە چڕی بەڵگە ئامێزی دەدات دیوانەکەیشی دەخاتە ژێر ناونیشانی "سەرکێشی یاقوتەوە" "عاریفەکان لە گیرفانی چاکەتەکانیایدا(کستنانە) کەستانەی سوتانیان هەڵگرتووە بۆ ئەوەی ژیان بەلافاوی هەناوی نێرەکیسەڵدا بەرزبێتەوە

/نا ناتوانی/وەرە: یاسا وڕێنە دەکات لە هەڵوەراندنی ئاسندا/ دواتر ئازاد کراوێك لە دایك دەبێت لە هەڵهاتنی پێگەیشتنێکدا/ شەونخونیت شەونخونی شوێنە/ ئازارت بەڕەلاّیە وەك سۆزی پاشایان/ ئەوچپە کێشە ئامێزە تەم و مژاوییەت پێوەیە لە شتە دەرك پێکراوەکان دەکوڵێتەوە هەتاکو دەیان گەیەنێتەوە سەرچاوەکان.

زیافەتەکەت ئامادەکە لە تێکەڵەی جیوەو خوێنی لم/ تا نامۆی لە سەدەفی گەوهەردا ئامادە بێت/ هەرچیت پێخۆشە بیگێڕەوە/ ئێوارە باش و ئاسودەیە، شەوباش و ئاسودەیە، کازیوە باش و ئاسودەیە، بەیانی و نیوەڕۆ و بێزاری شەبەنگ ئەمانە هەر هەموو بە ئامانجە ئەزەلییەکەیەوە لە هەردوو مەمکی دایە" لە دیوانی(سەرکێشی یاقوت) دایە.

لە پاشەکی ئەو نامەیەدا کە سەلوم بەلێهانووییەوە پلەی ماجستەری تیادا وەرگرت جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە لێکۆڵینەوەی شیعری سەلیم بەرەکات بەشێوەیەك گران و سەخت و دژوارە کەوا لە تایبەتمەند دەکات لە ڕێگای بەئاگاییەوە بەهێزبێت لە لێکۆڵینەوەی شێوازی قسەکەری بالاّدا، دەرنجام لە کۆتاییدا هەندیّ لایەنی تایبەتی شیعری لە چامە گەلی دیوانەکەدا دەست نیشان کرد:

1- پێکهاتەی نامۆ و نەناسراو لە قسە.

2-شاردنەوەی شوێنگەی ڕاناو کەئەمەیش دەبێتەهۆی وورژاندنی گریمان گەلیّ بۆ تیگەیشتنی دەقەکە.

3-یەکخستنی دژیەکەکان(المتناقضات).

4-دابەزین لە مرۆڤ گەراییەوە بۆ نا مرۆڤ گەرایی بەپێچەوانەیشەوە.

5-کۆکردنەوە لە نێوان ئامادەبوون و نادیاردا(الحضور و الغیاب).

6-دیاری نەکردنی سنور بۆ وێنەکان یان بڕینی ووێنەکان.

شایانی باسە سامییە سەلوم لە پاشەکی نامە کەیدا نوسیوێتی: لەڕاستیدا سەلیم بەرەکات نوێکەرەوەیەکی بالاّیەو شایانی ئەوەیە کە زۆر بە قوڵی و چڕی لێکۆڵینەوەی لەسەربکریّ لەبەر ئەوەی جێگابە پەنجەی بالاّو دیاری هەیە لە زمانی نوێی ئێمەدا و جێگای هەموو ڕێز و شکۆیەکە.

## زمان نیشتمانی ئەو نوسەرەیەکە لەبیّ جێگایدا دەژی

**ناوی کتێب: أنقاض الازل الثاني/ رواية**

**نووسینی: سەلیم بەرەکات**

**بلاّفکار: دار النهار 1999**

**خوێندنەوەو نمایش: صابر وزین**

کتێب: ئاسەواری ئەزەلی دووهەم"ڕۆمان دانەر: سەلیم بەرەکات بلاّوکراوە: دار النهار 1999" هەرکاتێك سەلیم بەرەکات بەکتێبەکەیەوە دەگەڕێتەوە لەگەڵ کتێبەکەیدا دەمانگێڕێتەوە بۆ لای ئەو زمانە دەوڵەمەندەی کە شاعیر(بەرەکات) ملکەچێتی بەئەندازەی ئەوەی کە ئەوزمانە دێنێتە ژێر بارو رامی دەکات(1- تێبینی "تەنهابۆ ڕونکردنەوە" واتە سەلیم بەرەکات فەرلامانی زمانەکە جێبەجیّ دەکات و ملکەچی دەبێت بەقەدر ئەوەی کە ئەمیش زمانەکە ملکەچ دەکات و بەویستی خۆی هەڵ ی دەسوورێنیّ و تەوزیفی دەکات.

(ای يطبع اللغة قدر ما يستيطع ان يجعلها مطيعة)" ئەوزمانەی سەردەکەویّ بەسەر بەرەکاتدا ئەوەندەی بەرەکات سەردەکەویّ بەسەریدا.

لەگەڵ ئەزموونە نوسینە سەختەکەی بەرەکاتدا واڕاهاتووین کە بە قولاوی کرداری نوسیندا ڕۆبچین تاکو لەناوچوون.

نوسین لەلای بەرکات کاریکە لە مەرگ دەچیّ لە پێناوی زماندا هەتا مردن. لەبەر ئەوەیە دەبینین بەرەکات لە کارەکانیدا کامڵە، مەبەستم بە کامڵ ئەوەیە کە جیهان دەکاتە پێتگەل و وشەگەل.

گرنگ ترین بنەماکانی نوسین لای بەرەکات شوێن-زمان. ئەوە دوالیزمەی هزری- گێڕانەوەیە، دیارە هەرچی لق و پۆپێکیش کە لەمەدەبێتەوە لە واتا گەلێکی گەوهەری تر، ئەمانە هەر هەمووی لای بەرەکات بنەرەت و بنچینەی داڕشتنن. شوێن هەروەها کەمانای بێشوێنییەو ئەمە بەبەردەوامی دەگەڕێتەوە بۆ نوسینەکانی بەرەکات، بیّ- شوێنی گەلی کوردلا لە لایەکەوە، بیّ- شوێنی هەموو ئادەمیزاد لەلایەکی ترەوە.

**کۆچکردن و نەسرەوتن لە تەنها شوێنێکدا حاڵ و نەریتی مرۆڤبوو لەسەرەتای بوونەوە. نوسەریش ئەوە دەهێنێتەوە یادمان.**

**گەڕان بەدوای فەزایەکی لەباردا بۆ لەش و زمان بنچینەی دڵەڕاوکێی چەسپاوبووە.**

لە ڕاستیدا بوون نییە دواتر زمانیش نییە ئەگەر مرۆڤ سنورێکی دیاری کراوی‌نەبێت بە ئارەزووی خۆی هاتووچۆی تیادا بکات بۆ ئەوەی ئازادبێت لە هەڵسووراندن و بەکارهێنانی زمان و لەشدا بەو شێوە سروشتییە کە پێویستە.

بۆیە دەبینین سەلیم بەرەکاتی بێ شوێن ئەو بەرەکاتەی کە لە بوونی خۆی و زمانەکەی دەترسێ نوسینی کردووە بە نیشتمانی خۆی. ئای چەندە وورد و چوانە درێژباسی ئەو ژیانەی نوسینەکانی پشتی پێدەبەستن نوسینەکانی بە تەنها جەختکردنە لەسەر بوونی حەقیقی، بەزەوییەکەی و گەلەکەی و، دووری تەواو دوور لە خەیاڵێکی ویرانکارەوە. زمانی سەلیم بەرەکات پێویستی بەهەموو ئەو وویستگە ڕۆژانە بچووکانە هەیە بۆ پشکنین و دڵنیابوون لە خۆی و لە خاوە نەکەی زمان: زمانی بەرەکات لە لەناو چوون و گوم بوون دەترسێ، هەربۆیە بەرەکات بەکەرەستەی بژێوی ڕۆژانەو دیکوراتی ژیانی ئاسایی دەیژێنێتەوە بەڵام هێندە هەیە ئەم دیکورە کاتێك کە زمانەکە دەکاتە کارێکی هونەری باڵا دەسبەرداری ڕۆتینییەتی خۆی دەبێت، لە ڕاستیدا کاری نوسینی گەورەترین ڕۆڵی هەیە لە بەخشینی ووزەی ئیحائی و ووینەی پێویستدا بەووشەگەل و ڕستەکان بۆ بەرجەستەکردنی دەقی داهێنراو. لە ڕاستیدا دەنگ بەڵگەیەکی بینایی یە(برهان بصری) لەژێر گومەزی پێدەشتە نەبینراوەکاندا، لێرەدا نموونەیەك لە نموونە زۆرەکانی بەرەکات دەخوێنینەوە، ئەوکاتە ئەو پەیوەندییە بەهێزە دەبینین کە نوسەر لە نێوان دەنگ و شوێندا دەیخوڵقێنێ. هەروەها لێرەدا ئەو گرنگییە گەورەیە دەبینین

کە شاعیر گرنگی پێدەدات، لە کاتی گێرانەوی لە کاتێکدا کەدووڕەگەزی بنچینەیی لە نوسینەکەیدا دەگێڕێتەوە، کە ووشەو، ئەو زەوییەیە باسی دەکات. وەك ئەوە وایەکە دەنگ پێدەشتی دروستکرد بێت و پیتیش زەوی وونبوی خوڵقاندبێت. بەڵام لە واقیعییەتێکی برینداركەردا پێمان دەڵێ: لە ڕاستیدا ئەو پێدەشتانە بەبەردەوامی نادیار دەبن هەتاکو دووربن لەوەی بیان گەینێ ئەو پێدەشتانە بەردوام خەونێکی پرژوبڵاودەبن لەسەر لاپەرەکانی ڕۆمانەکە. نوسەریش بەبەردەوامی پارێزكاری لە کەشە گشتی‌یەکە دەکات بۆ کۆچ کردن، ئەوە ئەدا بەکوێی خوێنەردا کە کەسایەتیەکانی ڕۆمانەکە بەبەردەوامی لەڕێکردندان بەرەو شوێنێك. هەڵویستەی کورت تەنها وویستگەیەکی نەرمەو لە هەموو چرکەیەکدا نزیکە لە دارمانەە... لەوانەیە ڕۆژچەند هێڵێکی تیشکیان بۆبەرێ وەك چەند تۆپێك تلبنەوە لە هیوای مرۆڤەوە بۆ هیوای شوێن کاتێك بەرەکات لە ڕێگای لاپەرەدەنگدارەکانییەوە نیگاری ڕەنگی هیوای مرۆڤایەتی دەکێشێ، لەمراوی و قاز و تاوڵەو کۆگای کەلوپەلی میللی دەست پیدەکات، هەروەها باسی بەروبوم و دانەوێڵەو گشت کاڵا و قاپ و قاچاغی بەر دەست دەکات ئەمە هەرهەمووی لەبەرئەوەیەکە ئەم تروسکە ڕووناکییە بریسکێتەوە و ئامادەبێ لە باتی شوێنە وونبووەکە.

**ئەگەر لە کاتێکدا کتێب بووبێت بەزەوی بۆ هەموو نوسەرێك، ئەو ڕۆمانەکانی بەرەکات وەك ئەونیشتیمانە وایە و ئەلتەرناتیفی کەسایەتی یەکانییەتی. بەرەکات لەڕێگای گیرانەوەوە(السرد) هەوڵئەدا پارێزگاری لە زمانە کوردییە شاراوە کە بکات هەروەها پارێزگاری لەو زمانە عەرببیە دیارەیش بکات کە نوسراوەتەوە، چونکی هەر چۆنێك بێت زمان بەبەردەوامی تاکە زەوییەیە کە دەکرێ تاپۆ بکرێ وسنوری بۆبکێشرێ، بەڵکو زمان ئەو تەنها شوێنەیە کەڕێئەدات بەوپەری ئازادییەوە هاتوو چۆی تیادا بکري، بەڵام هێندە هەیە کە ئەویش سەخت ترین ئازادییە لەبەر ئەوەی کە زمانیش پێویستی بەگرنگی پێدانێکی ڕاست و بەردەوامە بۆ ئەوەی ئەو شوێنەیش وون نەبێت.**

کۆمەڵێك لە ژنان لە بەردەم تەونەکەدان هەر لەبەردەمیشیا لە دایك دەبن و گەورەیش دەبن، ئەو ژنانە گیانە خوازراوەکانی خۆیان دەگێرنەوە بۆ چراگەلی زەلامە نادیارەکان بەبێ ئەوەی چنگیان لەسەر تەختەکانی قەراغ هێڵەکان خاوبێتەوە مرۆڤی کورد هەر لە ڕۆژی لە دایك بوونییەوە هەتا دوا ڕۆژی ناچار کراوە کە زمانەکەی خۆی بپارێزێ لە ڕێگای بەکارهێنانییەوە بەبەردەوامی و بەێ ماندوبوون، هەروەها لە گرنگی پێدانی لەلایەن ئەو کەسەوە کەسەرلەنوێ لە هەموو کارێکدا دای دەڕێژێتەوە، بەڵام مەرج ئەوەیە کەوییست و ماندونەناسی پیادە و بەرجەستەبێت.

ئایا ووێنەی ئەو ئامێرو تەون و چنینانە ڕەنگدانەوەی ئەو زمانەنییە کە بەرەکات دەیچنێ و هەموو جارێکیش بەو پەڕی دانای و ئەوینەوە دەیچنێتەوە، کێ لە پیتووشەدا گەورەترین هیوا دەبینێ بۆ گەلێك کە هیوای وون کردووە گۆشەگیری ژنان جێگای حەوانەی مراوی و قازیشە ئەوان لەگەڵ خەیاڵی تەوندا ڕێککەوتوون ئەمانە دوو باڵندەن کە دەزانن تەونەکە بە خەیاڵی خۆی چنراوە کە بۆڤیتنەی عەبەسی ڕادەکێشێ.

ڕەنگ بۆشایی‌یەکە ژنان و مراوی‌قاز و دیجلە خۆیانی پیادەکەن، ئەو کە نارانەی کە خۆیان مەڵاسداوە پڵنگ گەلێکن لە کرۆکی وونبوو نە ئاشناکاندا.

ووێنەیەکی نایاب و قەشەنگە بەرەکات ئەوهزرە بنچینەیانەی کەپەیوەندە بە زمان و وونبون و بۆشایی بوون و ووێنەتێك ئالاوەکان هەر هەمووی پێدەستەبەر دەکات.

چۆن خوێنەر لە خشتە ناچێ بەفیتنەی عەبەس، بەو ووێنە لە خشتەبەرە؟ چۆن لەخشتەناچێ بەو مراوی و قازەی(ئەمانە دووڕەگەزی واقیعین کەوەهمی زمان (چنین) حەقیقەتی دوورەپەرێزییان ڕێکخستووە؟ ئۆن خوێنەر لە خشتە ناچێ بە بۆشایی ڕەنگ؟ ئەو وێنە کۆدژانەی(المتناقضة) ئاماژە بۆ ئەو ئیشەهونەرییەدەکەن ئەگەر بەشداری کردنی کەرەستەکانی ژیانی ڕاستەقینەی هەست پێکراو نەبوایە وەك ئەو ئاژەڵانەی چەندان جارباسیان دەکرێتەوە هەروەها ئاووکەناری ڕووباری، ئەوە خاوەنی‌کەیان دەکوشت بەڵام، تێکڵکردن و لێگۆڕان(الالتباس) بەهەموو پۆشراو نادیار و نهێنییەکانییەوە بەبەردەوامی لە نێوان نوسین و ژیاندا بەرجەستەیە، ئەوەیش بۆ ئەوەی کە ڕێکەوتنی تەواو نەیەتەدی، بەتایبەتیش لە کاتی وونبونی زەوییەکی ڕوونی چەسپاوی مەعقولدا نوسەر دەگەڕێتەوە لە هەموو شەبەنگێکدا ویڵبوونەکانی شوین دەبینێ کە بە تاڵە دەزووی ووێلگەلی زمان چنراون.

# دیلانا و دیرام

سەلیم بەرەکات

بەرانە کێوی لەسەر گردەکەیە
وەستان یان بڵێین سرەوت(سکون)
هەروەکو بەرانەکیوی
شاخەکانی بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوە
کاکی ڕێبەر(الدلیل) لەوە زیاتر نزیك
مەبەرەوە، لەوەیش زیاتر دوورمەکەوەرەوە،
شوێنەکەت ئەو شوێنەیە کە دەتوانی
ڕەگەکان ڕەگەکانی لێوەببینی،
زەوی میراتیانە.
بەرانەکیوی لەسەر گردەکەیەو،
سرەوت پتەوونەلەخشاوە
هەروەك بەرانەکێوی شاخەکانی بۆ ئاسمان
بەرز دەکاتەوە

(1)

دیراما بڕوانەبۆی ئەوەتا لە ژێر بریسکەی خوێنی تۆدا زەمیلە سوورسپییەکان کۆدەکاتەوە، سەیری بکە چۆن باڵی تۆی داپۆشیو، هەناسەکانی وەك پارچە ئەستێرە دەیکاتەخەو لەدامێنی پیاوەتی‌یە خاوێنەکەی تودا یەکەیەکە هەڵدەوەرێن.

دیراما ئەو کاتەت نایەتەوەیاد کە هاتی بۆ لای و دڵفرێن بویت و پێدەشتت لەبەردەکرد، ئەوکاتە هەنگاوەکانت هەنگاوی ڕۆژبوو، دەنگشت دەنگی گوڵەگەنم؟

دیراما ئەو نێوارەیەت دێتەوەیاد کە نێوارەی یەکەم لە نیو چاوەکانتا دەدروشایەوە، ئەوەبوو ماچتان داباران بەسەر گەنجینەی بوونەوەردا، سەرچاوەی نامویتان لە ژێر بەردی ڕۆحدا دۆزییەوە؟

هێی بە دیلانا هێدی بە لە یاریکردنی جادوگەریتا بە هێلانەکانی دڵی دڵە هەڵواسراوەکەی دیلانا لێدانێکە(طنعة) سیخناخە لە ژیان.

(2)

دیلانا بڕوانە بۆی، دیرام تیرێکی سوورسپییە لە ژێر بریسکەی خوێنی تۆدایە.

دیلانا تەماشای کە چۆن بەنرکەی ئاسنینی پیاوەتی خۆی سەر لە نێواران دەڕازێنێتەوەو، پەیژەی هەناسە برکێیش بۆ دەنگی تۆ بەرزدەکاتەوە، وەك ئەوە وایە هەموو ئەو ووشانەی سرودیان پێدەچرێ سروودی پیاوە. ئەی بۆچی ئەوەی بۆ ناگێڕێتەوە کە هەور بۆ کیژەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەی بۆ شیرینی باڵای بەسەرا ناباڕێنێ و، گەمەو خۆشی لوتکەکان هەڵکیشی و بییان نوێنی بۆ ئەوەی پێدەشتی دڵی بەگەنمو سرود داپۆشی؟ وەرەدیلانا ئەوەتا ئەو-دیرام- لە نزیکی دەستتەوە شانی داداوە.

(3)

دیرام بڕوانە بۆ دیلانە، چەندان جار بەگزنگی لێووسەر پەنجەکانی گەمەی لەسەر سنگت کردووە. بڕوانە بۆ دیلانا بیست دڵ لە ژێر

دڵیادەبینی، هەموو دڵێك لەوو دلانە وورێنە دەکات و وەنەوشە لەورێنەکەیدا بیست دڵ هەیە: ئەوەچاوگەی ئەوپیاوەیە کە بۆنی بەڕەگ و ڕیشاڵەکان خۆش بوو بوو؟ ئەوە چاوگەی کاتژمێرەکانی دیالۆکە؟ چاوگەیەکی ترە بۆ هەموو ئازایەتی یەك یان بۆ ترس دیرام لەوە زیاتر نزیك مەبەرەوە، لەوە زیاتریش دوورمەکەوەرەوە. ئەوشوێنەی خۆتە کە دەتوانی خودی ئەو شیرینییەی لێوەببینی کەلەسەبەتە گەلێکی سوورسپی و خوێنێکی سوورسپیدا نوستووە.

دیلانا کەمێك ڕاپەرە و گەمارۆ تەڕەکەت توندبکە، تۆ ئەو دارستانەی کەنەوەکانی ئەو تیادا گەشەدەکەن و هەناو تێکەڵ بە باڵندەکان دەبێت. تۆ دەنگێکی لەنێوان دەنگەکاندا، ئەگەر دیرام دانەوییەوە بەسەر تا بەرز بەرەوە بۆدەمی مێینەی و، بۆسنگە لەرزوکەکەی کە قەڵغانە بۆسنگی خوێناویت بەهەورگەل و سەردەمەکان دیراماکەمێ ڕاپەرە، ڕاپەرەو ڕاوەستە بۆ ئەوەی لەبەرزاییەکانی گەمەو خۆشی یەوە بناری پان و بەرینی مێینە لە نێوان بریسکەی دەمامك گەل و گۆرانییەکاندا ببینی، تۆ شمشێری کانیاوو سەرچاوەکانی ئەویت و ڕاتنەکێشی ئەتدابەڕووی بەیانیاندا و لە تلەتدەبێ و لە شەقەکانی سۆز و بەرانەکێوی دێنەدەرێ. دیرام تۆ هەناسەکانی ئەویت لەنێوان هەناسەکاندا و ئەوستایشەی کە هەوا خواوەندە دەربەدەرەکانی تیادا نوقم دەکرد ئەگەر هات و چەمایەوە بەسەر تادەمی ئەخشێنراو چنراوت بە سرودی پیاوان بەرز کەرەوە بۆ دەمی، سنگەلەرزۆکەکەی قەڵغانی ئەوسنگەی تۆیە کە بە ئاووستایش چنراوە.

دیلانا بڕوانە بۆی، بڕوانە چۆن باوەش دەکات بەهەورە بروسکەداو لەسەر جێگاکەت بای شەماڵ بڵاودەکاتەوە. دیلانا سەیریکە چۆن بە هەناسە سواریتا وەك بەروربوم شۆڕبۆتەوەو، تەڵەزگە بۆ ڕووەك دادەنێ، وەك ئەوە وایە شمشێری ناو شانازی بەتۆوە بکات. بڕوانەچۆن وەك وشکانی وەك بیابان دەووری ئاوی داوە، بۆ ئەوەی لیدانی دڵە هەڵهاتووەکەت لە ئاودا گەمارۆی کەرەو کەڵەکبدات.. بەڵام کاتێ: سەر لە نێوارە تۆڕەکەی دەکاتەوە جیاوازە لە تۆڕی ئەستێرەگەل و باڵندەماسی گرەکان.

دیلانا وازی لێبێنە بابێ ئاگا بێت لە صێش بینییەکانی، وویڵیکە دیلانا، ئەو هەر تەنها مشتێکی تر لەزەوی هەڵدەگرێ، بەتەنها هەربالی جووتەمەمکی تۆ دەبینی سێبەری نێوارە و نێرێتی دەدا بەسەر زەویدا.

(7)

دیرام بڕوانە بۆ دیلانا، بڕوانە چۆن پۆلە قازەکان لەبەردەمی دڵی تۆدا کۆدەکاتەو، هەوردەچنێ. دیرام بڕوانە بۆی مێگەلەکەی پێش خۆدا وە لە کۆتایی دامێنەکانی چیاوە دەستی لە دەستی ئاسۆی شوان دایە(الافق الراعی) کراسەکەی هەڵدەکاو ئەوڕەگانەی بەرزەوی ناکەون دەردەکەون کاتێك کە جۆگەکان بەباز دەبڕی- بەڵام بەر ئەو ستایشە دەکەوێ کە هەموو ڕەگەکانی پێدادەپۆشێ.

ئەگەر هات و بینیت دەستی خستە دەستەوە تۆیش دەستی ئاسۆبگرە(الافق)، ئەگەر بینیت گرتەباوەش ئەوکاتە ڕەگەکان تۆ لە خۆیان دەگرن بۆ ئەوەی بە هەناسەکانت بەروبووم تیرەبارانی بەربووم بکات، یان بۆ ئەوەی زەوی بەخێرای ڕاکابۆلات و لافاوە بەخورەکەی لە شێرو شێوەکان هەڵکێشێ دیلانا بە ئاگای بێنە، هەڵیسێنە لەو خەوە کە

بەشیرینی هەزار دڵی مەست ڕازاوەتەوە، دیلانا بەیانیش هەڵیسێنە لە گەڵیا بۆ ئەوەی هەردووکیان پێکەوە بێن بۆلات و خۆلاویین بە شەهوەت و بەپیت و فەڕوشادی. ئەم دواین کەسە کەدەبیینی وڕێنە دەکاو فویش بە کەڕەنا ووڕێنەکەرەکاندا دەکات پردەپێت وەك یانەبە پاڵەوانێتی کاس گەڵی خنکاو، ڕاوەستە لە هەمان جێگا هاتن و هەڵکردندا لە جێگای دێرینی هاتنی ڕەگەکاندا و شادمانی کێوی بەکێوی یان درندە بەدرندە. ئەوە دوا کەسە کەتۆ دەیبینی، هاتن بەرەو لای تۆ هەروەك ئاماژەیەك زریان هاویشتبێتی بەر لەوەی کڵاوە خوێناوییەکەی لەسەرکات. سەر زەنشتێی خوانەتە توندەکاتەوە، قاپ و قاچاغ لەسەر بەردی ڕۆح بڵاودەکاتەوە، هەڵیسێنە لەخەو دیلانا هەڵیسێنە.

(9)

دیرام ئادەی دیلانا لە خەو هەڵسێنە، هەڵیسێنە پەپولەی نەبینراو(فراشە الغیب) و شاهەنگە ئاڵتونییەکەی دیلانا هەڵسێنە لەگەڵ بەرد بە بەردی ماڵەکەدا هەڵیسێنە، دواتر ئەو گۆرەپانەی چوار دەوری ماڵەکەی داوە هەڵسێنە. ئەگەر حەز دەکەی لە هەموو ئەمانەدا بەیانی یە خەوتووەکە لەخەو هەڵسێنە. بڵێ وەر دیلانا. وەرە بۆ ئەوەی ڕووناکی سەرسورماو لە زەوی ببینین ئەو کاتەی کە زەوی ئاسان و قەشەنگی لەسەر ئەسپەری مرۆیی ئێمە هەڵدەڕژێ. هەتاکو دوای ئەوە جووتەمەمکی خۆمان بدۆزینەوە و بگینە کێڵگەکان، بلەرزین لەبەر شیرینی ڕەمەکە کاتێك ڕۆدەچێت لەوجێگەی کونجی و زەعفەرانی لێوەدێ، وەك ئەوە وایە هەوڵدەین پێکەوەببینە برین گەلێك کە دوای ئەوان برین گەڵی ترنەبێت.

دیرام وەرە دیلانا هەڵسێنە.

(10)

دیلانا دیرام لەخەو هەڵسێنە، ئەو کورە هەڵسێنە کە لە ژێر ئەو گزنگەدا بەسەرسنگی ڕووتیادا دەباریێ گینگڵ ئەدا، لە خەوی هەڵسێنە، دواتریش دۆلچەکەت پڕ کە ئەو دۆلچەیەی مێگەلەی بەیانیانی پێ ئاو ئەدەیی- دولچەکەت پربکە لەو قۆزاخەی ئاوریشم و تووەی لە ستایشەکان دادەبارێن، بۆ ئەوەی‌ئەوشیرینییەی بەدەوری دیرامدا هاتۆتە خواری و شۆڕبۆتەوە بە ئاوریشم و تووبدووری. دیلانا دیرام لە خەو هەڵسێنە، هەڵسێنە.

(11)

هۆدیرام دیلانا هەڵسێنە، لە ژێر برژۆلەکانیا خەونەکەلە خەوی هەڵسێنە، دواتر برێکات بدەرە دیلانا بۆ ئەوەی وەك کانی‌شەپۆل بدات و بازنە بازنە فراوان بێت، هەمووبازنەیەکی عارەبانەیەك بێت، لە عارەبانەکانیش دانەوێڵەو ڕێگەلیان تیابێت بە ئاگابە توخودا ئائەوە پەیکی دۆڵەکانە و هێشووەکانی هەورتان بۆ دەرنێ و لەسەر پەرژینی ماڵی منداڵی خەزامی بڵاویدەکاتەوە، هۆدیرام دیلانا هەڵسێنە، لە خەوی هەڵسێنە.

(12)

دیلانا دیرام هەڵسێنە، هەڵسێنە دەمامکی گاڵتەجار- ئەوکورەی چواردەوری تەنراوە بەداس گەڵی خواندەکان. دیلانا لە خەوی‌ هەڵسێنە بۆ ئەوەی شەونمی بەرەبەیانە بزێوەکەو حەزەگاڵتە جارکانیتان لەدەس نەچێت، خۆ لە وانەیە ئێوە زانیبێتان کە شەونم لە ناو گژوگیادا دەحیلێنێ‌و، کەرەنایشی هەیە بانگەشە بۆ هەرتەقەو (الهرطقة) لەدین دەرچوون دەکا ئەم قۆناغە بۆ خۆڵی شادی ئامێزە. دیلانادەی لە خەوی هەڵسێنە، هەڵیسێنە.

(13)

هۆ دیرام دیلانا لە خەو هەڵسێنە، هەڵیسنە ئەم فیزە ئاسمانییەو، خۆشەویستی چێشتهەنگاو شتگەلێکی بەبەهای پیادا بپرژێنە. ئەگەر هاتوو دیلانا لەبەردەمتا ڕاوەستاو بە ئاگابوو داواکە بێتەڕوو و، درکەوێ وەك ئەوەی کەڕوو وەك، دەردەکات پێکەوە دانیشن ماچ سێبەرتان بۆ دەکات، گۆرانییەکان لە خشتەتان دەبەن گۆرانییەکان دیرام دیلانا هەڵسێنە، هۆ دیرام هەڵیسینە دیلانا.

(14)

هەڵیسێنە دیلانا دیلانا گزنگی مرۆی هەڵسێنە-دیرام- کاتێك کە مەست لە قەشەنگی ئێردێتە خواریێ، ئەکەی دەستەکانت یان هەناسەبڕکی وەك پەردە بگێڕی بەسەریا، با ڕوونبی و دیاربی و لە تەنکێتیا (شفاتە) هێشووە خونچەکان دەرکەون، دەست بەسەر هەر هەموویابگرەو بیکەرە مولکی خۆت، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەیش کە تیایدا دەردەکەون، ئەتوانی ببیتە حەشارگەی مرۆی بۆ ڕوو وەك و هاوپەیمانەکانی وەك هەورو باڵەکان. هەڵیسێنە دیلانا دیرام هەڵسێنە.

(15)

هۆ دیرام دیلانا هەڵسێنە، خوێنی زیندو شێوەکانی‌هەڵسێنە، بۆ هەڵسانی دیلانا تا حەگولێنەیەك لەسەردە لە کۆمەڵێك کویلە پێکهاتبێ، دیلانا بە ئاگاهاتنەوەی تەختە(یقظە عرش) لە ژێر دەسەڵاتیدا سەر چاوەکان نزیك دەبنەوەو جۆگەکان خۆدەشۆن کاتێك کە تیر ئەندازیدەکەیت دیلاناکەوانی تۆیە و تیری پێدەهاویژی- هەر هەمووخودی خۆت لە دواین سرودایە، هەڵیسێنە هۆ دیرام هەڵیسێنە.

(16)

هۆ دیلانا دیرام هەڵسێنە، خۆش گوزەرانی- زیادەرەوی- و ها وریکانی هەڵسێنە، ببینە ئەو کاتەی برژۆڵەکانی لە باڵندە دەکاتەوە، ئەو بە ئاگاهاتنێکە کەتەنها بەیانییەك دەبینێ، دەستی گرتووە بە دەنگ و هارەی ئاوەوە، ئەو کەوانی تۆیەتیر ئەنازی پێدەکەیت کاتێك تیردەگریتە هەموو سۆزەکانت(رحمك كله) لە دواین سروودا.

هەڵیسێنە دیلانا هەڵیسێنە.

(17)

هەڵیسێنە لە خەو قەلەڕەشی کەرە(غداف الزبد) دیلانا خورجەکەت والآکە ئەوکاتەی گینگڵ ئەدەی لەبەر خۆتو کەو تەزووی خوێنی بەیانیانیت، تۆ بە هەوورێکی ڕووتەوە پێشوازی لە خوێنی ئەودەکەیت.

هۆ دیرام هەڵیسێنە لەخەو، هەڵیسێنە.

دیلانا دیرام لە خەو هەڵسێنە...

دیرام دیلانا لەخەو هەڵسێنە..

ئەم ویست لەو بەیانییەدا زەوی‌لە خەو هەڵسێنم. زەویش ئەیوست من لەخەو هەڵسێنێ. هەرکاتێك ئامازەکان کامڵ بن هەموو شتێیەك تێدەپەڕێ، ئەوەی دەست بە چمکی ئالینەوە بگرێ ئەوە ئالێن دەڕوات لە گەڵیا بەو جۆرە دیلاناو دیرام ڕۆیشتن- ئەم ویستنەو بەیانییە زەوی لە خەو هەڵسێنم زەویش ئەویست من لەخەو هەڵسێنێ.

ئەوکاتە دیەم سیخناخ بوو لە کوڕ وژن، ڕێبەری ئەوان بووم-دیلاناو دیرام- ڕێبەریکی لاڵبووم، ڕێگاکانی شەونەم بۆتیرەکانیان وازدەکرد ئەوەبوو لە نێوان دەنگ و تاری خونچەکاندا پرش وبلاوبوونەوە، خونچەکان دەکەمە ئاهەنگی ئاوارە. بەلام ئەو رووگانەی لێم وون کردن بۆ ئەوی بە دلی خۆیان گورانی بچڕن و بخوێنن. شورەم گێڕا بەدەووریاندا، کوت وپڕ شوێنەکە بەرز بۆوە بۆ پلەبەرزەکان کەتیادا بەردبەسەربەردا سەردەکەوت، دەمامک، دەمامک، لەپڕا دیلاناو دیرام خلتانی خوینبوون لە پشت قەلغانەکەیانەوە قەلاگەلێک لە هەنگوین درزی داو شەقی بردو، ڕۆن و غەرانیق خۆیان کێشابەبەرژانگەکانیانا. نەخێر ئەو بەیانییە نەم ویست زەوی لەخەو هەلسێنم، زەویش نەیوست من لەخەو هەلسێنێ بەلام من وەک چاوساغێک ریبەری دووعاشقم تەنها بۆ بریسکەیەکی تالدەکرد، ووتم بیگێڕمەوە ئەوەی کە روویدا، هەروەها ووتم لە کۆستەکەوە دەست پێدەکەم بەو هیوایەی ببێتە دەرێک بۆ گەیشتن بە شیرینی، ئەها کاتێک بۆ گەیشتن بەشیرینی، ئەها کاتێک کە رووداوەکە دەگێڕمەوە چەند ڕەگ و ریشالێ خوێنی سوروسپی لەگەلمنا دەیگێڕنەوە، هەموو پێکەوە کۆبوونەوە، پرچگەلێک لە پێگەی ستایش ووتم: لەوێوە دەستپێکەم کە تەپووتۆز دەووری سەبەتەکانی دیلاناو دیرامی تەنیبوو، ئەو کاتەی لە چنینەوەی دومەلان دەگەڕانەوە وو پرچیان تۆزی هەلالەی گژوگیاو دانەویلەیان لەسەربوو، وەک ئەبوو خۆیان بەگول شۆردبێت گولەکانیش گرکانی گەمەو ئارەزووی خۆیانیان پێ سپاردن، وەک ئەوەی لەناوگژوگیاکەدا ماچیان لە بیرچووبێت گژو گیاش غاری داو ئەوەی کە لە بیریان چووبوو بۆی بردنەوە ئەوان گەڕابوونەوە.

زەویش بە دوورێنەی ڕۆژانەی گەڕابۆوە بە خۆی و هەزار گولەگەنم و هەزار بلێسە و هەزار داستان کە قارەمانەکان چارەنوسی خۆیان تیادا جێهێشت بوو لە ژێر شەپۆلی نەبینراودا، هەروەها هەزار قەلغانی کونبوو هەزار هەورە تریشقەی بەماچ تەڕبوو، بیست پیاویش کە دیلا ناو دیرامیان تیرە باران کردبوو خۆلەمێش چەمابۆوە بۆ ئەو سرەوت و بێ دەنگییەی کە لەسەر ڕێگاکەیدا سەرچاوە و کانیاوەکان پرش و بلاو دەبوونەوە و زریانی گولەمێخەکی دەهێنا. ئابەو شێوەیە کوڕێک و ژنێک دەڕۆیشتن.

من وەک چاوساغێک ڕێبەری دوو عاشقم بۆ باتیلێکی شیرین (باطل عذب) دەکرد، من دەمزانی ئەوەی دلدەکاتە میرات گری دەردوبەلا خوێنی دلدەرێژێ وەک نهێنییەک کە وریێنەکەر ئەیدرکێنێ. بەلام بەرپەرکردن- خۆیان پێچابوو لەچەخماخە گەلێکەوە کە دەمیان بەخەرمانەکانی تالی دەکرایەوە ڕووبەڕووی جوانییەک کە هیچ کەسێک نەیبردبوو بەمیرات، لەوێدا ووتم خورچەکەت بکەرەوە وەک ملەیەک لێوەی بروانی بۆئەو ووشکانییەی لە دەرگای ئاوئەدا لەسەر ئەسپەری ئاوەوە، ئێوە دووعاشقن، ئەزری کەلەپیاوێکن بۆ جوانی. من ویستم بەرزاییەبخەمەڕوو وەک چاو ساغێک کە ڕێبەری دووعاشق تەنها بۆ شێوەنی کۆمەلێک پرد بکات، کەوتە بەرچاوم دیرام چێشت هەنگاوێکی بۆ دیلانا دەگێڕایە کە ناگێڕرێتەوە چێشت هەنگاوێ کە سەدەکان(القرون) دەیرفێنن لەهەموو لێوارێکی لێدانی دلێکەیان تەورێک لە تەورەکانی سۆز. بینیم دیرام بەچۆکاهاتبوو هاواری لە ئەسپەشاراوەکان دەکرد ڕاپەڕە، ڕاپەڕە، ستایشەکان بەهاواردێنی، ستایشەکان بەدەنووک نیشانەی شیوەن لە

دەستی دەقۆزنەوە. توخوا توخوا دوای ئەمە بانگم نەکەن، باسی رووگەبەرووگەی زەوی دەکەم و، هەروەها بروسکە بە بروسکەی ئاسمانیش، من درێژەی چیرۆکەکەم ئانا لەمەودوا بانگم مەکەن، مەرگ بەمەرگ بگێڕمەوە، شیرنی بە بۆشایی پێپەستکەم وەک سمی هێستر، بەلام ئێوەکە لەسەر شوورەری ئاوابوون (المخیب) دانیشتوون بروانن دەبینین کە بیست پیاو دیلاناو دیرام بەعاباکانیان دادەپۆشن بەرلەوەی تەنها هێلێک خوێن چۆگەبەستی و ئەملاولاکات لە نێوان بەردو پووشداو، دواتر لە کۆتایی چۆلە وانییەکەدا ئاوابێ.

ئابەم شێوەیە ڕۆشتن کوڕێک و ژنێک وێشتن. هیچ کەسێک شتێکی نەووت، هیچ لێوێک نەبزوا بەو قسەیەی درەختی ستایشەکانی بەخوێن نەخشان. (لەوگێژەلوکەیەی دوایدا کە شارەکانی بەمۆری نەزان مۆرکرد، شێخەکان ڕۆحی خۆیان بە تاری قوڕدا دەپۆشن، قەلغانی خوێنیان گەڕاندەوە لەدوای ئەوەی گێژەلوکەسیمای منالی لە شتەکان دارنی شێخەکان مانەوە بەپێوە ڕاوەستان، وەک شاخێک(قرن) لەسەر جومگەی گایەکی مردو، لقوپۆپی سپی و منارەگەلی سپی بەدەووریاندا شۆڕبووبوونەوە و هاتبوونە خوارێ، لەبەر ئەوەی ئەوان دوا میرات گرن، کەشتیوان گەلێکن لە کەرەولایەک (بۆ ڕونکردنەوە: دربابنة من زبد یدیرون دفة لاتری ای انهم متکونون من زبد) بەرێوەدەبەن کەنابینرێ، دیلاناو دیرامیان دایە دەست بیست مشت و رووخساری بلێسەی شیرینمان بەمۆری نەزانین درێژ کردەوە.)

بەم شێوەیە هەردووکیان ڕۆیشتن، لەو گێژەلوکەیەی دوایدا کە نەزانەکان بۆ یەکەم جار شکۆی خۆیان پێکردەوە، من ئەو ڕابوردووە دەگەڕێنمەوە دواوە بۆ ئەوەی نا بیگێڕمەوە و باسی بکەم، بەلکوبۆ ئەوەی ئەو ستایشە کە زەوی کردبومی وەک ڕێبەرێ بۆ دووعاشق بیسڕمەوە و لای دەم لەسەر خۆم.

توندرەوبووم لە تالان کردنی دلیاندابەشمشێری هەنگوین هەرچی دەگێڕمەوە دەیگێڕمەوە بۆ ئەوەنی یەبیگێڕمەوە و باسی بکەم، بەلکو بۆ ئەوەیە بگەڕێمەوە بۆ شوێنی نەزان، لەوێ نەزانەکان لە ژێر چەند ستوونێکدا دانیشتون، کۆمەلی شێخن دێرەکانی ئاسۆو دێرەکانی خۆلەمێشیان لایەکسانە ئاخ دیرام تۆ کوڕێک بووی لە پێدەشتەکان هەلاتی و خۆت ئالا ن لە هەورەتریشقەی پێدەشتەکانەوە، ئاخ دیلاناتۆژنێک بووی هەلهاتبوو لە مێردەکەیبۆ هەلبژاردنێک(خیار) نەخێر هەلبژاردن نییە بۆ شەمالێک کە ژنێک و کوڕێک هەلهاتبن تیایا وپێکەوە پەیمانی لێدانێکیان(طعنة واحدة) بەستبێ، ئاگریان بەردابێتە ووڕێنەی شوێنینەزان. نێ ئەی شوێنی نەزان ئەی شوێنگەی بەستنی پەیمان بە سولتانی هێزو دانای مردۆکان؟ ئەی ئالەی هەموو تێکشکاندنەکان ئەگەر تێکشکاندنەکان بەشیوەن داپۆشرێن و بەشێوەنیش بلاوبکرێنەوە، چۆن دوای سەرتاکە بکەوم؟ چۆن دوای ژنێک و کوڕێک بکەوم لەو شوێنەدا، تیادا دەربەدەرکرابوون هەتا چێشت هەنگاوێک کە لەسەر فورمەکان هەلنایەت، بەلکو لەسەر ماچ هەلدێ؟ چێشت هەنگاوێکی سووک وەک قامچی حوشترەوان و، دەخوڕێ بەسەر هەلوگەلی شیرینیدا هەلوگەلیش بەدەنگ دێن، دەخوڕێ بەسەر ڕەگەکانداو ڕەگەکانیش غار ئەدەن بۆ لای شێتییە گەورەکە نەخێر شوێنێک نەبوو، نەتتوانی ماسی گرەکان ببینی،

دوای گاڵتــەجاری بــەناکان لەبەرزاییــەکاندا. ئەوکاتــەی ئاســۆیەك بــە هێشــووەکانییەوە شــۆڕبووبووە لــە کۆمەڵــە کــە پرێکــی نادیــارەوە. هەردووکیان، ژنێك وپیــاوێك ڕایــان کــرد یــەکێکیان تەختەکــەی و کوونــە ناوێك و ئەو کولێرانەی کەسەرپەنجەی ڕەگەزەکان نەرمی کردوونەتەوە بۆ ئەوەی تریان هەڵگرتبوو ئاوەها هەردووکیان پێککەیشتن. ئاوەهادەم تامی مێووژی ووڕێنەی چێژت و دڵڕیرەوی لەپەڕی سەرگێراو بە کۆمەڵە مستیلە پێشکەش بەدلدەکات. ئێستا ئا ئەوە زەوییە(ئاواهی دەیگێڕمەوە) ئەوە سەرچاوەکانەو چەژی بوونەوەرە بۆ ڕاوکردنی بوونەوەر: هەموو شتێك لە ژیاننامەیەکی سەرسوڕماوایە، مێوە لەسەر سوڕمانی ڕەگەکاندا لە یەکەم دەنگدا مێوە لەبەرسەرسورمانی ڕەگەکان شیدەبێتەوە، من ڕێبەری دیلاناو دیرام بووم ڕێبەرێك ڕووگەکان بەخۆشی دەدوورم، کلیلەکانی فرێنەدا بۆ هەورەدیلەکە، بە تەنها هەردوو دڵی خۆیان نەبێ بە توندوتۆڵی وەك پۆەند لەسەر شیرینی هیچی تـر نـابینن، کـاتێکیش ئاوڕنەدەنـەوە بێجگـە لـەو عاشقەی کە بە هەناسە بڕکێی خۆی مستیلەی عاشق کۆدەکاتەوە.

(دیلانا مۆرەکەی خۆتت لەبیرە؟ ئایا دیلانا ئەو ئەومۆەت دێتەە یاد کە مشـتوویەکی قورینـەی دەنگداری هـەبوو؟ ئایـا دێتــەوە یـادتت وەك زار بەلارولەنجـەوە لەهـەوادا بـەدەورتادەهات، ئـەوە بـوو دەسـەڵاتی ئـاوی دابەسەرتا.

کێڵگەکان؟

ئاخ تۆ چەندێك بچوك بوی ئەوکاتـەی بۆ یەکـەم جار هـەردوو دەستت بەرزکردەوە و سیخناخبوون لە خـەرمان و دەنگـی تێکـەڵ، ئای‌سوپاگەلی سـۆز نـامێزو ســەربازگەی‌ئەرخەوان چـەندێك نزیـك بوونـەوە لـە پشـت سێبەرەبچووکەکەتەوە. تۆیش ئەودەمەمێگەلەکەت بڵاوکربۆوە بۆ لەوەڕ بۆ ئەوەی ڕەدووت کەون، وەك ئەوکەسەی لە نزیك داوەکەیـەوە نانـەووردەبۆ ڕیشـۆڵەگەل بڵاوبکاتـەوە، بـەڵام ئـەو-دیلانـا- لەسـەر کڵاوخـودەی ئـەو کەسـانەی لـە غەیبـەوە هـاتبوون شـانی دادابـوو شـارەکەی‌بەچراخانی نووسین ڕازانبۆوە، تۆیش بەدەربەدەری و ڕەهەندەی مابوویتەوە ڕەهەندی بـەناگایی لەناوەڕاستی تاریکی‌یەکی قۆشمەدا. هـۆ دیـرام تۆیـش کـاتێك گوێبیستی دەنگـی ئـەو سـەرچاوانە دەبیـت کـە بـە سـەبەتەکانیانەوەغار ئەدەن و هەروەها ئەوگوڵەگەنمانەیش کە کەڵێتی چۆڵەوانی (فحولة العراء) دەکوتنەوە هێدی بەو مەروخیٚ، ئێستاکە تۆ بە تێکشکاندنەکانت پاڵەوانی یـەتی شـاردا دەپۆشـی، و، دوایـن خەنجـەریش دەخەیتــە کیلانەکـەی، خەنجەری ڕووەکەکان و تاڵانی.

هۆدیرام هیچ مۆرێك نییە تەنها مۆرکەی تۆ نەبێت کە ڕێژگە هـەوڵی پێدەدات بۆ ڕێژگە، فرێیدە فرێیدە مۆرەکە، بۆ ئەوەی جۆگەکان دابنێت.

بەم شێوەیە دەیگێڕمەو، ئاوەهـا دەم تـامی‌مێوژی ووڕێرنـە دەچێژێـت ئایە دوای ئەمە کەس هەیە پێم بڵـی: لەسەر خو ئەی ڕێبەر؟ نەخێر، من باسـی گەنجینەیـەکتان بـۆ دەکـەم لـە جیـهان گـەلێك و نزیکیتـان لەســەر مەودای‌ئەوجیهانگـەل بـۆ دەکەمــەوە باقســەی مـن قسـەی نـیزەك بێــت، ئامارژەکانیشم گەشتی‌شەپۆلێکی جوان بێت، دیرام و دیلانا بێجگە لەدڵی خۆیـان هیچی ترنـابینن-کـاتێك دەیگێڕمـەوە- کـە توندەستیان گرتـووە بەسـەر شیرنیدا، بۆ هـەر شوێنێك ئاوڕ نەدەنەوە هیچ نابینن بێجگە لـەو خوێنەی کە مۆری خوێن میوانداری بە هەناسە بڕکێی دەکا. دیلانا ئایە مستیلەکەی خۆتت دێتەوە یاد؟

ئەومستیلەت کــە مشــتووەیەکی شــەبەنگی هــەبوو؟ ئایــە لــەرزینی دەستەکانمت دێتەوە یاد کاتێك پەیامگەلی خونچەکانیان وەردەگرت، ئەو کاتــە هــەردوو دەسـتت هێـدی هێـدی تەڵزگــەکانی بــەرووبوومیان بۆمــن لێکدەترازاندو دەپژاند؟

ئایا دیلانا دێتەوە یادت کە تۆڕێبەرێکی خەمبار بووی بۆ شادی، ئایا پەلەتە بۆ ئەوەی دیرام لەو پەڕی گردۆڵکەکانەوە شۆڕبێتەوە و بێتەخوارێ بۆ ئەوەی درگای دەریا قوفڵ بداو سەرکڵۆمیدا بەکلۆمی دەشتەکی دێتـەوە یادت کەدە ساڵان بوویت و، سیخناخ بوویت بەوەی ڕێگابە جەنگ دەداو، خیانەت دەکاتە یاری منداڵ، هەروەها موڵە تەکـەت درێژکـردەوە، ژنێکی تەواو ژن وەك هەموو ژنێك ئەوەی‌بەشی مێردەکەی بوو دای‌بەمێردەکەی؟

هــەروەك هــەمووژنێکیش هــەندێك لــە چراکــانی شــاردەەو بــۆ ئــەو قوربانییەکێویانەی کە تینون بۆ دەستێك خوێنی ڕێپێدان وەحەڵاڵکردن- بڕێـژێ، ئەوکاتــە دەنگــە شــاراوەکان ئاوێتــەی پاوانــەکان بکــات دیــرام هــات،ئەوکاتــەی‌دیلانا لێبووبۆوە لــە چنینــی ئەوشــتەی بــۆ مێردەکــەی دەچنــی، فــەرمانی ڕەشــبگێری مێینــەی پشــتگوێ خســت وبەفــەرمانی ڕەشبگێری ئەو سوڵتانەوە خەریکبوو کە بوونەڕی بە بوونـەوەرەو خـەریك دەکرد، دواتر هەردووکیان بە کەسیفی ڕۆیشتنبۆڤێستیاڵەکە.

کاتێك کە دیرام هات، کاتێکبوو دینا ئەوکاتەی‌کە دبرام هات کاتێکبوو تۆ نەنهێنیت هەبوو نەتووڕەبوون، دیرام لە قاپێکدا تاڵانی خۆی پێشکەش کردنی، نهێنی و تووڕبوونـی پێشـکەش کـردی هەرکـەس نـهێنی نـەبێت پیرۆزنی‌یە، هەرکەسێك دەرگا لەسەر شتێیەکی گران بەهای خۆی کلـۆم نەدا ئەوە دەست بەسەریدا دەگیرێ و تاهەتایەکویلەدەبێت..

دیلانا

ئـەو کاتـە نـهێنی خـۆت بـۆ خـۆت دەبێـت، دیلانـا کـاتێك گوڵەگەنمـەکان دادەبارین بەسەرتا خۆت ڕانەوشێنەو بەرۆکت هەڵمەتەکێنە، ئێستا سیخناخی لەشـەهوەت‌و سـێبەری شمشـێری لـە شمشـێرەکانی تـەپوتۆزە جەنگاوەرەکـە بەدوای خۆیـدا کێش دەکات، ئـەو هەوڵـئەدات بـۆ ئـەوەی ئـەو مستیلەیەی تـۆ ببینـێ کە ڕژێنەکان بۆ ڕژێنەکان هەوڵیان پێنەدا. مستیلەکەت تـووڕە، تـووڕی دە، تووڕی دە، بۆ ئەوەی جۆگەکان دابنێت. لەسەرخۆ بەکانیاوەکە لەسـەرخۆبە ئەی تۆزو گەرد، ئێویش لەسەرخۆبن ئەی گاگەل، لەسەرخۆبن ئەی دۆرگەکان، ئائەمە بنەمای بنەمای سرروودە کەمە.

بـەڵام مـن وەك چاوسـاغێك بەسـەرەتا ڕەهاکـان سـرودەکە ناهۆنمــەوە وەك قۆزاغەی پەموو بەڵکو شایەتەکان بانگ دەکەم ڕوووەك بەڕوووەك، دواتر پێکەوە دەگووشرێین، هەناسە سوار لە عارەقی تاکە گەڵایەکی بەراز. ئەو گەڵایەی وێڵ کراوەو سەما دەکاو باڵی گرتووە بەسەر ماچی دوو عاشقدا، ئەمـە لـە کـاتێکدا بیست دەست تارای ئاغری‌و داناى[1] بەسەرچێشت هەنگاودا داوە.

دیلانـا ژنـی نوسینەکەیەو دایکـی دوو گیژۆڵەیشــە ناوبـەناو باسـی هەڵهاتنی خۆی دەکرد لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر. هەر کاتێك دانیشتایە بۆ ئـەوەی کەل‌وپـەلی کچەکانی بدوورێتـەوەو پینـەیان بکـات لـەنیوەڕۆدا، ئەوە بەدوو چاوی فرمێسکاوییەوە لە ئێستاش وورد دەبۆوەو چاکسازی تیادا دەکرد،

دیرام کوڕی گردۆڵکەیە، حەزیدەکرد بەرامبەر دیلانا دانیشێ و ناموٚی خۆی لەبیر بەرێتەوە کاتێك دەیبینی دیلانا بەدوو چاوی پڕ لە ئەسرینەوە سەیردەکا، دەمامکە توندەکەی دادەدایەوەو دەی پرمان بەهەورە تریشقە.

هەردووکیان منداڵن. کوڕێك و ژنێك: دوو منداڵن، منیش چاوساغە لاڵەکەم لەرێگای درختەتی دەنوکی هەورە مەستەکانەوە رێنماییان دەکەم.

سوێنتان ئەدەم بەخوا ئەی هەورە مەستەکان ئەی ئەو هەورانەی لەسەرچاوەیەکدا لەیەسك و پرووسك و شاخی بەرانەکێویدا مەلەدەکەن، راپەرە بە لە بارچوویی لە دەمامکی سەگیکدا، تاجە تەنکەکەت بشکێنە، ئێوەیش ئەی درەختەکانی

دووربکەونەوە، با تارمای، یان ئاوارەیەك نەتانکاتە سێبەر. بەڵام من ئەو رێبەرەم کە گاڵتەجاریم وەك کاردێك هەڵکێشاوە من هێندەم بەسە کەلێرەدا دانیشتووم لە نزیك گایەکەوە کە چاوەکانی گیریان خواردووە بەدەست مێشوولەوەو چەرمەکەیشی زەلالەتێتی بەدەست گەنەی سەرکێشەوە کە هەڵی دەکۆڵێ.

هەردوکمان سەیر دەکەین سەیری سنەوبەری دەریا کاتێك جموجۆڵێتی بەخۆیو هێلانەکانی یەوە.

ئافەریم دیرام ئافەریم دیلانا: من بەو شێوەیە نەبووم وەك ئەوەی کە پێویستە چاوساغ بەرجەستەبکات، بەتەنها هەر سەیری ئێوەم دەکرد، بێ ئەوەی باکم بێت لەو هەندامە بەئاسەواری زرنگەی مۆسیقا دەروازەی مەرگ وازکات.

ئافەریم ئەی کوڕ ئافەریم ئەی ژن:

من وەك ئەوەی پێویستە چاوساغ بیکات وانەبووم. بەڵکو من هەمیشە لەنێوان برژۆڵەکانی ئێوەدا بووم، هەرچی ئێوە بتان بینیایە دەم بینی منیش وەك ئێوە ستایشی جوانی ئەو پاشایانەم دەکرد کە شارەکانیان وەك سەگەلی راوی (ئانجی گەل بەرەڵا کردبوو، خۆیشیان دەرچووبوون بەدوای گەلەکانیاندا دەگەران. هەروەها ستایشی باڵندەکان و مەرخەسکراو گەل و ئاویش دەکەم، رۆحیشم بەقوڵنگێکی پاراو هەڵدەنێم بۆ ئەوەی لە دەرەکانی یەوە دەستم بگاتە رەشماڵەکان و چەکەکان. دیرام لێم گەڕێ، عابای میر بەباڵاتا دەپۆشم. دیلانا لێم گەڕێ عابای میرەژنیش ئەدەم بەشانی تۆدا.

دواتر بەچۆکدادیم و هەموو سنگی خۆم دەبەخشم بەلێدانی روبارەکاهینەکە، بەڵکو بەنەخشەی چاوساغێکی تر رێدەرکات ئەزموونی نوسین لە دوو عاشقداتاقینەکاتەوە کە سروود بەتوورەی مۆردەکەن و کۆتای پێدەهێنن.

ها ئەی توورەی، چی بووە لەوە زیاتر رێبەری کوڕێکی هەڵهاتوو ژنێکی هەڵهاتوو دەکەم؟!

(کاتێك دیرام شتە بچوکەکانی خۆی هێنا بۆ شارەکە، بۆنی خۆش بوو بوو بەهەناسە برکێی کوولەکە، کەمێ گەنمەشامیش لە گیرفانیدا مابوو. هیچ کەسێك نەبوو بەئاشکرا سەیری کاغەزەکە نەکات ئاماژەکردن ریچکەیان بەست بوو بەرەو ماڵی هاوڕێ ئەرمەنی یەکەی.) ها ئەی تۆرەبوون (بەئاگاهاتنەوەیەك پێویست بوو. چارۆکەی بەرد پێویست بوو.

هاوڕێکەی دیرام هاوڕێی شەماڵ (صبا) دەیزانی دەبێ لەگەڵ کازیوەدا هەڵسێ و سەرکردایەتی بەئاگاهی (الیقظة) بکات. لەبارەی ژنانی شارەکەوە قسەی بۆ دیرام کرد، لەبارەی رەشەبای شارەکەیشەوە قسەی بۆ کردو، هەروەها باسی ئەوشێی تەرپییەیشی بۆ گێرایەوە کە قسەو خەو تەردەکات.

هەردووکیان رەنگیان هەڵبزرکا کاتێك سەیری ئەو کیژ رووتانەیان دەکرد کەلە نزیك دەریاکەوە خۆیان گەرم دەکردەوە) هائەی تووڕە بوون...

(ئەو کاتە شارەکە بازنەی بوو، بازنەی بوو وەك دووگی بەران. دیرام رێزی لە بیست ساڵی تەمەنی خۆی دەگرت، بێدەنگ بوو وەك هاوڕێ ئەرمەنی یە بێدەنگەکەی. بەڵام ووتار سەدەییەکەی کە بۆ کێڵگەکانی دابەزان لەبەردەرگاکەی خۆی ئەو حەماڵە رەهەندانەی لەخەو راچڵکان کە کۆمەڵ کۆمەڵ لە چەند هۆدەیەکدا بوون بەرێزی خانۆکەی ئەوەوە بۆیە ئازایەتی رەهەندیان داگیرسان بۆ رێزلێنانی ساڵەکانی تەمەنی دیرام و گۆرانیان بۆ ووڕێنە دەچڕی)

ها ئەی تۆڕەبوون

(دیرام دەڵێ: ئایە لەم فەزایەدا چ پارچە کانزایەك بەئاگای دادەپۆشێ؟ کابرای ئەرمەنیش دەڵێ: لە قوفڵەکان گەڕێ تۆ کوڕی ستایشەکانی. دیرام دەڵێ: ئایا پارێزگاری لە هێرشێك دەکەم بۆ راکێشانی ئەمە، خۆم ئەدەم بەسەر تالانی شمشێرەکانی شێوەندا؟ کابرای ئەرمەنی دەڵێ: واز لە دوورینەوەی ئاسن بێنە،

دیرام دەڵێ ئەمە چ کڵاو خودەیەکە،

چ سنەوبەرێکە واجووتە گونی ماسیان پیادا شۆڕبۆتەوە؟ کابرای ئەرمەنی دەڵێ: لە گۆرانی یەکان گەڕێ، بەردێکی گران بەهایە نابەخشرێ بەچارۆکەکەی تۆ. دیرام دەڵێ: چ رێژنەیەکە (مصب) بۆ ئەم رووداوە کوت و پڕانە، ئایا پاشایەکی تیایە دەمامکی گاڵتەجاری پۆشی بێت، کابرای ئەرمەنی دەڵێ: واز لە داهێنانی پێوەندی کچێنی بهێنە، ئاوارەبوون لە دەسەڵاتی نزیك بۆتەوە.)

ها ئەی تووڕەبوون، من لەسەر چۆك بووم زرییەکەی (زردی) خۆم دەبەخشی بەرۆبارە کەشیشەکەو (النهر الکاهن) تینوێتیم بۆ جۆگاکان دەچنی، بەڵام کاتێك ئاورم دایەوە دیرامم بینی کوڕێك بوو شاری دەرووخاند و شاری درووست دەکرد.

(دیرام بەهێزو بوێرییەکەوە دەستی پێکردو وەك هێزو جەربەزەیی ئەمری، بەپاداشتێ وەك پاداشتی کوڕ. دیرام کتێبەکانی لە حەشارگەوە بەرزکردەوە بۆ بیرەوەری مەرگو، مشت و مرو لمی توند دەکردەوە بۆ گۆرەپانی کتێبەکان، سەر لەئێوارەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە لەسەر سەربانەکە دانیشێ و لەگەڵ نۆشینی چای ئێواراندا بۆنی ئەو ژنە هەڵمژێ کە یەشتا لە قوری سوورەکراوەوە نەهاتۆتە دەرێ. بەڵام دیلانا لەدوای دووسەد خۆری درەوشاوە لەسەر بۆ شاییەکی فراوان گەیشت بەدەنگی ئاسن و گریا.)

ها ئەی تووڕبوون... (دیلانا دوای چل خوول لە خوولەکانی گوڵەگەنم چاوەڕوانی دەکات و. هەوڵئەدا بۆ ئەوەی هەردوو کچەکەی بکاتە هۆیەك بۆ ملکەچکردنی خوێن بۆ خوێن.

دیلانا خوانێکە. دیلانا جۆلآیەکە لە جۆلآکانی شار، رۆژێك لە رۆژان لەسەر تەشی ئاو چارەنووسەکانی (اقدارها) خۆی چنی، بۆیە دیلانا لەو رۆژەوە سەرسوورماو دوودڵە لەنێوان ئەوەداکە پەرەسێلکە بەندبکات یان مەرخەسی کات، بەڵام دیلانا دەسگاکەو دوودڵی دەستگاکەی وویل کرد، دواتر بەئەستوونێك شارەکەی لەتکردکە بیابانەکانی وەك سێبەر بەسەر رۆحەکاندا بەرزەکردەوە.

ها ئەی توورەبوون.

(کاتێك دیرام چوو بۆ ماڵی دیلانا، دیلانا، ووتی: تۆم لە شێوەی رووبارەکان درووستکرد

دیرام ووتی لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی: لە خۆمم درووستکردی، دیرام ووتی: لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی: درووستم کردی لە تاڵانی دەتۆیش تاڵان بێنە. دیرام ووتی: لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی

لە چاوگەی ئاوو دانەوێڵە تۆم درووستکرد دیرام ووتی لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی: تۆم درووستکرد لە سەرەتاکانی شێوەن. دیرام ووتی لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی لەو بریسکە کێوییە درووستم کردی کەلەسەر مشتووی دەرگاوانەکان دەدرەوشایەوە. دیرام ووتی: لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی لەسەرسووڕمانی خۆم درووستم کردی. دیرام ووتی لە شتگەلێکی تریش. دیلانا ووتی: لە ئەزرکردنی تاریکی بۆ تاریکیو، لەو کچێنییەی کەبەرمەکەیەوە بەرەگەکاندا رۆچوو بوو درووستم کردی.

دیرام ووتی وەرە. دیرامی لە باوەش کردوو بە جووت گریان.)

ها ئەی توورەبوون، من زەوی پشت گوێ دەخەم هەتا زەوی دێو چەکەکان دەکات بەتکاکار. هەروەها هەرەشە لە شارەوەیش دەکەم بۆ ئەوەی پەردە لەسەر ئاگردانەکەی هەڵماڵێ، لەبەرئەوەی من ئێستا ژیاننامەی ماچ کۆدەکەمەوە لەهەر شوێنێك بێت

مرکەبەکەم گوڵە ئەستێرەیە، پشت بەو شتانە دەبەستم کە نابینرێن، وەك پۆڕو، قاز کەلە جیکڵدانەیدا قسەی کەنارەکان هەڵدەگرێ.

دەبا درەختیش لەگەڵ مندا بیگێڕێتەوە کاتێك کە ئەو سەرەتایانە دەگێڕمەوە کە بەپەری قەلەباچکەو کای جۆ ڕازاونەتەوە.

## بەشی یەکەم

دیلاناو دیرام پێکەوە بەدەووری شارەکەدا ڕایان دەکرد، خۆیان ئاڵاندبوو بەپەیامەکانی زستانەوە شادیو ڕابواردنیان شادی نەورەس بوو، هەناسەبڕکێیشیان هەناسەبڕکێی قەلەڕەشە بوو. دیلانا هەوڵی ئەداکە دەست بگرێ بەبریسەکە پاراوەکەیەوە

دیرامیش هەوڵی ئەدا دەست بگرێ بەهەورە پاراوەکەیەوە

کاتێکیش هیلاك بوون پێکەوە لە نزیك بیری سەرچاوەی- شارەکەوە دانیشتن، دیلانا هەناسەیەکی هەڵکێشا وەك هەناسەی شەپۆلێكو دیرامیش بەهەمان شێوە هەناسەیەکی ماندوێتی وەك هەناسەی شەپۆلێك هەڵکێشا.

کراسە چەورەکانیانو شمشێری ئەو مەملەکەتەی کامڵ نەبوو بوو دایان بەسەر گوریسی بارانا.

## بەشی دووەم

دیلاناو دیرام لە ناوچەی ڕۆژئاواوە هاتبوون لەو ناوچەیەوە کە پەیوەندە بەناڵەی پادشاکانەوەو هەروەها پەیوەندە بەدوا بریسکانەوەی چەخماخەوە لەسەر نوکی ڕمی قارەمانێتی.

کاتێك دیلاناو دیرام گەیشتن تۆزێك بوو لە خەڵوەتگای عابیدەکە هاتبوونە دەرێو، کاتێك نێرەکە شکۆیەکی لێکەوتووی لە دوای خۆیەوە جێهێشت بوو، هەروەها ئەوکاتەی مێینەکەیش لەدوای خۆیەوە چەند هەرێمێکی لەکارکەوتووی جێهێشت بوو. کاتێکیش گەیشتنە شارەکە مشتێك لە شەپۆلو دەواری سەوزیان بەشارەکەدا بڵاوکردەوەو ستایشی ئاوو شمشێری ئەو مەملەکەتەی کە کامڵ نەبوو بوو هەڵواسی بەسەر شوورەی شارەکەدا.

## پەردەی دووەم

دیلاناو دیرام هێندە ناسكو تەنك بوون کەلە ڕووناکی سنگیانەوە پۆلە کەناچەنوسو (النورس) کەناری دەریاو کەشتی مەرگ دەبینرێ.

توتییە دەنگ گەورە مەستەکانیان دەست ئەدەن بەسەر دەریاداو وەکو پۆشاك دەیپێچنەوە، ئەو سابرێنە کێوییەی پێشەنگی گەلە سابرێنە مەڕ مەڕییەکانی باتیلە لە قوڵاویدا دەسڵەمێتەوە.

دەبێ دیرام چی بکات، دەبێ دیلانا چی بکات؟ لە ڕاستیدا توانیان چڕی دوو دڵیو سەرسووڕماندن تەنك بکەنەوە بەشێوەیەك لە سەرسووڕمان زیاتر هیچی تر نەبینرێ، هەروەها لە شیشیان وەها تەنگ کردۆتەوە کە بەتەنها باطیل ببینرێت، دیلاناو دیرام هەردووکیان تەنك بوون (شفیفین) بەڵام ئێستا ئەوان دەرگای هەوای تەنکیان داخستووەو چرپیان گەڕانەوە بۆ چڕیو هەردووکیان پێکە سوپای تاریکیان بەسوڵتانی ئەو مەملەکەتە نمایش کرد کە کامڵ نەبووە

**سەرچاوە:** www.albayt.org



# چەند نموونەیەك لە شیعری سەلیم بەرەكات

وەرگێڕانی/ كەریم دەشتی

سەلیم بەرەكات نووسەرێكی بەرجەستەی كوردستانی سوریایە شاعیرو رۆماننوسێكی نوێپەردازی هێجگار بە توانایە. دەستێكی هێجگار باڵای هەیە لە پەخشانی عەرەبی.تائێستا چەندین رۆمان و چەندین دیوانە شیعری بەچاپ گەیاندوە لەوانە

| | |
|---|---|
| -ریش | رۆمان |
| گیانەهەندەسیەكان | رۆمان |
| بەشروش | رۆمان |
| ئۆردوگاكانی ئەبەد | رۆمان |
| فەقێكانی تاریكستان | رۆمان |
| جەمهەرات | شیعر |
| كەراكی | شیعر |
| كەنیسەی جەنگاوەر | |
| هكذا ایعثر موسیسانا | شیعر |
| للغبار، لشمدین، لادوار الفریسة و ادوار المالك- | شیعر |
| كل داخل سیهتفالی | شیعر |

(1)

## تاژی

مەرجەكە تۆی بۆت نیە قەت، تۆی باریكەڵە ووچان بگری
دەبێ زۆر رابكەی
هەمیشە لەراكرادنابی لەشكارتێ بۆ شكارتەبێ
لەقامیشەڵانێكەوە بۆ قامیشەڵانێ
تا نێچیرە پێكراوەكان بەناو ئاوەكاندا بەدەم بگری
یاخود مراوی و مریشكی بەر سێرەی رمی راوچیەكانی كێڵگە
دەبێ بترسێنێ
تۆ بەنازی لەپێشتری بۆ خواردنی زۆرپاك
بەڵام ئەوانە رۆژێك دێ رێژنەیەكت دەسرەوێنێ
كەتەقەی رەحمەت بێ
ئەوسا هەر چواریە لەلەرو لاوازەكانت
سییەكانت، ئەو سیانەی بۆنی حەشارگەی
نێچیرە ترساوەكانیان دەكرد، شەرمەزارت دەكەن
ئیدی لە دوای تۆ مەل و باڵدارێكی زۆر
عومرێكی درێژ دەژین...
هەرواش ئەو كێڵگانی كە پێی ئەو گەورانەی پێ ناكەوێ
كە بەدوای سەگەكانیان كەوتوون

(2)

## دیلانا

**هەموو رۆژێك هەمان دەرگا بۆ كچەكەی دەكاتەوە**

هەموو رۆژێك هەمان مێز بۆ كچەكەی ئامادە دەكات
هەموو رۆژێك سەیری هەمان كەلەكێوی دەكات
كە ئەوە بیست ساڵە سەیری هەمانە ئەو كەڵە كێویە دەكات
بەیانیشی ئەو بەیانەیە كە تێپەڕی
بەیانی هەمان بزاڤ و هەمان هزر چوون
ئەو ئەوەیە كە خەبەرم پێدا
ئەو ئەوەیە كە خەبەری دەقنە و هەوام دا
دوبارە چووە دەنێو وەحشتەوە
تا گوێی لە نەفیرە دورترەكە بێت
نەفیری ساڵە وەستاوەكانی
وەكو پشیلەییێكی كێوی بەسەر گردێكەوە
كە هیچ نێچیرێكی لە دەورووبەری نەبێ

(3)

## سمۆرە

دەنكە بەندوقی یەكەم لە بانەوە دێتە خوارەوە
دەنكە بەندەقی دووەم، سێهەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم
لە بانەوەرا گلۆر دەبنەوە..
دەنك دەنك بەندوق دەكەوێتە ژێر ئەو درەختە گەلحۆیە
ئەو درەختەی كە سمۆرە قل قل یادەوەرییەكانی لێ
خڕ دەكەنەوە
رایدەدەنە لانەكانیان
یادەوەری ئەو بەندوقە هەموو ساڵێ
دەنك دەنك گلۆر دەبێتەوە
بەرەو هێلانەی ئەو ئەمیرە خودان كلكە جوانە
درەختەكەش لەبیر دەكرێ

(4)

## پشیلەی كێوی(*)

وەچەیێكی سەرسامە لە نێوان وێنەی پشیلە و وێنەی پڵنگ
وەچەی پشیلە و رۆحی گریاوی
بە ئاگا لە خۆ بوونەوە لە دوانێچیری خۆی نزیك دەكەوێتەوە
هەندێ جار دەخشێ، هەندێ جاری دیش رادەكا
سمێڵەكانیشی هێشتاكە
لە خوێنی نێچیرێكەوە ووشك نەبۆتەوە
ئەوەیان دوا نێچیری ئەو سەلیلە سەرسامەیە

---

(*) چەقەڵ، یا گورگ بەرابەر الوشق- بەكاردێ بەڵام من پشیلەی كێویم پەسەند كرد، دەكرێ دەڵەك بەكاربهێنین.

که لەکاتی خەریکبوونی پڕ لە سەرسامی خۆیدا
فزینی بێدەنگی شەبیهە بەهێزەکەی خۆی نابیستێ
(کەوجەری) تاشەبەردان
بەڵام دوای کەمێکی دی (هەر بەسەر ئەو نێچیرەوە چڕنوکی لێ
گیر دەکات
ئیدی (کەوجەر) چەپۆکی لێ دەوەشێنێ
ئاخ خ خ ئەی وەچەکە ئەوە دوانێچیرە دوانێچیرە.

(5)

## هود هود

وەك بڵێی مەلەکان گۆشەگیریان کردی
وەك بڵێی بەیانیەك لە خەو هەڵساوی
مەملەکەتت پڕ ترس کرد و ئیدی جێت هێشت
لە کانیاوێکەوە بۆ کانیاوێ راتدەکرد
لە سیمای مەلیك دا هیچت بۆ نیە
جگە لە.... و خورێك وەك خوی پیریی
بەڵام تۆ روانگەیێکی زیندووی
ووشکایی لە ژێر باڵەکانت دا گوێی لە دەهۆڵی ئاو دەبێ

سلیم برکات- الکراکی- 1981

(6)

## رۆناشتا بکوژن

بنوو گوڵەکە بنوو
بنوو ئەی ئەو دارژاوەی وەك منی لە وەستانا بنوو
سەدمیل، دوسەد میل ئەو دڵە
قوڕێك دوای دووسەد، خەزەف کارەکان دەیسوڕێنن
دەیکەن بەجەرە
بە دەوری ریسەگیاکانی رۆحدا دەیسوڕێنن
رۆحی منیش باتیلە، بنوو
دیمەنی میهرەجان
ها ئەوە دادەڕمێ
ها ئەوە گوندەکان بەسەر قامەتی دادەڕمێن
ها ئەوە گونەکان بۆ چیا وەدەوری دەنێن
درەختەکان مەحکەمەی دەکەن
چۆلەکەکانی بەسەر دەنیشتەوە
چۆلەکەکان لەسەرەخۆ هەڵیدەفڕێنن بەسەر (بەهارەنگ)
دیمەنی کۆرس
وەچەی ناییندە چیت دەربارەی خۆت پێ دەڵێن
خوا چیت پێ دەڵێ؟ فەرموو
وەك ئەو مێینانەی بەختی خۆیان بریندار دەکەن
فەرموو
یا دەست لە دەزوولەی دەستت دەین
وەك نیشتمان یا زەنگ

سڵاوت بۆ بسەنینەوە

لە "هکذا ایعثر موسیسانا" 1981

(7)

## قەلەڕەش

بەسە ئەوەندە خۆت لەو گۆڕە هەڵواسراوانە مەدە
کە وەك چرا لە بەهۆی ئێمەدا هەڵواسراون
بەسە قەلەڕەش بەسە
ئەی دارێژەری نێوەرۆیان لەبەیانی مەلاندا
پێشتری تۆمان دی
بەر لەوەی بابە باڵەکان خۆی بشوات
لە خۆڵەمێشێکەوە دەچوو بۆ خۆڵەمێشێ
وەك ئەوەی تۆ پێشبینی کەری بەرزاییەکانی
هەروا دەستێکی شەهوەتی کەصولجانی مەملەکەکانت
لەدەستە
بەسە ئەوەندە بەسەر کەڵەشێری بەیان دامەدە
بەسە بەسە ئەی کچی ریش

لە /الجهرات/1981

(8)

## وەرەلام

ئازاد لە تورەییم
ئازاد لە خودەی هەموو خوێنێ
ئازاد لە ماندووبوونم
ئازاد لەو سوێند خۆرانەی گەردی من دابەش دەکەن
ئازاد لە زەنگم
ئازاد لە ئاگروسم
ئازاد لە دەقنە و تەرەم
ئازاد لە هاواری بەزیوەکان
ئازاد لە داگیر کردنەکانم
ئازاد لە خوان و پەشیمانیم
ئازاد لە ئەسەبم
ئازاد لە پایتەخت و لە ڕەشەبام
ئازاد لە گەوهەری شاردراوەم
ئازاد لە خۆش و لە باڵم
ئازاد لەو وێنانەی شێلگیر دەبێ لە ئازادی
ئازاد لە ئەندامەکان لەلعم
ئازاد لە شادی کوشتی
ئازاد لە لایەنگیری و ئەمان
ئازاد لە بێهودەیی مرۆڤ... وەرە بۆلام

لە /دیوانی للغبار، لشمدین، لادوار، الفریسە
و ادوار الممالك

(9)

## دوو لافیته :

1)لافیتەیەك بۆ مەمدوح عەدوان

دونیای من فراوانە

دونیای من تۆپێکە بەنێو گومانەکاندا گلۆر دەبێتەوە

دونیای من لە نێوان ئێوەدایە

ئەوەی من لە نێوان ئێوەدایە

ئەوەی من دەیبینم ئێوە نکۆڵی لێ بکەن

ئەو بەیداخەی لە لای راستەی منا گیایدا

نکۆڵی لێ بکەن

2)لافیتەیەك بۆ بانێژەی موهاجیرەکان

ئەوانەی دێنە ژوورەوە رەصیدیان دەکەم

ئەوانەی دێنە دەرەوە رەصیدیان دەکەم

واقیع لە زمانی هەنگاوەکان رەصد دەکەم

بەوەستاوی رەحم بکە

ئەی ئەو دەستەی لە پشت ماندووبوونیەوە دیار نی

لە دیوانی (کل داخل سیهتف لاصلی و کل خارج ایضا/1981.



بەشێك لە دەقی:

# دینۆكا بریڤا

دەقی: سەلیم بەرەكات وەرگێڕانی: هابیل

## وەرە جێگە زامێكی ئارامەوە!

کاتێ گەلە گورگ لەباکوورەوە شۆڕ دەبنەوە و
پاشەڵیان بەسەر بەفردا بەكێش دەكەن و دلوورێنن،
چرای تەویلە داخراوەكان پێ دەبن و
گەرووی سەگەكان دادەگیرسێن،
لەو کاتەدا من گوێ بیستی وڕینەكانی
سەرمەرگی دینۆكا دەبم
(گەواهییەك)
لەلەكێڵگەكانی كاڵەكی سووردا، ئەو كێڵگانەی كەدەوروبەری
گوندیان تەنیوە، ئاسمان بەجۆرێ پەرش دەبوو
كەشفی ئەو بۆشاییەی دەكرد كەبەدوای جاڵجاڵۆكەو
بەشەپقەی ژەندرمەكان سەری گیرابوو..
ئالەو بۆشاییەوە، دینۆكا بەڕووتیی دەهاتە دەرێو
چەقەڵ گەلێكی ئەدایە پێش خۆی، بۆ جێیەكی دەبردن
كە خاڵیی بێ لە تیرو كەوانەكان
(گەواهییەك)
دینۆكا!
چیی بەو ڕاوچییانە بڵێم كەلەبناری سنجارو كێوەكانی
عەبدولعەزیزدا، تاژیەكان زین دەكەن؟
تۆ لەجێیەك لە جێیەكاندا خۆت حەشارداوە، دەشێ
گەوڕێك بێ، بۆنی گڵ و پاشەڕۆی مەڕومالاتی
تیدا بكەیت!
تۆ گەورەیت!
تۆ ئەو(با)ساردو شێدارەیت
پڕیت لەمەوسیمی دروێنەو
پڕیت لەمن!
گوێم لەباوكتە، هاوار دەكات: دینۆكا!
گوێم لەدایكتە، بانگت دەكات:(دینۆكا... ئەم نانی
جۆیە هەڵگرەو بیبە بۆ موهاجیرەكانی و پێیان
بڵێ كەمێ پشوو بدەن..)
ئەوان، ژمارەیان ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەكرد..
لەتاشقەندو ئەرمینیاو باشووری ڕۆژئاوای روسیاوە،
چارۆكەو پریاسكەكانیان دەگرتە كۆڵەوە، بەپێی پەتی و
بێ ئەوەی داسەكانیان پێبێ، بەرەو جزیرە دەهاتن...
تۆ منالْ بوویت،
نەتدەزانی ئەوان پێویستیان بە ئاوو،
پێویستیان بەژنێكی شێت یاخود بێوەژنێك هەیە
تاكو لەدوور، لەدرزی پێدەشت و ساراكاندا
بینێژن.. بۆ ئەوەی لەمەوسیمەكانی هیجرەتدا،
نیسك و كوللە لە جەستەیانەوە بڕوێ..

تۆ نەتدەزانی چۆن كەندەلانی نێوان(عامودا)و
(مۆسیسانا) بەلاشەی ئێسترەكان و بەئەندامە
لەت وپەت كراوەكانی جەستە، پڕدەبێتەوە.
تۆ نەتدەزانی، بەدوەكان لەكوێوە تفەنگی
فەرەنسی پەیدا دەكەن و، بۆچی لەسەر سنووری گوندەكان
خۆمەڵاس دەدەن و، ئەو كاتەشی هێرش دەبەن،
سەری خۆیان بەعەباكانیان دەپێچن..
وترا: تۆ لە چۆڵەوانییەوە هاتیە دەرێو،
(بریڤا)ش لەچۆڵەوانییەوە دەرپەڕی..
هەر لە چۆڵەوانیشەوە خوا هاتە دەرێ...
دەهشەت هات و، ئەو قاوغە فیشەكانەش
هاتن كە مێر منالان لەبەرمیلە زبڵەكانی بەر
سەرادا دۆزیبوویاننەوە...
ئەوەش وترا، كەتۆ بە ڕانە مەڕێكی بەختەوەرو
تاقە یەك بەرانەوە گەڕایتەوە،بەرانێك وەك
جەنگاوەر هەر جێیەكی بدیبایەتەوە كەبەمیز تەڕ كراوە،
ئەو پشقلی تێدا دەكرد
دینۆكا.. دینۆكا
من ماندووم و، دەنگی تۆ نابیستم... من تەپۆڵكەكانی
(میریكا)و
گالیسكەكانی كوردان بەدیی دەكەم، ئەو گالیسكانەی
كەبەپووش
باركراون..
فەرمانێك/ ڕاوە دوونان
ئەی كچی رۆژە سۆزانییەكانی من.
ئەماینەكەت،
ئەوشكانیی،ئەتەلبەندەكان ناتشێرنەوە.
تارماییەكەت– ئەم شتە پەڕیوەی– كەئاوا دەبێو
منیش پاڵی پێوە ئەدەم
تاڕا دوو نانەكەم درێژبكەمەوە
ئەوڕۆ، لەهەڵدێرێكا
باڵندەكەی خۆت
لەپشت تەرمی لقەكانمەوە،
ئیغرا بكە..
من بەگەردشی ڕۆژگارو،
بەچرپەو،
بەسێبەری میقسەڵەوە نووساوم..

***

لەودیو درەختەكانەوە، جۆلاكان لەسەر تەونەكانیان
ڕایەڵ و دەرووزی هودنەی نێوان
وەحشەت و دنیا هەڵدەكەنەوە...
لەودیو درەختەكانەوە
سییەكانم هەڵكورمان و
دواتر قەدی وشكەوە بووی درەختەكانیان

کرده گۆچان و، داگیرسان،
ئەوە من بووم، دڵی جولاّ هەژارەکانم
داگیرساندو
ئەوانیش کەمەری منیان ڕاوەشاندو
بەربوونەوە سەر قەدی وشکەوە بووی
درەختەکان..
ئەوان دەستیان بەگیاو گوڵەکانی منەوە
دەگرت
دەستیان دەخستە نێو دەستکێشی
ئەو ژنەی
کەلەبەردەم بەدووەکاندا پاشەکشەی دەکرد
ئەو بەدوانەی
کەلەسەر لوولەی دەزووله خوێنەکانی من،
هەڵدەلەرزین
لەودیو درەختەکانەوە چراوگەکانی ئاو هەن
غوبارێك هەیە
تیایدا سەرنجی دەستەکانت ئەدەم،
دەتوێنەوە...
ئیغرا بوونی خۆت بنوێنە
ئەی کچی ڕۆژە سۆزانییەکانی من.
ئەوشکانیی، ئەتەلبەندەکان، ئاشێرنەوە
بەتەنیشت دەغڵێکەوە، یان بەتەنیشت شاخێکەوە
دواتر بارانەکەی خۆمم لەگەڵدا بەدیی دەکەیت
ڕۆژگاری خۆمم بەهەڵکورماویی لەگەڵدا بەدیی دەکەیت
ئەو ڕۆژگارەی
کەبەزەیی و(با)و
سێبەری میقسەڵە،
شەڕی لەسەر دەکەن..
چۆلەکەکانی خوێنە غەفلەترە دەکەشم بەدیی دەکەیت
(وادەو بەڵێنێك هەیە، کەوەك پیاوە شەرەفمەندەکان
من چۆلەکەکان لەبیرکەم،
بەو ڕێو بانەدا نەیانهێنم
کەبە کەنیزەکەکانی جەمهورییەت و
پاسەوانەکان تەنراون)
خوێنەکەم بەدی دەکەیت
کەلەنێوان پادشاکانی ئاوو
ئاجۆری شارەکاندا(*) بازرەقەی بەستووە..
منیش ئەو نەتەوانە لەبیر دەکەم کەدێن و
نزیك دەبنەوە و دەڕۆن
سۆلەکانم کون کون دەکەم
بۆ ئەوەی بگەمە ئەو مەعریفەتەی
سالووکەکان لەبارەی ئەو شەهیدە بێزراوانەوە دەیزانن
کەلەسەرە ڕێی گڵکۆکاندا، فڕێ دران
بۆ ئەوەی بزانم، چۆن زەمەنم

هودنەکاریم لەگەڵ دەکات..
ئەو پێدەشتانەش بناسم
کەسیخناخن لەو گژوگیایەی
دەمکاتە خانەی حوزن..
(هەورە بروسکە غەمگینم دەکات ئەو کاتەی لەلێورەکانی
لافاودا دادەگیرسێ، لافاویش غەمگینم دەکات
ئەو کاتەی سوار پشتی خاك دەبێ، خاکیش دەمکاتە
خەفەتخان کاتێ دەوڵەت ئەو خاکە لەمێژووی دەوڵەت
دەسڕێتەوە، دەوڵەتیش غەمگینم دەکات ئەو کاتەی
حوزن بەعزی لەگەڵدا دەکات... حوزنیش، حوزنبارم
دەکات)
لەدواتەوەم ئەی کچی ڕۆژە سۆزانییەکانم
من گەڵای دار گێلاسەکان بانگ دەکەمە
نێو حیرەتی میللەتێکەوە:
(خێراکەن، وەرنە قەراغم..
ئەی گەڵای دار گێلاسەکانی
نێوە بن و خوودا، خێراکەن.. خێرا..
من سەرقاڵی دوکەڵێکم
لە ئازادیی ئەو نەوانە دەمپارێزێ
کەهەموو نەوەکان ڕاو دەکەن..
من، زینەکان و خۆڵباران، نیازم
لەو گەڵایانەدا،
پێشنیاز ناوێکی دی بۆ ئاوەکەم دەکەم و
هاوڕێگەیبوونەوەرە شێردەرەکانی سەردەم دەبم
بەرەو ڕەشماڵ و میوانخانەی سەمەندەرو
بۆنخۆشترین دەوەنەکان
بەرە و ئەو مەمکەی
کەخواوەند لەپشت گوڵە گەنمەوە
کتوپڕ بەدیی کرد..
ئەی گەڵای دار گێلاس،
جوگرافیا ئاسەکان نووستوون
گوڵەکانیش پڕبوون لە نهێنییەکانی گیا..
(من کاپتنم و
کەشتیەکەشم بریتی‌یە لە ژەنگی هەنگاوەکان)
لەپشت خۆتەوە، ئەی کچی ڕۆژە سۆزانییەکانم،
لەملاولای خۆتەوە،
خوێنەکەم دەبینی...
ئەو خوێنەم،
دۆزەخێ لەدۆزەخەکەی مندا زیندوو دەکاتەوە و
دەخورێتە ڕەوە ئەسپێ لە ئەسپەکانی تەنیایی،
لەناوەڕاستی شووراکانی ڕۆحدا
سواری ئەسپێك دەبێ‌و
لەبەرگی(بریڤا)ی کوژراو بەهەناسەی غەریبان و
بەسرووتی خواوەنداندا،

دەحیلێنێ..

پەنا دەبەمە بەر زەبرو، هەناوی ئەسپەکان

بەستووندێکەوە گرێ دەدەم کەچەرکەس و

کورد خۆیانی لێ هەڵدەسوون و

بەخێرایی، بەرزە پێ ڕاست دەبنەوە

سەوزیی و چڕیی گەڵاکانیان، بەنێرگس و

بەباوەڕێکی ئەبەدیی خەتم دەکەم،

پاشان وەك دارو درەخت و

وەك چۆلەکەکان،

بەرەو رووبار رێدەکەین،

دەڵێین:(ئەی ڕووبار، وەرە ئەی شاخ، وەرە)

دەشڵێین:(ئەی کەو، وەرە

تۆش ئەی گەڵای گێلاس

بەرەو بیابانێك وەرە

کەلەدرزی کاسە سەرەوە دێتە دەرێ)

پەنا دەبەمە بەر زەبرو

لەحزەکان بتانگەێشت دەکەم

تاکو بلووری دڵ لە عەورەتی

ئەو بەژنانە موتوربە بکەن

کەلەکەفی قوتبەکان و

لەناجۆری شارەکانەوە دێن

دەکۆشم، ئەو شوێنانەی کەلەلێوەکانمدا

خۆرکە لێیان ئەداو،

ئەو شوێنانەشی کەلە چڵەکانمدان،

بۆ لەسێدارەدان بکەمەوە

کاتێ جەستەی شێدار خۆ تەواو دەکات و

بەرەو درزی کات و

زاووزێی موعجیزە ڕاپێچ دەکرێ..

تارمایی ئەو هاورێ کچانەی کەمەداری منیان

بریندار دەکرد،

سەرفەرم پێدەکەن..

ئەمێستاو، دوای ئەمێستاش

من گۆڕستانێك و خوێنی،

وەکو خەڵات دەبەمەوە



## پەراوێز

*ناجۆر–القرمید–: کەرەسەیەکی بینا سازییە بە ئینگلیزی پێی دەوترێ(ئەنتی فێکس) و جۆرە خشتێکی بەلم خۆشکراوە و لە سەقفبەندیی خانووبەرەدا بەکار دێ.

## سەرچاوە:

دیوانی شیعری(کل داخل سیهتف لاجلي، وکل خارج ایضا)، کەلە کۆ دیوانی(المجموعات الخمس) دا بلاوکراوەتەوە. لەبلاوکراوەکانی (فلسطین المحتلة) چاپی یەکەم سالی 1981- ل.ل(7-12).

# سەلیم بەرەکات:

# من رۆحی کورد بەعارەب دەناسێنم!

گفتوگۆی: جەوهەر کرمانج- د. موفەق دەرگەڵەیی



*سەلیم بەرەکات یەکێکە لە شاعیرە نوێخوازەکان، بەرەچەڵەک و هەست کوردە و بەزمانی عەرەبی دەنووسێ. خاوەنی رێچکەیەکی تایبەتییە لە شیعرو رۆمانووسیندا. شیعرو رۆمان لای سەلیم بە ئەندازەیەک تێکەڵ یەکتربووە کەزەحمەتە تخوبوکانی لەیەک جیابکەینەوە.*

*سەلیم ئێستا لە ستوکهۆلم دەژی، پاش ئەوەی ماوەیەک لەبەیروت و دواتر لە قوبرس ژیا.*

*ئایندە خۆشحاڵە کە ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ ئامادە بکا.*

***سەلیم بەرەکات شاعیریشەو رۆمان نوسیش، چۆن پارسەنگ لەنێوان ئەم دوانە رادەگری؟**

-سەلیم بەرەکات: لام وایە کە لەسەرەتای(ئەفسانە)ەوە، هەر لە هۆمیرۆس و پێشترو دواتریش بگرە شیعرو رۆمان لەیەک رێچکەدابوون، خودی "ئەلیازە" و "ئۆدێسا" بریتین لە رۆمانە داستان و بەشێوازێکی شیعری نوسراون، ئەمە ئاشکرایە، منیش زۆرجار جیاوازی ناکەم لەنێوان ئاستەکانی بەکارهێنانی جۆرەکانی ئەدەب لەیەک بواردا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێم باشتربوو رۆمان بەزمانی رۆمان بنووسم و شیعریش بەزمانێکی شیعری ئەگەرچی دەشڵێن کەرۆمانەکانم زمانی شیعریان پێوە دیارە ئەمەش مافێکی رەوای خۆمە کەشێوازە زمانیەکانی شیاو بەکاربێنم بۆ دەوڵەمەندکردنی دەقێکی بەردەستم، جا ئەمە پەخشان بێ یان شیعر.

***خوێندەواری کورد رووبەرووی دیوارێکی ئەستووری زمان دەبێتەوەو خوێندەواری عارەبیش ناوەرۆکێکی نائاشنا، ئەم گیروگرفتە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

-لەڕاستیدا هیچ گیروگرفتێك لەئارادانیە، بۆچی خوێندەواری عارەب دەقێکی وەرگێڕدراوی ژاپۆنی بەعارەبی دەخوێنێتەوە و چێژی لێوەردەگری کەچی من بەزمانەکەی خۆی بۆی دەنووسم تێبینی ناکا؟ پێم وایە کەئەمەیان لەلایەکەوە سەرچاوەیەو لەلایەکی دیکەشەوە وایلێدەکات کە ئاگاداری رۆحی گەلێکی تربێت کەپێکەوە دەژین، ئەمەیان گرفتێك نیە، بەڵکو گرفت ئەوەیە کەئاوڕ لەگەلێك نەداتەوە کەهاوبەشە لەگەڵیدا لەسەر یەك خاك و یەك ئایین و یەك مرۆڤایەتی لەناوچەکەدا، هەروەها لەلایەکی دیکەوە گرفتەکە ئەوەیە خوێندەواری کورد ناتوانێ بەئاسانی بیگاتێ، من لێرەدا لەبیانوو ناگەڕێم. رەنگە من تەمبەڵ بووبم، بەڵام هەرگیز پەشیمان نیم لەوەی کەزمانی عارەبیم بەکارهێناوە بۆ تەرجەمەکردنی رۆحی کورد بۆی، چونکە زمانێکی زۆر دەوڵەمەندو فراوانە، بۆخۆیشم چاکترە کەمرۆڤێکی کورد بەو دەوڵەمەندیەی پێشکەش بکەم، هەروەها بۆ خوێندەوارە بێگانەکەش باشترە کەمرۆڤێکی دەوڵەمەندو قووڵی لەم ئاستەی پێشکەش بکرێ نەك بەزمانێکی هەژار ئەڵبەتە کەهەندێکیش گلەیی لەوەرگێڕەکان دەکەم کەدەبینم ئەدەبی "یەشار کەمال" وەردەگێڕنە سەرزمانی کوردی و نازانم بۆ چیانە، ئایا دەبێ تا ئەو رادەیە تەمبەڵ بن کە لەگەڵ گەلی عارەب بژین و عارەبی نەزانن، کەچی تورکی دەزانن؟ تێناگەم، لەمە ناگەم، با ئەدەبیمنیش وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی، جا باسەیر کەن بزانن من چەند لەگەلەکەم نزیکم.

***ئایا ئەدەبی سەلیم بەرەکات سەرئەنجام زێدەکردنە بۆ سەر ئەدەبی کوردی یان ئەدەبی عارەبی..؟**

-ناکرێ بەم جۆرە سەیری ئەدەب بکرێ، چونکە ئەمە زێدەکردنێکە بۆ ئەدەبی مرۆڤایەتی، زێدەکردنە بۆ یەقین و تێگەیشتنی مرۆڤایەتی، بەم پێودانگە من پێم وایە کەمن چۆن لەیەقینی کورد نزیکم ئاواش لەیەقینی عارەب نزیکم، من رۆحی کورد بەعارەب دەناسێنم ئەمەش ئەرکی سەرەکی منە.

***لەشیعری "مەهاباد" کات و شوێنت پێکەوە کۆکردۆتەوە، واتە مەهاباد هەردووکیانە، ئەمە لای تۆچی دەگەیەنێ و بۆچی لەم کاتەشدا ئەم شیعرە لەدایك بوو؟**

-وابزانم سەردەمی کارەساتەکەی هەڵەبجەبوو کە ئەم شیعرەم نووسی بەرووداوێکەوە گرێم دا کە ئەوکاتە هەموو دنیا گرنگی پێدەدا، ئەویش یاریەکانی "ئولومپیاد" بو بەبیرم نەماوە لەچ وڵاتێك بوو، هەموو گەلانی دنیا لەوێ بوون بۆ بەشداری لەبازدان و راکردن و... هتد لەولاش گەلێك سەری دەبڕا، هەوڵمدا جیاوازیەکان بدۆزمەوە، لەڕاستیدا هێندە جیاوازیەکی گاڵتەجار نەبوو ئەوەندەی لەرادەبەدەر خوێناوی بوو، دنیا سەرقاڵی "ئولومپیاد"ەو رادەکات، بەڕاکردنی یاریزانێك بەهەناسەی یاریزانێك بەئالای خۆیانەوە، کەچی کوردەکان بەناو مێژوودا بەرەو خوێن باز دەدەن، ئەم گەمەیەم لەگەڵ جیاوازیەکان کرد، وەبەهێنانەوەی "مەهاباد" گەڕانەوەیەکی مێژووییە بۆ ئێمە، چونکە ئێمە یەك جار کیانێکمان بۆ دروست بوو، ئەویش بەشێوەیەکی خێراو رۆاڵەتی کەوامان لێدەکات هەمیشە دەستی پێوەبگریت و پشتی پێوەبدەین

بۆ گەڕان بەدوای هەر کیانێك، تەنیا زیندوکردنەوەیەکی ڕەمزی بووبەس.

***هەندێك پێیان وایە کەشێوازی نووسینت تارادەیەك تەم و مژاوی و ڕەمزیەت زاڵە بەسەریاندا تۆ دەڵێی چی؟**

—من پشت بەزۆر شێوازی گفتوگۆ دەبەستم، مەبەستم لە شێوازی نووسینە، لەوانە ڕەمزیەت، بەڵام نەك ڕەمزیەتێکی تەماوی، نەخێر هەرگیز، بەڵکو هەوڵێکە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو کەسایەتیانەی کەپێشکەشیان دەکەم، هەروەها شوێن و ڕووداوەکانیش، بەڵام ئێستا لەم سەردەمەدا بەداخەوە خوێندەوار زیاتر تەمبەڵ دەبن بۆیە دەقێك بەسەختەکار ناودەبەن، یان بەتەم ومژ، ئێوە دەزانن کە سادەیی پانتاییەکی زۆری لە ئەدەب داگیرکردوەو هەروەها پێشکەش کردنی دەقێکی ئاسان بۆ خوێندەوارێکی ئاسان سیمای ئەدەبی ئەم سەردەمەیە، من نامەوێ بەم ڕێڕەوەدا بڕۆم، من دەقەکانم سەختن. چونکە چارەنووسم سەختە، بۆیە لەنرخیان کەم ناکەمەوە تا لەڕەوتێکی ئاساندا بیانخەمەڕوو.

***باشە.. ئاکرێ تۆ ئەختێ لەو قوڵە سەختە دابەزیت و خوێندەواریش ئەختێ سەرکەوێ و لەناوەندێکدا پێك بگەن..؟ مەبەستم لە زمانی نووسینەکانە، بۆ ئەوەی تێت بگەن؟**

—من وای بەچاك دەزانم لەو بەرزاییە بمێنمەوە، خوێندەوار سەرکەوێ بۆلام. ئەمەش هۆی هەیە کەلەسەر دەقی سەخت نەبێت کارناکەم، بەئەندازەی ئەو چارەنوسە سەخت و دڵەوارەی هەمانە. ئێوە دەزانن کە زۆرشت کاریان کردۆتە سەر خوێندەوار بۆ ئەوەی سادەبن، لەوانە دەوروبەر، من لێرەدا مەبەستم بەتەنیا خوێندەواری کورد نیە، بەڵکو خوێندەواری ناوچەکە بەگشتی، باشترین کتێبی عارەبی دوو هەزار دانەی لێ دەفرۆشرێ، باسی هەزاربێ بۆ نموونە..."نزار قەبانی" کەزۆر بەناوبانگە پێنج هەزار کتێبی دەفرۆشرا، خۆشتان دەزانن کە گەلی عارەب چەندن، من ناتوانم لەم بارەیەوە شتێك بکەم چونکە تراویلکەیەك لەسەر زەمینەی واقیع دا هەیە، کەخوێندەوارییەکی بەربڵاو لەڕادەبەدەرە، نەخوێندەوارییەك کە گەڕانەوەیە بۆ خوێندنەوەی ڕۆژنامەو شتی ڕووکەش. نەبوونی کتێبی پێشکەوتنخواز، نەبوونی ڕەخنەی ئەدەبی لەسەر گۆڕەپانەکە. نەمانی گۆڤاری ئەدەبی تایبەت بەڕەخنە، یان هەر گۆڤاری ئەدەبی بەگشتی، هەموو ئەوانە وادەکەن خوێندەوار لەخوارەوە بمێنێتەوە. من قەت ڕێگا بەخۆم نادەم بۆلای دابەزم، چونکە ئەمە چارەسەر نیە. ئەمە مانای ئەوەیە من لەئەدەبەکەی خۆم بخورم تا بگاتە لای ئەو، دابەزین واتە پێك گەیشتن لەخاڵێك ئەوەش ئەکی سەرشانی من نیەو ناتوانم. من ناتوانم خوێندەواریش بەرزبکەمەوە، ئەمە کاری دەزگاکانە، منیش ناتوانم شوێنی ئەو دەزگایانە بگرمەوە، بەڵام کەمێك ڕێزو پایە بۆئەدەبەکەی خۆم دروست دەکەم تا ئەوکاتە خوێندەوار دەیگاتێ.

***هێندێ لەنووسەران دەڵێن ئێمە بەلامانەوە گرنگ نیە ئێمان دەگەن یان نا، ئێمە بۆ خەڵك نانووسین بەڵکو بۆ خۆمان دەنووسین تۆ دەڵێیچی؟**

—هەرگیز من باوەڕم بەم هەڵوێستە بێهوودەییە نیە، من موڵتەزیمم، من بۆ کەسانێك دەنووسم کەموڵتەزیمم بەرامبەریان، ئەو کەسانەش ئاسان نین و سەختن، لێشیان دەترسم، من لە خوێندەواری زیرەك دەترسم، نیازیشم نیە بۆ خوێندەوارێکی سادە بنووسم، زۆریش لەوە دەترسم کەخوێندەوارێکی زیرەك وریا تاقیمبکاتەوە، لەو تاقیکردنەوەیە دەترسم. من بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەنووسم و لاشم مەبەستن. هەرگیز من ڕوو لەوجۆرە خوێندەوارانە ناکەم. من ئەوەم بەخەیاڵدا نەدەهات کەلەعارەبێك باشتر فێری عارەبی ببم بۆ ئەوەی عارەبی پێ ئیحراج بکەم بەڵکو بۆئەوەم بوو کەخۆم دەوڵەمەندتر بکەم، ئەمە ڕاستیەکەیەو بەس. هەرگیز دابڕان، یان بۆشایی لە نێوان خوێندەوارو شیعر زیاترە لەبۆشایی نێوان خوێندەوارو ڕۆمان. دیسان دەگەڕێمەوە و دەڵێم ئەوە ئەرکی سەرشانی ڕەخنەیە بۆ لێك نزیك کردنەوەی بۆچوونەکان پێشان لای ئێمە کتێبەکان شیعری تازەشی تێدابوو، لەوانەیە باسکردنی ئەم مەسەلەیە ئەمڕۆ ساکاربێ دەرهەق بەشیعر، بەڵام کاتی خۆی زۆر یارمەتی داین، ئەمڕۆ شتێکی لەو بابەتە نابینین، ئەمانی ڕەخنە دوای پەیدابوونی ئەوت و دوای سەرهەڵدانی ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕاگەیاندنی ئەوت زیاتر لەسەرەتای حەفتاکانەوە هێرشی بەربڵاو لەلایەن ڕژێمی عێراقی و لیبی کرایە سەر ڕۆژنامەو گۆڤارەکان تەنانەت هێندێ گۆڤاری ئەدەبی هەر تەفروتونا بوون، لەبەرئەوەی نوسەرەکانیان کەوتنە دوای پارەوپولی زۆرتر لەڕۆژنامە گەلێکدا کەهیچیان لێ ناخوازێ، جگە لەستوونێکی ئاسان و سادە. ئەمە لەسەرەتای حەفتاکانەوە دەستیپێکرد، کاتێ کە بەیروت گۆڕەپانێکی گەورەبوو بۆ سەرهەڵدانی ڕەخنەی ئەدەبی و گۆڤار. ئەمانە هەمووی ئەمان. بۆیە ڕەخنەگر هەر بەو بیروبۆچوونە کۆنانەی زەمانی شەستەکان مایەوە، بەباشی یان نیوە باشی یان کەمتر لەبدر شاکر السیاب و هەندێ لەوانەی ئێمە دواتر بەکلاسیکیمان دەزانین، لەگەڵ زیادبوونی گوشاری ڕەمزیەت و زۆربوونی شێوازی دەربڕین لە ناو شیعری جیهانیدا و کارتێکردنی هێندێ شاعیری عەرەبیش بەمە، خوێندەوار هەر لە قۆناغی شەستەکاندا مایەوەو دەقەکانیش گەشەیان کرد، بەرەو ئاستێکی دی، ئەڵبەتە کە لەم هەموو شتەی کە دەنووسرێ شتی خراپ زۆرە، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کەباشەکەشی بەئاگری خراپەکە دەسوتێ، ئەویش بەهۆی بزربوونی ڕەخنە...

***تۆ ساڵانێکی زۆر لەگەڵ فەلەستینیەکان کارت کرد، واتێکەم لە گۆڤاری "کەرمل" تێڕوانین و بۆچوونی ئەدیبی عارەب چۆن بۆ ئەدەبی کوردی بەگشتی و کێشەی کوردیش بەتایبەتی، چونکە ئەدیبی کورد زۆری بۆکێشەی فەلەستین نووسی، تەنانەت زۆرجار کێشەشی بۆ دروست دەکردین لەلایەن ڕژێمەوە بۆ نموونە: زۆر وشەی وەك فەلەستین، قودس، تەل زەعتەر، کەمال ناسر، کەمال عدوان.. هتد قەدەغەکرابوون.**

—نووسەرە فەلەستینیەکان کێشەی خۆیان هەبوو، من گلەییان لێناکەم بەگشتی خەریکی کێشەی خۆیان بوون، لەبواری ئەدەبی فەلەستینیشدا شتی خراپ زۆر پێشکەش کرا. مانای ئەوەیە بۆچوون و تێگەیشتنی زۆر لەنوسەرانیان خراپ بوو بەرامبەر کێشەکەی خۆشیان. هێندێکیان کەبێشك کەمێکن. هزرێکیان بەرامبەر کێشەی کوردهەبوو، لەبەرئەوەی چەپ بوون پشتگیری خەباتی ناوچەکەیان دەکرد بەڵام خۆی کێشەی کورد بەگشتی بەپلەی دوو و سێ دەهات، ئەویش بەهۆی ئەو پەردەپۆشییە لەڕادەبەدەرەی ڕاگەیاندن تەنانەت ئەم پەردەپۆشیە کاری لەسەر نووسەرێکی کوردیش کردبوو کەدەلاقەیەکی لەنێو خەباتی فەلەستینیەکاندا دۆزیبۆوە، کە پێی وابوو کێشەی فەلەستینیەکان کێشەیەکی ڕەوای گەلێکە، یان لەبەرئەوەی خۆی نەیدەتوانی

راستەوخۆ بۆچوونەکانی خۆی دەربڕێ، من خۆم هەستم بەوە نەدەکردکە خوێندەواری عارەب تێگەیشتنێکی گەورەیان هەبێ لەسەر کێشەی کورد کەکێشەی گەلێکە بەتەکیانەوەیە بەتایبەتیش کە ئەو کێشەیە کەوتۆتە سێکوچکەیەکی شەیتانی، ئەو تەموو مژە رەفتارێک دەوری داوە وا دەکات کە بۆ فلان و فیسار هێندە روون نەبێ، هەمان ئەندازەیش وەک خۆتان دەزانن، تەنانەت لە ناوەندە فەلەستینیەکانیشدا جا چ هەواداری عێراق یا سوریا یائێرانی، یا تورکی یا ئیسلامی بووبێ، تێروانینیان جیاوازبووە لەسەر کێشەی کورد، بەلام کێشەی فەلەستین هەرزال بوو، تەنانەت لەسەر ئاستی دنیاداو لە ئاستیعارەبیشدا، ئەویش بەهۆی ئەو یارمەتیە زۆرەی کەبەپارە بۆ کێشەی فەلەستین تەرخان کرابوو. هەروەها یارمەتی راگەیاندن، کەتەنانەت خەلکیان لەدەرەوە دەهێنا ئەوەش وای دەکرد کەزۆر ئاگاداری کێشەی کورد نەبن.

***دوای کارەساتی هەلەبجەو ئەنفالەکانیش ئەوانەی کە لە دەوروبەری تۆ بوون هەر بێدەنگ بوون، ئەمە بێهەلوێستی ناگەیەنێ؟**

-بێگومان کەم و کورتی لە عارەباندا هەبوو.

کەموکورتی لەویژدانیاندا هەبوو، زۆرجار ئێمە لەناو ناوەندە فەلەستینیەکاندا پێوەی گرفتاربووین، فەلەستینیەکان،یان زیاتر ئەوانەی لەدەوروبەرم بوون تێگەیشتنی زیاتریان هەبوو بۆ مەسەلەکە، چونکە هەر هیچ نەبێ من دەمتوانی لەسەر مەهاباد بەکوردی بوونی خۆم بنووسم، من دەسالی رێک لەگەل فەلەستینیەکان کارمکرد، لەچەند وتارێک بترازێ شتێکم لەسەر فەلەستینیەکان نەنووسی

هەموورۆمان و شیعرەکانی من لەسەر کوردبوون. پشتگیریشیان دەکردم، ئەگەرچی کەم بوو و دەبوو زێتربێ، بەتایبەتی دەرهەق بەگەلێک کەئێش و ئازارەکانی وەک هی ئەوان بوو، ئەلبەتە کەدەبێ گلەییان لێبکرێ.

***لەم رووەوە تۆ گلەییت لێنەدەکردن؟**

-من ناتوانم دەنگی خۆم بگەیێنمە هەموان، من دەمنووسی، لەولاشەوە کەسانێک هەبوون جاروبار گوێیان لێم بوو. جاریش وابوو هیچ، بەلام ئەوانەی دەوربەرم زۆر بەرروونی لەکوردی بوونی من دەگەیشتن.

***مەحمود دەروێش یەک شیعری بۆ کورد نووسیوو بەلام دواتر لەویش پەشیمان بۆوە بۆ؟**

-پێم وایە شیعری دواتر دیکەشی هەبوون کەلەدیوانەکەی مەحمود دەروێشدا جێگایان نەما، بەلام بەتایبەتی شیعری بۆ کوردستان کاریگەریەکی زۆری لەسەر دلی کوردان هەبوو پێشم وانیە مەحمود کەسێکی ترسنۆک بێ، یان دووڕوو، ئەوەندە هەیە کە خۆی رای لەدارشتنی هێندێ شیعرە کۆنەکانی نەبوو، ئەوەبوو کەلەدیوانەکەیدا داینەنان، یەکێکیش لەوانە ئەم شیعرەبوو، بەلام ئەوە تاکە شیعر بوو کەکاری کردە سەرهەلوێستی ئێمە.

***یەکەمین دیدارت لەگەل فەلەستینیەکان کەی بوو؟**

-لەگەل سەرەتای پەیدابوونیهۆشمان مەسەلەی فەلەستین لە ناو مالەکانمان و لە ناو کتێبەکانمان و قوتابخانەمان بوو، ئەو دەمە قسەی رۆژانەو شیعرانەی فێریان دەکردین هەمووی هەر لەسەر فەلەستین بوو.

***لەکۆرێکیی فراواندا لەدیمەشق"مام جەلال" باسی سەرکردەکانی فەلەستینیەکانی کرد کە دەست دەخەنە ناو دەستی"صدام حسین" کەجەلادی کوردە، کەچی ئەوەیان لەبەرچاو نەبوو کە دوا(10)کەس کە(لەقەلای شوقیف) لەسەر فەلەستین کوژران کورد بوون!**

-ئەمە باسێکی دووردرێژە، زۆربەئێش و ئازارە، لەوانەیە من زۆرجاران تێگەیشتنێکم هەبوە بۆ هەلوێستی کەسێک یا سەرکردەیەکی سیاسی لەگەمە سیاسیەکانیداو تەوقەکردن ئاساییە، من لەو جۆرە کەسانە نیم کەشت لەسەر ئەوە بنیات بنێم، زۆرجاریش خەلکانێک ناچاردەبن تەوقە لەگەل دوژمنەکانیان بکەن.

بەلام مەسەلەکە ئەوەیە ئایا ئەمە کارێکی مەبدەئی و کۆتاییە یان نا؟ ئێوە خۆتان دەزانن هەلوێستە کاتیەکان لەبواری سیاسیدا زۆر فرتوفێل و دوو روویی تێدایە. هەرئەوەش نا بەلکو تێکرای هەلوێستی فەلەستینی دواتر بۆ قازانجی"صدام حسین" وەرگەرا. بەتایبەتی دوای جەنگی کەنداو ئەوەش بەشێکی گەورەی کارەساتی من بوو بەتایبەتی. چونکە من ئەو دەمە هێشتا لەراگەیاندنی فەلەستینی کارم دەکرد و دەمبینی وێنەی"صدام حسین" لەلاپەرەکانی پێشەوەی گۆڤارە فەلەستینیەکان دەدرێ، وەک خۆتان دەزانن دەمەتەقەیەکی زۆر و رووبەڕووبونەوەیەکی زۆر دەهاتە پێش، رووبەرووبونەوەکان لەوە گەورەترن کەمن باسیان بکەم، ئەوەبوو دوا هەلوێستم، ئەوەبوو کەنەچم کارەکەم کارێکی زۆر باش بوو لێپرسراوی بەشێک لەبەشەکان بووم، گۆڤاری(کەرمل) و دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی(کەرمل) باوەشی بۆ کردبوومەوە، مانگانەیەکی باشیشیان دەدامێ، چیم دەکرد لەسوید ئەگەر ئەوێم هەلبژاردایە،بەلام پێم شەریف تر بوو پێنج سالان بێپارەبم لەوەی کەبچم لەوی کاربکەم، تەنیا ئەوەندەم پێکرا.

***ماوەیەکی زۆر لە گۆڤاری(الكرمل) کارت دەکرد، دەکرێ نەختێك باسی بکەی؟**

-گۆڤاری"کرمل" گۆڤارێکی رووناکبیرییەو بەس، هەولماندا لایەنی راگەیاندنی لێدەرهاوێژین، کەهێندێ گۆڤاری دیکەی فەلەستینی بۆئەوە تەرخان کرابوون، تەنانەت وامان لێهاتبوو خەلکانێکی زۆر لەناوەندە فەلەستینیەکە رقیان لێمان دەبۆوە، ئەوان دەیانویست ئەدەبیش شێوازێکی راگەیاندن بەخۆوە بگرێ و هاوشان بێ لەگەل شێوازە سیاسیەکە، ئێمە نەختێك رێزمان بۆ ئەدەب هێشتبۆوە، بەمەش گۆڤاری"کەرمل" هیچ تەنازولێکی نەکرد، ئەمەش بوە هۆی راگرتنی یارمەتی دراوی لێی

***چۆن بوو ریزی فەلەستینیەکانت هەلبژارد کاری تێدا بکەیت؟**

-واتێدەگەم کەشتێکی هاوبەش هەیە، من پێشتر گوتم کە رووناکبیرانی کورد هێندێ جار تاکە دەروازەیەکیان لەریزی فەلەستینیەکاندا دەدۆزیەوە بۆ ئەوەی هەناسەیەکی تێدا بدەن، لەبەرئەوەش بوو گەلێك لە خەلکانیچەپ پەنایان بۆ برد. چونکە پێیان وابوو لەوێ بەجۆرێك لە جۆرەکان دەتوانن هەستی خۆیان دەربڕن، من لەریزی حیزبەکانیاندا کارم نەکردوە، بەلکو لەریزی بزوتنەوەیەکدا بووم کەرزگاریخوازو نیشتمانیبوو، جۆرەها بالیشی بەخۆوە گرتبوو، سوودیشمان لێبینی، پەراوێزێکی فراوان هەبوو بۆ ئەوەیهەستی خۆمانی تێدا دەربڕین لەگەل ئەوان زیاتر لەشوێنێکی دیکە، من ئەگەر لەدیمەشق بمایامەوە نەمدەتوانی جۆرێك بەم جۆرەشتەکانی خۆم دەربڕم، لەهەمان کاتیشدا بروامان وابوو کەکێشەکە کێشەیەکی رەوایە وەکو چلکاوخۆر بەکرێ گیراو نەبووین

***کەی سوریات بەجێهێشت؟**

-سەرەتای ساڵی 1971چوومە بەیروت، لەگەڵ دەزگایەکی پەخش و بڵاوکردنەوە کارم دەکرد.

***هیچ هۆیەک هەبوو وات لێبکات لە سوریا دەربچیت؟**

-من خۆم پیاوێکی رەقەکار و شەڕانی بووم، هەستم بەو کرد کەلەگۆڕەپانی سوریا جێم نابێتەوە.

***هیچ کاتێ لەگەڵ نووسەرانی سوریا کارت کردوە؟**

-بەڵێ... من لەسەرەتاکان بوم کەچوومە ریزی نووسەران، ئەوکاتە من بچووکترین کەس بووم کەلاپەڕەیەکی رووناکبیریی لەرۆژنامەی(الثورة) پێسپێردرا، تەمەنم تەنیا(20) ساڵان بوو، تەماشام کرد بەردەوام بوونم لەوێ کارێکی موستەحیلە، وابزانم بەیروت ئەوکاتە پایتەختێکی رووناکبیریبوو، ئەوەبو بڕیارمدا بچمە ئەوێ و لە دەزگایەکی پەخش و بڵاوکردنەوە کاربکەم، دواتریش لە گۆڤارەکان و دواجاریش لەگەڵ فەلەستینیەکان.

***ئایا ئەو دەمانەی کەسوریاو لوبنان وەک یەک وڵات وابوون تووشی هیچ گیروگرفتێک نەهاتی؟**

-لەسێ ساڵی یەکەمم نا.. بەڵام دوای ئەوەی شەڕ دەستیپێکردو دنیا بوە گەڕەلاوژە و لەگەڵ هاتنی سوریا بۆ لوبنان وردە وردە تەوقەکان تەنگبونەوە، بەتایبەتیش ئەوکاتەی سوریەکان ئابڵوقەی چادرگاکانیاندا یان ئەوکاتانەی کەخاڵی پشکنین و پاسەوانیان لەسەر سنووری چادرگاکان دانا، ماوەیەکی زۆر لەناوچەیەکی سەلامەت بووین، بەڵام هەر بەناسنامەی ساختە هاتوچۆم دەکرد تا ئەوکاتەی لە بەیرووت دەرچووم.

***ئەمە راست بوو وەک شێرکۆ بێکەس گوتەنی کورد و فەلەستینی لەیەک زیندان دەژیان؟**

-جاری وایە زیندانەکان جیاوازن، واتێبگەم زیندانی فەلەستینیەکان فراوانتربوو، زیندانی کوردەکان زۆر تەنگبوو.

***لەم دواییەدا شێرکۆ بێکەس لەوتارێکدا باس لەو کۆبونەوەی نوسەرانی عەرەب دەکات دەڵێ: بۆچی سەلیم بەرەکاتی تێدا نیە؟**

-من لەگەڵ نیشانەی پرسیارێکی گەورەوە جیاکراومەتەوە.

***غەزەب لێگراو بوویت**

-بەڵێ، ئەوان کاتێ منیان بوێ بەزۆر پێداگرتنەوە داوام دەکەن، کەبیانەوێ لێم رزگاربن، بەبیریان دێتەوە کەمن کوردم. بەهەرحاڵ ئەمەشتێک نیە، ئەم جۆرە کۆبونەوەی یەکێتییەکان و کۆڕانە هەر هەموویان بێ سوودن.

***سەرەتای نەوەدەکان زۆربەی نووسەرانی فەلەستینی گەڕانەوە بۆفەلەستین ئایا داوایان لێکردیت لەگەڵیان بڕۆی بۆ ئەوێ؟**

*ئەڵبەتە پێشتریش ئاماژەم بۆ ئەوەکرد، تەنانەت ناوی منیان دابوە دەسەڵاتدارەکانیشیان و رەزامەندیشم بۆهاتەوە، رەزامەندیەکی گەورەش، ئەوکاتە گۆڤاری"کەرمل"یش گوێزرابۆوە. بۆ ئەوێ و ببوە دەزگا، دەزگای"کەرمل" وەزیفەکەشم مسۆگەر بوو بەمانگانەیەکی زۆر چاکیشەوە، بەڵام دوای ئەو هەڵوێستە نابەجێیەی ئەوان لەگەڵ رژێمی عێراقی دابڕانێک لەنێوان من و گەلی ئەوان روویدا.

***ئایا ئەمە هۆی سەرەکی بو؟**

-بەدڵنیاییەوە، هۆیەکی زۆر ناڕەحەتکەریشبوو بۆ مانەوەی من لەگەڵ ئەوان کە لەگەڵ ئەوان کارم دەکرد، رۆژانە خەڵکانێکم دەبینی بەشێوەیەکی سەیر باسی(صدام حسێن) یان دەکرد، هەموو رۆژانێک شەڕە قسەمان دەبوو، هەر لەبەیانیەوە تا ئەوکاتەی دەوام تەوا دەبوو.

***کام نووسەری فەلەستینی زۆر لێت نزیک بوو؟**

-مەحمود دەروێش لەهەموویان زیاتر، ئەو لەهەموان پاکترو لەهەموان راستگۆتربوو، کەسێکی زۆرپاک بوو،

***ئێستاکە پەیوەندیت لەگەڵ نووسەرانی فەلەستینی ماوە؟**

-لە ناو فەلەستینیەکاندا هێندێ نووسەر هەن زۆر برادەرمن، مەحمود دەروێش یەکێکە لەوانەی کەبەردەوام پەیوەندیم پێوە دەکات، تەنانەت لێرەش.

***لەئاراوگەوە بۆ ئاراوگە، کەی دەگەڕێیتەوە بۆ کوردستانی نیشتمان؟**

-بگەڕێمەوە بۆ کوردستان؟ پرسیارێکی زۆر سەختە، نازانم، ئەو رۆژەی کەبەتەواوی رزگار دەبێت. من پیاوێکی خەیاڵیش نیم، بەڵام ئاخۆ کوردستانێک لەم سێگۆشە شەیتانیەی بەرمۆدا، دابێت رزگار دەبێ! من خۆم رۆژانە هەست دەکەم گەڕاومەتەوە و لەوێم، کاتێ کەکاغەز دەخەمە بەردەمم، دەچمەوە ئەوێ.

***چۆنە ئەگەر میوانداریت لێبکرێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، چونکە وابزانین خوێندەواری کوردو نوسەرانی کورد حەز دەکەن لە نزیکەوە ئاشنات بن؟**

-من یەک بەباری خۆم زۆرم پێخۆشە سەردانی کوردستان بکەم، بەڵام حەزدەکەم لەباردۆخێکی پاکتر سەردانی بکەم. ئەم برینە کاریگەرەی ئێستا هەیە نازانم لەکام بەر بوەستی باشە بۆ ئەوەی قاچت بەخۆن نەبێ، پەنا بەخوا ئەوکاتەی کەکاروبارەکان پتر ئاسایی دەبنەوە.

***ئایا خۆت بەمرۆڤێکی نەتەوەیی دەزانی؟**

-مەبەستت لەنەتەوەیی چیە؟

*واتە شانازی بەنەتەوەکەتەوە بکەیت.

-من کوردم بەڕەگ و بەباوەڕو بەئەدەبەوە، بەڵام ئەم بڕوایەی من زۆر فراوانە، چونکە گەلێ جاران زاراوەی نەتەوەی دەمترسێنێ،بەم تێگەیشتنەی کەروویدا، بەتایبەتیش کەئەزمونێکی زۆر تاڵمان لەگەڵ نەتەوەییەکانی عارەبدا هەیە.

***تا چ رادەیەک ئاگات لەئەدەبی کوردی هەیە؟**

-بەداخەوە زۆرکەم هەرئەوەم ئاگالێیە کەدەکرێتە عارەبی، ئەمەش کەمە، بەهەر حاڵ ئێستا کە یەکێک هەیە بەنیازە فایلێک لەسەر ئەدەبی کوردی ئامادەبکات، من خۆشم هێندێ دەقم بۆ پەیداکردوە، بە تایبەتیش هی ئەو نووسەرانەی کە بەکوردی دەنووسن، هەوڵ دەدەین وەرگێڕیان بۆ پەیدابکەین، بەتەماین لەقوبرس چاپ بکرێ، فایلێکی تایبەت لەسەر ئەدەبی کوردی بۆ زمانی عارەبی، ئەمە کارێکی پێم وایە ئێستا لە کوردستان بزاڤێکی وا هەیە بۆ وەرگێڕان بەم مەبەستە ئەو کەسەم هانداوە کە ئەم کارە بکات. ئەمەش دەبێتە یەکەمین فایل لەسەر ئەدەبی کوردی، ئەگەرچی رەنگە هێندە بەرفراوانیش نەبێ، چونکە بەڕاستی جۆرە تەمبەڵیەک لای ئەوانە دەبینم کەدەتوانن ئەدەبی کوردی وەربگێڕنە سەر زمانی عەرەبی چونکە بۆ خوێندەواری کورد هێندە سەخت نیە ئەدەبێک بەزمانی عەرەبی بخوێنێتەوە، بەڵام دیوارە زمانێک لەنێوان خوێندەواری عەرەب و ئەدەبی کوردیدا هەیە. من بە بۆچونی خۆم تەمبەڵیەکە بۆ هەردوولا دەگەڕێتەوە. بەتایبەتیش لایەنە کوردیەکە.

***پێت وانیە کەجۆرە تەمبەڵیەک لە ناو رووناکبیرانی عارەبدا هەیە، سەبارەت بەتێگەیشتن لە ئەدەبی کوردی؟**

-من تەمبەڵیەکە بەم جۆرە لێک نادەمەوە، ئێمەی کورد لەناوەندێکی عەرەبی ژیاوین و عارەبی دەزانین، بەڵام ئەوان کوردی نازانن، چونکە بەزمانێکی نامۆی دەبینن. بەتایبەتیش لەناوچەکانی خۆشماندا کەسانێک هەن کوردی ناوانن، جا چۆن لۆمەی ئەوانە بکەم کە لەقوولایەکەوە دێت هیچ جۆرە تێکەڵاویەکیان لەگەڵ کوردان نیە.

***ئەمە راستە، بەڵام لەم دواییەدا مەسەلەکە گۆڕاوە، پێشان کورد هیچ دەرگایەکی رووناکبیری و چاپەمەنی**

نەبوو تا بەئازادی ئەوەی دەنووسری بڵاوبکرێتەوە، چونکە هەموو لەلایەن دەوڵەتەکانەوە مونوپول کرابوو، واتە دەوڵەت بەلایەوە گرنگ نەبوو یان گرنگی نەدەدا بەوەرگێڕانی ئەدەبی کوردی بۆ سەر زمانی عەرەبی، تەنانەت ئەگەر کوردەکان خۆشیان وەریان گێڕایە زۆر سەخت بوو ڕێگای بڵاوکردنەوەیان بدرێ، چونکە لەگەڵ سیاسەتی ئەوان ئاوکوف نەبوو، ئەوەش زوڵمێکی گەورەبو لە ئێمە دەکرا.

—جا دەوڵەت هەر ئەم خەتایە گەورەی کردوە؟ خەتاکانی ڕژێمە عارەبییەکان لەژماردن نایێ، ئەڵبەتە کە لەم بوارەوە بەربەرەکانی کوردیان کردوە، بەڵام بەڕاستی ئێمە ناتوانین گوشار بخەینە سەر ڕژێمێکی عارەبی یان دەزگایەکی عەرەبی تافێری کوردی بێ بۆ ئەوەی بەرهەمەکانمان بخاتەڕوو، ئەمە کاری خۆمانە، بائێمە کتێبەکانی خۆمان وەرگێڕینە سەرزمانی عەرەبی و بزانین چی دەبێ؟

*ئێستا لە کوردستان خەریکە مەسەلەی وەرگێڕانیش گرنگی پێدەدرێ و بەرهەمە کوردیەکان وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی عەرەبی.

—بەڵام ئەمە هەر لە کوردستانەوە گۆشەگیربوە، من نازانم دەبێ بەدوای ڕێگایەك بگەڕێین ئەم کتێبە کوردیانەی دەکرێنە عارەبی بگەنە دەرەوە، باپەیوەندی بەکتێبخانە عارەبی و ئەووپیەکانەوە بکرێ بۆ سەرف کردنیان ئێستا کۆمپانیای تایبەت هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی کتێب و هی بازرگانانە، هیچ پەیوەندیەکی بەسیاسەتەوە نیە، لەم ڕێگایەوە دەکرێ کتێبی کورد بگاتە ناوچە عارەبییەکان: بەتایبەتیش کە کتێبە کوردیەکان مۆرکێکی سیایسی یان پێوەنەبێ کەپەیوەندی بەواقیعی عەرەبیدا هەبێ، یالەوێ شێوازێکی سیاسیشی هەبێ دژی حاڵەتە کوردیەکەین.

*باشە خۆ کتێبەکانی تۆ ئەدەبین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەزۆربەی وولاتە عاربیەکان قەدەغەیە؟

—ئەمە پەیوەندی بەواقعێکەوە هەیە برین دەخاتەوە.

*جاپێت وایە ئەوەی وەرگێڕدراوی کوردی ئەم برینە ناخاتەوە؟

—من نە لەسوریا نە لە عێراق چاوەڕوانی ئەوەی لێناکەم بڵاوبێتەوە، بەڵام لەولاتانی کەنداو دەکرێ، هەرواش لەولاتانی عەرەبی ڕۆژئاوادا، بەڵام پێویستی بەجولانەوەی بڵاوکردنەویەکی بەهێز هەیە. ئێستا کە کتێب دوای چاپ کردنی پێویستی بەپلانێکی دارێژراو هەیە تا بڵاوبکرێتەوە، ئاخر کتێب چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی مەسرەفێکی زیادەیە، دەبێ پێشتر لەو ولاتەیەی بگەڕێن بۆ دابەشکردنی، ئینجا چاپیان بکەین.

*سەلیم بەرەکات کێیە..؟

—کوردێکەو هیوادارە ببێتە ئەدیب(بەپێکەنینەوە).

*جار وایە تۆ پەنا وەبەر ئەفسانە دەبەیت، یان دەگەڕێیتەوە بۆ ئەفسانەی کوردی من لە(فەقێکانی تاریکی) و(بەراموج) دا هەستم پێکردووە کە زۆر پەنا وەبەر ئەفسانە دەبەیت، ئایا زۆر سەخت نایینی کەئەفسانە لەگەڵ واقیع بگونجێنی؟

—نەخێر هەرگیزلام سەخت نەبوە، چونکەئەفسانەش خۆیلە خۆیدا گواستنەوەیەکی ئەدەبیە، بەڵام دەمێنێتە سەرئەوەی چۆنی بەکاردێنی، ڕاستە من ئەفسانەی کوردیم بەکاربردووە، بەڵام نەك بەشێوەیەکی فراوان، بەڵکو چەند برگەیەکم هەڵبژاردوە، کەپەیوەندییان بەمێژووی کوردەوە هەیە، بەتایبەتیش مێژووی تازەی سەرەتای ئەم سەدەیە تا ئەمڕۆ، چەند نموونەیەکی ئەم مێژووەم بەکارهێناوە و واقیعێکم لەگەڵ موتوربەکردوە کەخوێندەوار سوودی لێ دەبینێ، کورد و غەیری کوردیش، مێژووی ئەو کوردەی کەشەریك بو لەم ناوچەیە، یان خاوەنی ئەم ناوچەیە بوە پێش ئەوەی خەڵکانی دی بێتە ئەم ناوچەیە، مەسەلەی بەکارهێنانی ئەفسانەش شتێکی بەربڵاوە لەجیهاندا، وەك کوردێك مافی خۆمە ئەفسانەی خۆم بەکاربێنم لە کاتێکدا کە خەڵکانێك هەن ئەفسانەی دی بەکاردێنن، بەڵام وەك باوە ئەفسانەدەبێتە میراتێکی مرۆڤایەتی، ئەمەش ئاشکرایە کەهێندێ ئاکار و بابەت لە ئەفسانەی گەلاندا دووبارە دەبنەوە، وەك ئەوەیلەیەك سەرچاوە هەڵقولابن، بەڵام تۆ چۆنی بەشێکی دەستەمۆ دەکەیت و بەکاریدێنی، یان هەر هەموو بەکاردێنی لە چوارچێوەی دەربڕینی کەسایەتی خۆت، ئەمەش مەسەلەیەکی دیکەیە.

*لەرۆمانی"پەراموج"دا تۆ زیاتر پەنات وەبەر ئەفسانەبردووە،بەتایبەتیش"ئەفسانەی مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی، تەنانەت ناوەکانیش وەك خۆیان بەکارهێناوە، هەروا لە شوێنێکی دیکەدا لەبەشی دووەمی ڕۆمانەکە وەك بەبیرم بێ، ئەفسانەی بارام جۆر بەکارهێناوە و بەستۆتەوە بە"سمکۆ" شکاك، کەلەوانەیە خوێندەوار بەسەختی بتوانی ئەو پەیوەندیە لەنێوان ئەفسانەو ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە بدۆزێتەوە، ئایا بەلای تۆ ئەمە گەڕانەوەیە بۆ ڕەگ؟

—من بەگەڕانەوەی دانانێم بۆ ڕەگ و ڕیشە، بەڵکو بۆچوون و بیرکردنەوەی میللەتێکە، دەخرێنە ناو ڕۆمانێ: چیرۆك و حیکایەت بیرکردنەوەو بۆچونی میللەتان، من ناوێکی پاڵەوانەکانی(مەم وزین)م وەرگرتوە، کە باوکە ناوی کوڕەکەی خۆی ناوە"مەم" چونکە دەستی بەکوردیەتیەکەی خۆیەوە گرتووە، کەسایەتی"سمکۆ"شم خستۆتە پاڵ چونکە کەسایەتیەکی ڕاستەقینەی کوردیەو خەونەکانی پەیوەندیان بەگەلی کوردەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا من واقیعم بەهێندێ شت موتوربە کردوە کە لەژیانی ئەواندا نەبوەو لەڕۆمانەکەدا من ڕێچکەیەکی دیکەم بۆ خولقاندوە، ئەویش گەڕانەوە بەدوای ئازادی، گەڕانەوە بەدوای شاری باوك کەنامەکانی بۆ مەهاباد دەنێرێ.

*بەڵام بۆ خۆشت ئەفسانەت دروست کردوە؟

—بەڵێ من خۆشم جۆرە ئەفسانەیەکم داهێناوە، خەڵکانێك هەن کەیەکێك لەناویاندا کوردە و دەستێکی هەیە بەپەراموج کۆتایی دێ ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەئازادیەوە هەیە، پەیوەندی بەخەونەوە هەیە، ئەو لەدوای کەسێك دەگەڕێ تا بەهەشتی نیشان بدات و نایدۆزێتەوە. ئەمەش گیانی کوردانەیە لەم دنیایەدا بەدوای چارەسەرێك کەزۆرجار خەیاڵیە، ڕۆمانەکە دەوڵەمەند دەکات. بەهەرحاڵ ناتوانم زیاتر ڕوونی بکەمەوە.

*ئەم پیاوە تەمومژاویە کێیە لە ڕۆمانی(پەراموج)دا؟

—زۆر کەس لێیان پرسیوم ئەم پیاوەکێیە؟ ئەگەر من پێناسەیەکی تەواوی ئەو کەسایەتیە بکەم، ئەوە ڕۆمانەکە دەکەمە ڕەمزیەکی شێوەیی و گرێکانی دەکەمەوە کتێبەکە فرێدەدرێ. ئەم پیاوە گەورەیە گەڕانێکی ڕەوای کوردە لەو باریکە ڕێیە تاریکانەی دنیا لەژێر زەمین و کۆڵانەکانی بەدوای ئەو کەسەی کەفریات دەکەوێ، جا دەیدۆزێەوە یان نایدۆزیەوە.

*بەگشتی لە نووسینەکانتا زۆر پەناش وەبەر بەکارهێنانی ئاژەڵ دەبەی، جا ئەم ئاژەڵانەماڵی بن یا کێوی.. بۆ؟

—ئێمە میللەتێکین بەستراوینەتەوە بەسرووشتەوە، بەهەرحاڵ لەو شوێنانەی کەئێمەی لێدەژین کۆمەڵێ ئاژەڵیش لەم بەسروشت شەریکمانن و لێشمانەوە نزیکن، بەماڵی و درندەیانەوە کەلەدەرەوەی سنووری گوندکەت یا لەدارستانەکەی دەوروبەرت دەژین. من هەر لەبەرئەوە پەنام نەبردۆتە بەریان. بەڵکو لە زۆربەی نووسینەکاندا بەکارم هێناون، چونکە هەمیشە لای من ئاژەڵ ئەو بەشەن کە زیاتر ئازادن. ئەوان لای من ڕەمزو هێمای ئازادین،بەشێکن لەو غەریزەیەی کەهەتا ئێستا سەرکوت نەکراوە، ئاژەڵ تەنانەت ماڵیەکانیشیان تاڕادەیەك ئازادانە ڕەفتار دەکەن،

ئەوانە نەبن کەدەستەمۆکراون و لەسێرك کاریان پێدەکرێ، بۆیە دەڵێم ئەو ئاژەڵانەی هێشتا غەریزەکەیان سەرکوت نەکراوە، غەریزەکەیان ئازادییانە. تا ئێستا لەگەڵ.. باو لەگەڵ بێسنوریدان ئەڵبەتە کە زۆر زیاترم دەربارەی ئاژەڵ نووسیوە زۆریش قوڵتر لەوەی کەئێستا باسی لێوە دەکەم.

***ئەو رووداوانە چین کەکاریان تێکردیت؟**

—پێم وایە ئەمە تەفاسیلە جار وایە رووداوێك وەك لێدانی کاتژمێر زۆر کاردەکاتە سەرت. بەڵام من پێم وایە کورد بوونم لە هەموو شتێك زیاتر کاری کردۆتە سەر ژیانم. من کارەساتم تووش دێن لەبەرئەوەی کەکوردم، ئەمە لەهەموو شتێ: زیاتر کاریگەری هەبوە لەسەر ژیانم.

***کە لەشام بووی، ئایا هەربەم نەفەسە دەتنووسی، مەبەست ئەوەیە ناوەڕۆکی نووسینەکانت هەر وابوون..؟**

—لەپێشدا، من کە سوریام بەجێهێشت تەمەنم بیست ساڵان بو، لەبەرئەوە نابێ چاوەڕوانی شتی زۆرم لێبکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا هێندێ شیعرم لەسەر ناوچەکەی خۆمان نوسی و شتەکانم بەناوی خۆیانەوە ناونابوو، زێ، شوێنی هەموو شتەکان بەهەرحاڵ بەگشتی ئەوانە شیعرە سەرەتاییەکانم بوون قۆناغی گەشەکردنی زێتربوون، بەڵام کامڵ بوونم لەبیروتەوە دەستی پێکرد کە دەستم کرد بەبڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، من کەدەستم بەنووسین کرد ئەوەندە لەسوریا نەمامەوە، چونکە ئەو دەمە لاوێکی گچکە بووم.

***لەم دوایەدا لەنووسینەکانتا زۆر دەگەڕێیتەوە بۆ زێدەکەت(شوێنی لەدایك بوونت بۆچی؟)**

—شوێن، شتێکی دیکەیە، قەت شوێنم لێدوورناکەوێتەوە، تەنانەت ئەو کاتانەش کەلەوێ بووم، ئەو دەمەی تەنیا شیعریشم دەنووسی و ئێستاکەش هەروا شوینم لەبیرناچێتەوە، چونکە ئەو زەمینەیە کەتا ئەمڕۆش کاری لەسەردەکەم زۆرجار وادەبێ لەو شوێنەی کەلێی دەژیم دوور دەکەومەوە، بۆ نموونە: لەرۆمانە سێیانەکەم شوێن لە نێوان کۆمەڵێ شوێنی کوردستان تێکەڵ بوە، باکوری رۆژهەڵات، باکوری رۆژئاوا، باکووری سنووری تورکیا لە کوردستانی تورکیا، قوبرس، رۆمانەکان تێکەڵاوی یەکترن.

***هەست بەوە دەکرێ کە هێندێ جار شوێن وەك"جیناس" بەکاردێنی، بۆ نموونە، "لەپەراموج"دا "جەزیرە"ت بۆ قوبرس و جەزیرەی سوریاو جەزیرەی یۆنان بەکارهێناوە.**

—بەڵێ.. لەدوا رۆمانیشمدا"انقاض الازل الثانی" شوێنی وا هەن کەنەمدیون و تێیاندا نەژیاوم، روداوەکانی لەمەهابادەوە دەست پێدەکاتاشنگال، رۆمانێکی تەواو کوردیە، بە هەموو سەربردەو کەسایەتی و شوێن و خەڵکەوە.

***لە کاتی نووسیندا یان پێشتر بێئۆقرە دەبیت؟**

*نووسین، تەنیا کەکاغەزی سپی لەپێش خۆت دادەنێی، ئەمە خۆی لە خۆیدا تاقیکردنەوەیەکی شێتانەیە، دووچاری(ئینهاری عەسەبیت) دەکات ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر بەئەخلاقەوە رەفتاری لەگەڵ بکەی، نەك بەدووروویی، من کاتی دیاریکراوم هەیە بۆ نووسین، هەروەها کەبابەتێکم نووسی دەستی لێهەڵناگرم تا تەواو دەبێ، واتە من لەو کەسانەم کە رستەیەك ناڕێك بوو یا بەدڵم نەبوویا بەدڵنەبوو هەڵی ئەگرم بۆسبەی بۆ ئەوەی چاکی بکەم بەڵکو وازی لێناهێنم تا کامڵ دەبێ.

***پێناسەت بۆ ئەمانە.**

—ژن: زۆر سەختە پیاوپێناسەیەکی دەقاودەق بۆ شتێك بکات بەتایبەتیش کە ئەوشتە مرۆڤ بێت، چونکە رەنگە ئاسان بێ پێناسەی فیزیا، کیمیا، ... هتد بکەین. چونکە ئەوانە توخمی سروشتین. بەڵام ژن شتێکە(غامزە) و هۆگرەو سادەیە، خراپە زۆر زۆریش باشە بەڕاستی ناتوانم بەوشەیەك پێناسەی بکەم.

***دەتەوێ بڵێت کە ژن شتێکی سروستی نیە؟**

—بەڵێ

شیعر: ئاخاوتنە لەگەڵ شتێکی تەم و مژاوی، زمانی‌تەمومژاویە، هەرگیز جڵەوی دەربڕین لەخۆوت نەگری.

***بەشێوەیەکی گشتی ئایندەی کێشەی کورد چۆن دەبینی؟**

—کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزە،زۆریش سەختە بۆیێ دەترسم زۆر زوو بچمە ناو هزرەوە، بەڵام بۆچوون ئەوە ئەوەکانی ئاینده دروستی دەکەن، من بەڕاستی ناتوانم هیچ لەم بارەیەوە بڵێم. توانای ئەوەم نیە.

***ئاساییە دەزانی نووسەر سیاسیش بی؟**

—بێگومان. لەبەرئەوەی بەر لەهەموو شتێك مرۆڤێکەو بیردەکاتەوە، سیاسەتیش خۆی بەشێکە لەبیرکردنەوەی مرۆڤ، بەشێکی گەورەش، چونکە رۆژانە بەرخوردی لەگەڵ دەکات، بۆیە نووسەر خۆی گیانداریکی سیاسیە.

***زۆر لە نووسەران(ئیدیولیکیان) سومبیلیکیان هەیە، تۆکێ بەسومبولی خۆت دەزانی؟**

—زۆر لە نووسەرانی دنیا بۆ نموونە"هرمان مەندل" "کافکا" "ئەدگار ئالأن بۆ" بەڵام رۆمان نووسەکانی عارەبم خۆش ناوێن چونکە گەلێ زۆر بلێی دەکەن منیش خۆم حەزم لەزۆر بلێی نیە، ئەوان لە تەکنیکی تازە ناگەڕێن. یان خۆ ماندوو ناکەن. لەوانەیە"ئەجیب مەحفوز" باشەکەیان بێ.

***نەفسیەتی مرۆڤی کورد چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

—مرۆڤی کورد وەك هەر مرۆڤێکی ئەم جیهانە، جگە لەوەش ئازارەکانی سەربارن، ئەو ئازارانەی کەبەهۆی کوردبوونیەوە دووچاری دەبێ، لەشوێنێك کەکیانی نیە، ناسنامەی تەواو نیە، ناسنامەی ناتەواویش هەمیشە ئازار بۆ مرۆڤ دێنێ بەتایبەتی کە ئەو مرۆڤە دەخوڵقێنێ بۆ ئەوەی دەربڕینت دەوڵەمەندو ئاڵۆز بکات. من واله مرۆڤی کورد دەگەم.

***چۆن ئەدەبی ئێستای عەرەبی هەڵدەسەنگێنی؟**

—ئەدەبی عەرەبی لەم قۆناغەیدا تەنگ و چەڵەمەی زۆرە، چونکە تووشی بەڵای خۆی بوە بە رژێمەکانیەوە، کەوا دەکەن بۆچوونەکان بشێوێندرێن هەموو رژێمەکان بۆچونەکان دەشێوێنن، ئەمەو نەبوونی رەخنەو نەبوونی دیموکراسیەت، ئەوانە هەمووی کاردەکەنە سەر داهێنانی ئەدەبی، بەشێوەیەك لە شێوەکان قەبارەیەکی زۆر لەنووسەرانی عارەب رایانکرد بۆ دەرەوە، فەرەنسا، بەریتانیا، پڕبوە، باشترین ڕۆژنامەی عارەبی لەبەریتانیا دەردەچێ بۆچی...؟ چونکە واقیعی عەرەبی واقیعێکی ترسناك و تۆقێنەرە، تەنگژەکەیان قەیرانەکە تەنگژەو قەیرانی گێلی و دیموکراسیە، ئەمەش بمانەوێ و نەمانەوێ، لەسەر هەموو شتێك رەنگ دەداتەوە، جا ئەگەر ئەم هەموو تەنگژەی دیموکراسیبوون و دەربڕین هەبێ وەك ئەوەیە کەجەستەیەك بەتەواوی نەخۆش بێ، دیارە کە لەم حاڵەتەشدا ئەدەب سەلامەت نابێ.

***بەڵام بۆچوونێك هەیە کەدەڵێ، زۆربوونی تەنگژەو قەیران، دەبێتە مایەی داهێنان و هەڵسانەوەی ئەدەب، تۆ دەڵێی چی؟**

—بڕوانە، کاتێ کە"بیکاسۆ" و"سلڤادوردالی" رایان کرد بۆ فەرەنسا، هەروا نیوەی نووسەرانی ئەمریکای لاتین، راستە تەنگژەو قەیران خەیاڵ دەوڵەمەند دەکەن، بەڵام تۆ خۆت لەشوێنی تەنگژە و قەیرانەکان بیت شتێکی دیکەیە، بەر لەوەی بۆمبایەك بەسەرتدا بەر بێتەوە تۆ ناتوانی حاڵەتی خۆت روون بکەیتەوە، ئەوە نەبێ کە هەست بە ترس دەکەیت.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری ئاینده، ژمارە (18)

# جوانی گوزاری لەلای (سەلیم بەرەکات)

## لەنێوان پەرۆشی سەردی بۆ شوێن و پانتایی پێشنیارکراو لە شیعردا

خوا لێخۆش بوو
حەمید رێبوار
(سلێمانی)

ئەگەر بمانەوێ بگەینە ئەو نیازمەندی و گرفتە دەلالی و زمانەوانییانەی دەق دەیانخاتەڕوو، دەبێ سەودای ئەو پێوەندییانە بکەین کە سستەمە ناخۆییەکانی دەق دەبەستێتەوە بەرەهەندەکانی ئەزمونە هەمیشەییەکانی نووسەر و مامەڵە کردنی لەتەك چەمکە ئایدۆلۆژی و پێشبینییە تایبەتییەکان لە بونیادی دەقدا، یاخود واقیعی ستەمی رۆژگار بەسەر باری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی لە ناو رێسا شاراوەکانی دەقدا بخرێتەڕوو. بەم شێوەیە ئەگەر بمانەوێ بەرهەمەکانی نووسەر بخوێنینەوە یان تیشکێکی بخەینە سەر، ئەوا دەبێ لەو پێوەدنگەوە بەها مەعریفی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و پابەندبوونیان بەرەوشتە پەروەردەییەکان بکەینە یەکەم هەنگاو بۆچوونە ناو جیهانی هەمە چەشن و پێشبینییەکانی(سەلیم بەرەکات)، چونکە سەلیم بەرەکات وەك لە نووسین و چاوپێکەوتن و بەرهەمەکانیدا دەردەکەوێت. رەنگدانەوەی هەمواری و چەژتنی هەڵاوێردەیەکی سەیرە!، لە هەمواری و چەژتنی خێزان و دەوروبەری کۆمەڵگا، بەرەو موعاناتی گەل و نەتەوە. تەقەللای ئەوە دەدات هەموو کەرەسەو ئەو شتانەی لەمەڕ خۆیەتی، پڕ بە دنیا هاوار بکات، بەشێوەیەك قەوارەی مەودای ئازارەکانی بخاتەڕوو، ڕەنگە هەر ئەم هەستە بێت لە خوێنەوە پالی پێوەبنێت بەرەو روانگەی گریان... بەکورتیسەلیم بەرەکات رۆژنامەنووسێکی بریقەدار و شاعیرێکی زۆر دیارە لە مەیدانی شیعردا و رۆماننووسێکی باڵادەستیشە لەم بوارەدا. هەروەها لەلایەکی دیکەوە ژیاننامە نووسێکی سەیرو بێ وێنەشە. بۆیە نابێت لە یەك رووەوە بخوێنرێتەوە، بەڵکو دەبێ رەچاوی هەموو ئەو لایەنانە بکرێت، کە هەموویان لەلای ئەو هێلێکی پێوەندکاریان لە نێوان دایە، چونکە ئێمە ناتوانین لەو رووەوە سەیری بکەین کە ئەو ئەزموونێك بێت لە دەرەوەی تاقیگەی شیعردا گەشەی کردبێت. ئەو بە پێ لێنانی خۆی، هۆگری کەلەپوور بووەو لەتەك ئەودا دووچاری هەڵچوون بووە، بەڵام ئەم بەم حەزو ئارەزووە ئاسراوەی خۆی لە سنووری بازنەی کەسدا نەماوە، بەڵکو لە رێگەیەکی تایبەت بەخۆی قوڕی هەڵبەستی خۆی هەڵدەسووڕێنێ و پەیکەری نوێی لێ دروست دەکات.

جا ئاخۆ دەبێ(پەرۆشیبۆ شوێن)–وەك گرێیەکی رەوا– ئەو خەسڵەتە پوختە دیارە بێت لە کۆمەڵە شیعرییەکەی ئەم دواییەی سەلیم بەرەکات؟ کە بە ئاشکراو روون، بێ پێچ و پەنا ئەم دیاردەیە خۆی دەدات بە دەستی وەرگرەوە.

ئەگەرچی ئەم کۆمەڵە. ماوەیەکی زۆر دوور نییە کەوتووەتە بەرچاو، پێش چەند ساڵێك دەزگای(تویقال) لە چاپی داو بڵاوی کردەوە، رەنگە داهێنانی تری(بەرەکات)ی بەدوادا هاتبێت، بەڵام هێشتا بەخوێنەری لەمەڕ خۆمان نامۆیە، یان هەر نەی بینیوە، بەڵکو کەسانی وا هەن(بەرەکات) ناناسن و نازانن ئەم داهێنەرە کوردە، بووەتە مایەی حەپەسانی کەڵە نووسەرانی عەرەب و غەیری عەرەب. بە هەرحاڵ بابێینەوە سەر چەمکی ئەو پەرۆشییەی بەرەکات، ئاخۆ دەبێ دواچارەی زمان بەم پەرۆشییەوە بەسترابێت؟ کە بەچێژێکی وەها یەکتری راو دەکەن، تامی ئەو قوربانییەی لێ دێت کە(جلاد)ەکەی لە سەیر کردنیدا دەیچێژێت، هەروەها بەچێژی ئەو(جلاد)ەی کە عاشقی قوربانییەکەیەتی، یاخود بەواتایەکی دی مەرگە دیلی شاعیرەو وەرگری گەنجینەیە، یەکسان دەبێت لەگەڵ پەرۆشییەك بۆ(دەست هەبوونی– تواطوء) لە جلەو راکێشانی زمانێك واز لە راگەیاندنی لێشاوی خۆی و دڕندەیی هەمیشەیی خۆی ناهێنێت.

بەپێی ئەو بەڵگە و کۆدانەی ئەم دوو پرسیارە دەیهاون، دەتوانین سەرکلۆمی کۆمەڵە شیعرەکەی(بەرەکات) بە سانایی بکەینەوە و بگەینە ئەرکەکانی یاسا ناوخۆییەکان و لقەکانی، دیارە ئەم بەگەڕ خستنەش لە ئەنجامی بەرقەرارییەکی هەست پێ کراوەوە هاتووەتە ئارا. زمانیش وەك ئامێرێکی تێگەیاندن لە نێوان کەساندا، شفرەی لە باسکردنی سەراپایی رێزمان و واتاکانیدا دەکرێتەوە. بۆیە یاساکانی ناوەوەی زمان چەند درێژەی فەرهەنگی شیعری خۆی کۆبکاتەوە، بۆ ئەوەی گریمانەی رۆژانەی دیارو روونی خۆی بەگشت تفاقەکانی خۆی ئامادە بکات، ئەوا لە پڕێکدا ئەم رێسا زمانەوانییانە ناڵە مەزنەکەی خۆی ئاشکرا دەکات، بەڵام یەکێك لە خەسڵەتەکانی ئەم ناڵەیەش ئەوەیە کە لەناو وتەکەی خۆیدا هەتەرترو گەورەتر دەبێت نەك لە دەرەوە، ئەم ناڵەیەش بێگومان ناڵەی شیعرە.

هەرکاتێکیش ئەم کردەیە روویدا و سەقامگیر بوو ئەوا زۆر زەحمەت دەبێت چوارچێوەیەکی دی بدۆزێتەوە کە هەردوو سیفەتەکەی پێکەوە تیادا بێت، لەتەریبێکی پەنهان و هەماهەنگی لە چەشنی ئەم چوارچێوەیە، کە کۆمەڵە شیعرەکە راپێچ دەکات و بواری ئەوە دەڕەخسێنێت کەزامەکانی ناوەوەی خۆی و چارەنووسی شیعرەکە ئاشکرا بکات، کە هەمیشە شایستەی ئەو جۆرە لێکدانەوەو تەئویلاتەی زمانی بەرەکات و شیعرەکانیەتی، چونکە بونیادەکانی دەق بەیەکەوە بەستراون و پێوەندییەکی بەتینیان لەگەڵ یەکدا هەیە بۆ پێکهێنانی بونیادە سەرەکیەکە. دیارە ئەم پێوەندییانە پێوەندییەکی لەبارو گونجاون یان ئالەبارن یاخود هەردووکیان بەیەکەوە، چونکە هیچ بونیادێك لەیەکێك

لـەم سـێ ڕووە بـێ بـەش نییـە، لەوانەشـە ئەگـەر زیـاتر ورد ببینـەوە ڕووی چوارەمیش بدۆزینەوە، ئەمەش بێ گومان تەقەللایەکی بێ پایان و کۆششێکی زۆری دەوێ، دەبـێ شـەونخوونی و کـاتێکی زۆریشـی بۆ تـەرخان بکرێـت. پـێ دەچێت زمانی خەون خۆی پاڵپشتی گرفتی گەیاندن بێت لەلای شاعیر، لەبـەر ئـەوەی دەقەکـەی مەبەسـت خـوازی دروسـت کردنـەوەی تـەواوی دووەم جـارەی شـتەکانە. ئەمـەش وا لـە خوێنەرەکـەی دەکـات لـە سـەرەتادا یەکـەم جـار لـە لێکدانەوەکەیدا بدۆڕێت، مـادام نـاتوانێت شـانازی بـەوە بکـات ئـەم دەقـە بخاتـە ڕوو- بەنموونەیەکی دیاری تر ڕوونی بکـەینەوە، باری ئەم خوێنـەرەی دەقەکـەی بەتـەواوی لـەو برسییە دەچێت، خواردنەکـەی بەشـی نـەکات تـێر بخـوات لـەو خۆراکـەی لـە(خـەون)ی نووسـتندا پێشکەشـی کرابێـت. بۆیـە هـەر زمـانێک لـەم کۆششـەوە ڕێگـای خـۆی گرتـە بـەر ئـەوا خوێنـی کەسـی خـۆی دەخـوات، واتـە: لەناو واتاکەی خۆیدا بەر فراوان دەبێت، نەک لەناو ئەو(با)یەی بەهەڵچوونەکانی دەرەکی و کردە سەرنج ڕاکێشەکانی حەز ڕێنمایی بکات. جێی خۆیەتی ئەگەر بڵێین ئەمە ئاماژەی ئـەوەمان بۆ دەکات کە هەستی زمان خـۆی بێت، بێ ئـەوەی سـەیری ئـەو کەسـە بکرێـت کەتیایدایـەتی یـاخود لـە پشـتییەوەیەتی. هـەر کاتێکیش ئەم هەستانە لە ناواخنی قسەدا کەڵەکـە بوون و خـۆی ناخنییـە نـاو کەرەسـەکانییەوە، ئـەوا هـەموو شـەقڵ و خەسـڵەتەکانی لـەو سـاتانەدا دەردەکەوێت، کەتیایدا ئەم قسانەی ئاراستەی جێیەکی بەرفراوان کراوە یاخود پەرۆشییەکە بۆ ئەو شوێنە. بـەم شێوەیە پـێ دەچێت جیا کردنـەوەی زمـان و هەستەکانی بە شێوەیەکی کردەیی زۆر ئەستەم بێت، لەبەر ئەوەی چەندین ئەرک لـەمانادا کۆدەبێتـەوە، لەوانـە ئـەرکی مـەعریفی و ئامـاژەیی، ئـەرکی گوزارشـتی سۆزداری، ئـەرکی ڕەوتـی مـەیل و ئامۆژگـاری، ئـەکی خـۆش دووی و ئـەودیوی زمان، ئەکی شیعرییەت و جوانکاری... تاد.

چونکـە زمـان خـۆی لـە خۆیـدا زاینگەیـە(رحـم) واتـە شـوێنە، هـەروەها پەرۆشیش بۆ شوێن خۆی لە خۆیدا پەرۆشی زمانە بۆ ناو وشیارییە تـاریک و زاینگە شوێنییەکەی و یادەکانی و سەردەمی منداڵییەتی. ئەو دیمەنە ژیانییەی شاعیر بۆی هەڵدەسێتە سەرپێ، هانا دەهێنێت بۆ بانگەشە کردن بۆ شاردنەوەی پەرۆشـییە تێکشـکاوەکە، چونکـە ئـەم دیمەنـە سـەرباری ئـەوەی شـوێنە، پێچەوانـەی ئـەو پەرۆشـییە شـاراوەیە کە لـە پشـت کەڵەکـەی ڕۆژگـارو گەشـتە هەڵاتوو و پەڕاگندە دوورخراوەکانە.

ئاڵەکە لێرەدایە، چونکە بەرزییـەتی دیمـەنی ژیـانی هەنووکـەیی، بەرزییـەتی ئامادە نەبوونی ژیانی شاراوەیە، کەلە هەمان کاتدا مەرگیشە. ئەو بەتـەنیا ئامادە دەبێت، بەڵکو لە هەمووان زیـاتر لـە نێـوان دیلـەکاندا تەنیایـە، بـەڵام ئـەم مەرگـە هاوبەشـی شـاعیرو دیـل و بەندەکەیـەتی. هاوبەشـی ئەوسـاتە بەرزوبووەیـە لـە کاتێکدا گەیشتووە بەرەگە مـەودا دوور و تاریکەدوورەکان. لـێرەدا زۆر دەگمەنـە واتای مەرگ پابەند بێت بە هەستێکی کارەساتی ئەمەش لێکدانـەوە وتـەئویلێکی زۆر هـەڵدەگرێ، کەلەسـەر قسـەی بزرکـاوو تەنگـەتاو دامـەزرابێت. لـێرەدا ئـازاد بوونـی ڕاڤـەکردن دەردەکـەوێت بـۆ بـەها بەرفراوانەکـەی و گواستنەوەشـە بـۆ زامێکی قووڵترو خوێنی کەسێک کە بەدەست هێنـانی قوورسـە و ئاسـان نییـە، وەک بڵێیـت ئـەم(کۆمەڵـە) خەسڵەتی تایبـەتی خـۆی لـە تاقیکردنـەوە زۆرەکـانی ئەزموونی(سەلیم بەرەکات) خـۆی وەردەگرێـت. نـەک تـەنیا لـە لێـواری زمـانێکی نامۆو کێوییەوە، بەڵکو دیسان ئەو هاوتـەریبی ئـەم لێـوارە دەکـات و لـە ئاسـتی پەرۆشییەکی مەزنەوە دەچێتە بەرگییەوە، کە تێکەڵە بە بۆن و بەرامی ڕاهێنانی گاڵتەجاڕوپتەوی ژیان لەلایەکەوە و مـەرگیش لەلایـەکی دییەوە، کام جیاوازییە؟ پاشان کام ماوەی ڕاڤە کردن لە نێوان ژیان و مردندا هەوڵی بڕینی دەدات؟ ئەو مەرگـەی دەسـت دەگرێـت بەسـەر ئـەو دیمەنـەی کـە لەسـەر کاولکـاری دۆخ دامەزراوە و لە پڕێکدا لە هەمان دەرگاوە لەگەڵ دەرچووندا دەردەچێت، کە ڕووە و ژیان کراوەتەوە و دەڕوات.

لە ڕاستیدا ئەم سەراسیمی و لێتێکچوونەی(التباس) لە نێوان ژیان و مـەرگدا هاتووەتـە ئـارا لەواتاکـەیدا دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕەگ داکوتـانی ئەوگاڵتـە ڕەش و تاڵانـەی کەسـتەم و زۆرداری خۆیـان دەنوێنـن بەرامبـەر ئـەو سـۆز و پەرۆشـییە هـەڵچووەی لـە ڕواڵـەتی نموونـەی دەقـی هـەڵبژێردراودا دەردەکـەوێت، بۆیـە لـەم ڕەوتە دەلالییەدا بێ ئەوەی ڕەچاوی دەستکەوتەکانی دەق بکرێت، هـەوڵ دەدات مۆرکێکی گاڵتە جاڕی بەبەردا بکات، بۆ ئەوەی لە خەسڵەتی نەگۆڕو باوی خۆی دەربازی بکات ڕەنگە ئەم بارە نائاساییەش چەندین پرسیاری تـەماوی و نادیار دروست بکەن، کە پێویستییان بە ڕوونکردنەوەی هەمیشـەیی هەیە بۆ گەیشتن بە وەڵامێکی لۆژیکی لە پێناو دۆزینەوەی نهێنییە حەشار دراوەکانی. لەکاتێکدا ئەم گاڵتەجارییە خۆی لە خۆیدا چـەند ساتێکی لـە خـۆی گرتـووە، ڕەنگـە ئـەو لـوول دانـەی خـۆی بێـت کـەروحی پـێ دەهـەژێت، وەک گوزارشـتێک لـە بـزۆزو شێواوی نادیار و مەرگی شاراوەی خۆی. پاشان دیمەنەکە ئامادە بێت و لەتەک خۆیـدا بۆشاییەکەشـی ئامـادە دەبێـت، ئـەویش کاریگەرییەکـەی قووڵـتر و گوزارشتەکەی لەمەڕ کاولکار زیاترە بەڵکو ئەوەش لەو گوتارە وەسفییەوە دێت کەبۆ دیمەن و شوێن دانراوە، وەسفەکەش دەگاتە شوێن، بەڵام ئەو بۆ تـەڵزم و پـەرت بوونە توندو سەراسیمییە شیعرییەکانی هەڵیدەگرێت. هەر ئـەم هێمنییـە پووکاوەیە لەزمان و ڕواڵـەتی وەسف و گێڕانەوەدا مـافی ئـەوەی هەیـە لـە توێـی خۆیـدا واتایـەکی ڕاهێنـەری هـەڵبگرێت، پێوەنـدی نێـوان دۆخ و گرفتـەکانی دەربڕین لەودا بەدەستی دەهێنێت، واتا لـە نێـوان دیمـەنی ژیـانی بارمتـەکراوی ڕوح و لـەنێوان ئـەو دیمەنـە ژیانییـەی لەبـەر چاودایـە، ئـەم واتـا ڕاهێنەرییـەش لەپڕێکدا پێوەندییەک دەسەپێنێت لە نێوان ڕاهێنانی وشەو بارە دەروونییەکان لەلایەک و لە نێوان ڕاهێنانی(داڵ- البان)دا لەلایەکی ترەوە، شایەنی زانینە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، مامەڵەی نوێ لەگەڵ کەلتووری زماندا ڕەگ ورەچەڵـەکی خۆی هەیـە، دەگەڕێتـەوە بـۆ پێش قۆنـاغی(سـەلیم بـەرەکات)، (ئـەدۆنیس)یـش یەکێکە لەو ناوە گرنگانەی کەنەوبەربەستە پیرۆزانەی بە خۆیەوە نەدیبوو کە بۆ زمـان دانرابـوو. بـەڵام(سـەلیم بـەرەکات) لـە چوارچێـوەی ئـەم تێگەیشـتنەدا- فەرهەنگی زمانی خۆی- دامەزراند.

نەک تەنیا لە ئاستی لێ وەرگرتن و دەرهێنان و پەیدا کردن و دروست کردنە نوێیـەکان(الاشـتقاقات و التولیـدات الجدیـدة) ، بـەڵکو لـە ڕووکردنیـدا بـەرەو پـەراوێزو فـەرامۆش کـراو قسـەی ڕەق لـە وتـەداو پـڕ کـردن و بـارکردنی بەشاعیرییەتێکی زیاتری وەها کەوای لێ کردین یەک لەدوای ئەوی دی دڵنیابین، کەلـەوێدا هیـچ وشـەیەکی شیعری لە پێشتر لە گۆڕێدا نییـە یان یـەکێکی دی لەشیعریێ بەش کرابێت. وشە- تایبەت و گشتی- لەناو بونیادییەکانیا گرنگی خۆی وەردەگرێت. چەمکەکانی دیش- زۆرکۆڵ بـوون- سـەرباری ئەمـە(سـەلیم بـەرەکات) متمانـەی بە کۆمـەڵێ سـەربازی بە ئەمـەک لـە باڵندەو ئاژەڵ و نـاوی باڵندەو ئەو شوێنانە بەستووە کە ئیستیان پێ کردووە، لە تەقەللایەکدا بـۆ بە مـرۆڤ کردنیـان- کـە زۆر سـەرەتایی بێـت- لەوانەیـە وەک کاردانەوەیـەک بێـت لـەوەوە.. بـۆ ئـەوەی ئـەرکی بـەرەنگار بوونـەوەی پـێ هـەڵگرێت بـۆ ڕووبـەڕوو بوونەوەیـەکی دڕ لە نێوان زانینی بەکارهێنانی ئەبجەدییەتێکی تایبەت کە هـەر لەسەرەتاوە وەریدەگرێت.

بۆیە ئەگەر بتەوێ یەکەم شفرەی ئەم ئەبجەدییەتە بکەیتەوە، دەبێ لە یەکەم تیشك هاویشتنی ئەدەبی ناونیشانەوە دەست پێ بکەیت، تا پێوەندییەکانی مەبست خوازی دەق لە راڤەکردنی بنیاتدا دیاری بکەیت، بۆیە ناوەرۆکی گێرانەوەیی(سەردی) تارادەیەکی زۆر لە گرتنەبەری هەنگاوە هەنووکەییەکانی ناو کۆمەڵدەردەکەوێت و بەئاشکرا واتا سەراپاییەکانی بدات بەدەستەوە، ئەوسا رەهەندە دەلالی و سرووشیەکان لە هەستی وەرگردا دەبنە هێزێکی بەکێش، ئەم گەمە زمانەوانییانەی (بەرەکات) لە شیعردا لەرووی دەنگ وریتم و رستە واژە و تەنانەت پیتەکان وای کردووە تاموبۆیەکی حیکایەتخوانی بەچامەکانی ببەخشێت یاخود بە پێچەوانەوە هەناسەیەکی شیعرییانە بە چیرۆك و رۆمانەکانی دەدات، دیارە ئەم دیاردەیەش لە هۆشیارییەکی نوێ و وێنەیەکی بەرچاو هێنەوە هاتووە و لەبەردەم کەسایەتیەکی ئاساییدا خۆمان نابینین بەڵکو لەبەردەم گرنگی مرۆڤێکداین دەزانێت ئینتیمای بۆچی و بۆکێ هەیە؟. لەلایەکی دیکەوە ناوەرۆك لەلای ئەو ئەرکێکی نەتەوایەتییە، هەر ئەو ئەرکەشە پاڵی پێوەناوە داهێنانی گەلێ سەرکەوتوو لەچێوەی شێوەی رۆمانەکانیدا بەدی بهێنێت. کەواتە حیکایەتی گێرانەوە لە لای(سەلیم بەرەکات) چۆن دەست پێ دەکات؟ چۆن ئەم سەردە پڕ لەنامۆ نامێزانەی لەژێر رکێفی شیعرەوە دەچێتە سایەی ئەو گێرانەوەیەی کە هەمیشە لە شیعرییەتی خۆیدا هۆگرە؟ رەنگە لە رۆمانەکانی(سەلیم بەرەکات)دا ئەو خەسڵەتە بەدی بکەین کەلە شیعرەوە نزیکەو زیاتریش بەخودی نامۆ بەشوێنەوە لکاوەو لە زمانێکدا چێنراوە کە پانتاییەکی هەڵواسراو لە شوێنێکی وەها کەهەمیشە مایەی پێشنیار بێت. شیعرییەتی(دەق/حیکایەت)یش لە رۆمانەکانی (سەلیم بەرەکات)دا سیماکانی خۆی لە دارشتەیەکی وادا رووپۆش دەکات و نوقوم دەبێت رەنگە لەچڕی شیعرو پێش بینییە کراوەکانی کەم بکاتەوە، بەلام ئەمەش بەستراوە بە پێکهاتەیەکی بیناسازی ستاتیکی ئەویش ئەو پێکهاتە سەردییەیە کە بەستراوەتەوە بە بونیادگەری گێرانەوە بە(شیعرییەتی نادڵنیایی- شعرية اللايقين) ئەم هۆگرییەی کە خوێنەر تیایدا بە رۆمانەکانی(بەرەکات)ەوە دەگلێت بەرەو چەندین رووپۆشی و شۆڕبوونەوەی تری دەبات، لەوانەشە هەندێ کەس لێی دەرباز نەبێت، بە تایبەتی ئەو نموونانەی زۆر روون و ئاشکران. بۆ نموونە لە رۆمانی(پەڕ-ریش)دا دەخوێنینەوە: "ئەگەر باران وەستا چەندین ناوی دڵخواز لەچەندین هەرێمی دڵڕفێن و چڕ رادەمێنێ.. بەپێی ئارەزووی(با) و کاری هەور... تاوە نا تاوێك رووبەرە فراوانەکان یاخود بەر تەسکەکان تۆزێك دەکرانەوە بۆ هەسارە هەرە دوورەکان، رەشییەکی قەترانی پێك دەهێنا بە ئەستێرە هەڵلەرزیوەکانییەوە لە بۆشاییەکی دێریندا، پاشان زۆر ناخایەنێت خۆی لوول دەدات، بۆ ئەوەی بوار بۆ هەور برەخسێت دڵڕفێنی خۆی نیشان بدات"(ل218).

پێکهاتەکانی گێرانەوە لە رۆمانەکانی(بەرەکات)دا هەمان پێکهاتە پێش بینییەکانە لە شیعردا. چامەی بەرەکاتی شۆڕ بوونەوە و نوقوم بوونە لە خودێکی هەلاتوودا، یاخود رووپۆشییە بۆ چەندین جیهانی دی.. شۆڕبوونەوەیە لە زمان و پێشبینیدا.. کەینوونەی ئەم خودەش لە(جیهان/شوێن)دایە... لە(نامۆیی/ ئامادەبوون) دایە.. لە(تاراوگە/هۆگری شوێن)دایە.. لەم شۆڕ بوونەوەیەدا لە خەیاڵ لێ کراودا نووسەر لە پێش بینی خۆی رادەمێنێت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ بنیاتنان و بابەت/ئەزموون و... بابەت و رێگاکانی نووسین، بەمەرجێك ئەو مەودایەی پێشنیار

دەکرێت لە نێوان رۆماننووسی شیعری و ئەوەی دەبێ هەبێت... بۆ نموونە لە رۆمانی(پەڕ- ریش)دا دەرناکەوێت جگە لە(راوکردنەکان-اقتناصات) نەبێت. رەنگە هەندێکیش تێی پەڕێنن و باسەنی گوزارشتی(التوصيف التعبيري) بۆ ئەم رۆمانە بگەڕێننەوە، گوایە دەقێکی شیعری زۆر کراوەترە لەمەڕ ئەزموونی خودی کوردیدا.. هەروەها کێشەی بەڕەگەز بوون(التجنيس) لە نووسییندا، لەنێوان سەردی و شیعریدا ناگەڕێنێتەوە، بەمەرجێك هەردووکیان پێکەوە خۆیان هەڵدەقورتێنن... نووسینیش لێرەدا دەبێتە چەشنێك لە تەسەلی بونیادگەری.. هەروەها تۆژینەوەش لەمەڕ رۆماننووسی(سەلیم بەرەکات) دەبێتە ئاخاوتن دەربارەی شیعرییەتی خەیاڵ لێ کراوی رۆمان کە هەمیشە بەناو پانتایی دروست کردنێکی جوانکاردا شۆڕبۆتەوە و نوقم بووە. کەواتە گۆشە چاوێك یاخود گۆشە بینینێکی کراوە لە سنوورێکی دیاری کراودا لە گۆڕێدا هەیە، هەربەهۆی ئەویشەوە شوێن دیاری دەکرێت و لەو سنوورەشدا سەرد لە کایەدایەو رۆڵی خۆی دەبینێ، سەردو قسەی شیاوی ئەو کەسەی رووداوەکان دەگێڕێتەوە. بەلام ئەم گۆشە چاوە تەنیا رووبەری پێشبینی دیاری ناکات، بەڵکو مۆرکی قسەو وتە دیاری دەکات. قسەو وتەیەك بگوازرێتەوە.. باس بکات... لەلێکدانەوەو تەئویل دوور بکەوێتەوەو بۆ خوێنەری بەجێ بهێڵێت. دیارە ئەمەش جۆرێکە لە واز هێنان لە شوێنێك بۆ رۆشنبیر. یاخود واز هێنانە لە چەمکی ئەو تەواوی مەعریفەت و ناسنامەیەی پاڵەوانێتی بە حیکایەتخوان دەبەخشێت. بەم شێوەیە پێ دەچێ دەقی ئەدەبی، ئەو دەقە بێت کە لە لێکدانەوە و تەئویل دروستکرابێت. کە خۆی بابەتە، بەلام بەهاکەی لە پێوەندییەکی تایبەتدا کاری خۆی ئەنجام دەدا و ئەرکەکەی بەجێ دەهێنێت. ئەمەو یەك لا لە دوو جەمسەرەکەی چەسپاونییە دروست بوونی دەق لە لێکدانەوەو تەئویل واتای گۆڕانی یاخود ئاڵوگۆڕکردنی ناگەیەنێت، بەڵکو گۆڕانی لەبەرچاوە بۆ بەهاکەی، لە رووی ئەوەی کە بەهایەکی هونەرییانەن بۆی.

لەم گۆڕانەدا دەقەکان لە مێژووی خۆیاندا دەژین، واتە گوزارشت لە کۆمەڵایەتییانەو رۆشنبیرییانەی خۆیان دەکەن، هەروەها بە گۆڕانی چەمکە رۆشنبیرییەکان و بەهاکانی ئەویش دەگۆڕێت. ئەگەر ئەمیش بڕیاری شێوەی خۆی بهێنێتەئارا، ئەوا ناوەرۆکیش ئەو قاڵبە هونەرییەی خۆی وەردەگرێ، بۆیە پێوەندی نێوان شێوەو ناوەرۆك لەلایەکەوە و لەگەڵ وەرگردا لەلایەکی دیکەوە دۆخێکی شاعیرانە دەبەخشێت بەسرووتی دەقەکە، بەها روحی و واتای شفرەکانی لەو دەستەواژانەدایە کە خاوەن هێزێکی گوزارشتین و قووڵیەکی هەست پێکراوی هەیە، لە کاتێکدا خوێنەر دەگاتە ئەو بڕوایەی کە هێزێکی راکێشەر لە ئارادا هەیە بیخاتە ئەو دۆخە حەپەساویەی پاڵی پێوەبنێ، کە بەردەوام بێت لە بەدواداچوونی یەك لەدوای یەکی رستەکان و شیکردنەوەی دەستەواژەو پێکهاتەی واژەکان، خۆ ئەگەر هوشیاری خوێنەر لە ئاستی ئەوەدا بوو زمانەکە لەلای ئەو زمانێکی پاراو و زراڤ و هاوڕاز بوو، ئەوا سەرکەوتوویی و بالایی دەق بۆ هەرسێ لایەن(مەودای رۆشنبیری نووسەر و خوێنەر و شیعرییەتی زمان) دەگەڕێتەوە، جا بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی وەها لە گرتنە دەستی هەرسێ چمك، دەبێ ئەنجامێکی لەباری راستەوخۆی بدات بەدەستەوە و خوێنەریش لە قووڵایی دۆخی شوێنێکدا جێ دەهێڵێت لە کەشی سەرسوڕمانی خۆیدا مەست بووبێت.

ئەوەی زۆر ئاشکراو روونە(جەربەزەیی) یەکێکە لە دیاریترین سیماکانی ئەزموونی شیعری و رۆماننووسی(سەلیم بەرەکات)، چنینی شیعری درێژ کەلە نووسینەکانیدا وەك گوتارێکی کراوە بۆ تێڕوانین و پێشبینی لەلای ئەو بووە بە

ئەریت... نوقوم بوون و شۆڕبوونەوە لە دۆزینەوەی خودی خەوبینەردا و لە شوێنێکی تەنگژەییشدا یەکخراوە بۆ لەبری دانێك، پێ دەچێ زمان یەکێك بێت لەشێوە پێشنیار کراوەکانی ئەم چنینە هەمان ئەو چنینە رۆماننووسییەیە کە(بەرەکات) پێی دەنووسێت، هەروەها لە رۆمانی(پەڕ-ریش)دا هەمان جەربەزەیی دەبینین، جەربەزەیی ئەو شێوەیەی کە لەرووی ئەزموونگەریدا- لەوپەڕی سنووری خۆیدا- دەکرێتەوە، واتە: لێنزیك بوونەوەی خەیاڵ لێ کراو لە دەرەوەی خوددا(جیهان بینییەکانی گێڕانەوە لەسەردی کوردیدا.. سرووشتی دڵڕفێنی ناو چیاکان ئەو ئامارژە سۆفیگەرییانەی شوێن/ مت بوون دەیهێنێت)هەر ئەم لێ نزیك بوونەوەیەشە کە هەمیشە رێی بۆ خۆش دەکرێ بۆ ئەزموونگەری. لە کاتێکد تەقەللای دژایەتی(مت بوون-قەدەر- وەهمەکان) دەدات کە شۆڕبوونەوە و رووپۆشی نامۆ بەخودی کوردی لە سروشتدا پەسەندی دەکات.. ئەم(رەوتەش کەرەنگدانەوەی کەسایەتی خۆیەتی وەك(بێکەس) لە (فقهاء الظلام)دا و (أ-دهر) لە(ارواح هندسية)دا، بەرجەستە کردنی خۆی جارێکی دی لە (پەڕ-ریش)یشدا دەبینێتەوە، ئەویش لە نێوان کەسایەتی(مەم ئازاد) دایە کە کەسایەتییەکە لە دەرووبەری رۆمانێکی دیار نەکراودا دەجووڵێتەوە(بۆشایی بونیادگەری) دەبێتە خوازەیەکی سوریاڵ. ئەمەش بە تەبیعەتی حاڵ لەگەڵ رۆمانی ریالیزمیدا ناکۆك دەبێت رۆمانی(الامتلاء البنيوي) وەك رۆمانێکی ئامادە بوون و دڵنیایی(یقین) تیایدا کەسایەتییەکان دەبن بە خاوەنی ناسنامەو پسوولەی ناسینی کۆمەڵایەتی بەڵام کەسایەتییەکان لە چەشنی ئەوانەی باس کران وەك(مەم) دووچاری نا هاوسەنگی‌یەك دەبن، وەك لەو دەقەدا هەیە کە ناسنامەکەی ون کردووە. رۆمانی(پەڕ-ریش)یش رۆمانێکە دەربارەی ونبوونی ناسنامە دەدوێت) چاوپێکەوتنی (اليوم السابع) ژمارە(323)...

کەسایەتییەکی وەك(مەم ئازاد) ناچێتە ژێر باسکردنی دیاریکراودا بۆ کەسایەتی، واتە: بە بەردەوامی خاوەن پانتاییەکی کراوەیە بۆ دەسەڵاتدارێتی و زاڵ بوون. نامۆ بوونیش خۆی دژ بەکەسایەتییە. ناسنامەش وێنەیەکی نزیکە بۆ تێك ئاڵان لەگەڵ(واقیع/ کەینوونە)دا، بەڵام رقی لێیەتی چونکە واتای نامادەنەبوونی دەگەیەنێت کە هەروەها واتای شۆڕبوونەوە و نوقوم بوون لەجیهانە مت بووەکاندا دەگەیەنێت... (دەزگا... خۆ لەگەڵ خستن... شوێنی بەرتەنگ... پێوەندییە دەس پێشخەرەکان) ..... پێ دەچێ ئەو شێوەیەی لێرەدا بووە بەخەیاڵ بۆ کەسایەتی(مەم ئازاد) هەر بەشێواوی بمێنێتەوە... گرفتێکە هەمیشە لە گۆڕاندایە. بەڵام پێ دەچێ شتێکی لە ناو خۆدا هەڵگرتبێت، لەم حاڵەتەدا رەنگە بتوانین کەڵکەڵەکانمان هەست بە بوونی بکات، بەڵام هەمیشە خوتە خوتی نەسرەوتی و دڵەراوکێی دەکات.. ئەندێشەکانی(مەم ئازاد) خۆی لە خۆیدا ئەو خەسڵەتانە پێك دەهێنێت کە بیناسازی حیکایەتێن بۆ(دەق/رۆمان) و ... هەروەها ئەویش دەبێتە کۆمەڵێك موفارەقات و وێنەی دژ، نادیاریانە دەورو خولی دەدات. ئەویش زیاتر گوزارشت لە تێکەڵ بوونی رووداوو وێنەو بەیەکاچوون و دۆنا و دۆنی خودەکاندەکات، لەوساتانەدا یاخود تەنانەت لەو جیهانانەی کەلەو خەونە دەچێت کە هەمیشە رۆماننوس روو پۆش دەکات و زیاتر شۆڕی دەکاتەوە و بەناخدا نوقومی دەکات.گفتوگۆ لەسەر خەیاڵ و ئەندیشەکانی(بەرەکات)، لەو راستییە گرنگانەیە کە دەبێت ئامارژەی بۆ بکرێت، چونکە ئەو زۆر سوورە لەسەر زەمینە خۆشکردنی رەنگدانەوەی ئایدۆلۆژییەتی سیاسی و هزری خۆی لەو دیمەنانەدا، بەپێی تێڕوانینێکی تایبەت، کە دەتوانین پێی بڵێین تێڕوانینی بەرەکاتیانە، ئەویش بۆ هۆیەك دەگەڕێتەوە، رەنگە بەدیهێنانی لەلای زۆر کەس کارێکی سانا نەبێت، ئەویش بەدیهێنانی دەستکەوتی ئایدۆلۆژیەتێکی خاوەن بەرنامەی دارێژراوی جیاوازە، یان بەواتایەکی دی سوور بوون لەسەر دۆزینەوەی رەوتی تایبەت، دوور لە زاڵ بوونی دەسەڵاتێکی تر، تایبەتمەندی خۆی بپارێزێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت(کاریگەری) ئامادە بوونی خۆی لەخەسڵەتەکانی ئەو دەنگە تایبەت بەخۆیەدا بەرەوانی دیاری نەکات، ئەم حاڵەتەش لەکاتی سەلماندنی خوددا دەردەکەوێت، بەڵام شتێکی رەهانییە، بەڵکو رێژەییە و کەس حاشای لێ ناکات و کەسیش لێی بەری نییەو بەلای هەموانەوە رەوایە، بەڵام گرنگییەکە لەوەدایە(دەنگ) بوونی دەنگدانەوەی خۆی لە پلەیەکی بەرزدا بخاتەڕوو.

ناوەرۆکی سەردیش وەك یەکێك لە پێکهاتەکانی دەنگی تایبەتی بەرەکات لە جموجۆڵێکی زیندووی هۆشیارانەدا خۆی دەنوێنێ، بەپێی جودایی دیمەن و شوێن و رووکارەکان لەپانتاییەکی بەرفراواندا مەلە دەکات، هەندێ جار چەند رەگەزێکی درامیانە دەدات بەهەدلوولاتی دەق، تراژیدیا و میلۆدراما بە دارشتەیەکی هەمە جۆری تیادا کۆدەبێتەوە، بزووتن و جووڵەی لەبارە ئاساییەکەوە دەگۆڕێت بە جووڵەیەکی پێچاوپێچ، پێویستی وای لێ دەکات لە چەندین خاڵدا کردەی دووبارەکردنەوەی لەلا دروست بکات، بەڵام لە بەجێ هێنانی چەندین درکەو خوازەی رەوانبێژی وەهادا دەردەکەوێت کە چەند نادیارییەك بدەن بە دیمەنەکانی دەق و وەرگریش لە بەدواداچوونیاندا تووشی وێڵیەك ببێت، جا ئاخۆ خوێنەر دەتوانێت خۆی لەو تاریکیەدا بگوازێتەوە بۆ رووناکیەکی زۆر رۆشن، دوابەیەکی ونبووەکان بدۆزێتەوە، چەمکە دەلالی و سرووشییەکانی گێڕانەوەی دەق بەرزبکەنەوە بەرە و لوتکەی جوانکاری و رەهەندەکانی هونەر. (بەرەکات) لەو خەیاڵ کارانەیە کە هەردەم یادەوەری دەخەڵەتێنێت، بڕوانە دەقەکانی، لەوانە دەقێکی شیعرییە بە ناوی(مهاباد). یادەوەری(الذاكرة) لێرەدا تێك دەشکێت، دەبێتە رۆشناییەکی ملکەچ، رێکی ئامارکراوەکانی خۆی ناگێڕێتەوە کە زۆر لە وێڵستان(المتاهة) دەچێت... پرسیار دەکات و دەگەڕێت بە دوای چەندین جیهانی واکە زیاتر ئامادەبوونی خۆی بنوێنێ. یادەوەریش خەون و شوێنی هەمیشەیی(گەڕانەوە بۆ کوردستان) ئامادەکات، بەڵام، هەروەها ئەویش ئێستا هەڕەشەی رووخانی لێ دەکات، کە بەڵگەو هۆکاری خۆی لە(شێوە، بوون، نامۆیی، قبرس، پیاوی مەزن)دات هەیە. ئەمەش پاڵ بە(مەم ئازاد)ەوە دەنێ رووبکاتە هەمان وەهم و خەیاڵ، کە یادەوەرییەکی نەبوو لە شوێنێکی بوونیادگەریدا بەرز دەکاتەوە بۆ ئەو خەیاڵ، کە یادەوەرییەکی نەبوو لە شوێنێکی بوونیادگەریدا بەرز دەکاتەوە بۆ ئەو خەیاڵ لێ کراوەی کەوای لێ بکات بمرێت، لە کاتێکدا ئەو لە گەشتی گەڕانەوەدایە بۆ وەهم و خەیاڵی یادەوەری لە رووباری(جفجع)دا، یادەوەری لێرەدا ئەو وەهمەیە کە بە بەردەوامی پێکهاتەی زیرەکی و شارەزایی دەگێڕێتەوە . ئەم یادەوەرییە خەیاڵێکە بە روون و پاکی دەمێنێتەوە(مەم ئازاد) لە ئامادەکردنی خۆشەویستەکەیدا- کە خاوەن پێڵاوێکی سەربازییە- نوقم دەکات، کە کچی(حەمدی ئازاد)ە... ئامادەکردنی (شوێن، باڵندە)یە، چونکە ئەویش لە بری خزانی ئەو شوێنەیە کە هەمیشە لە ئاستیدا بەسەرسامی دەمێنێتەوە.(مەم) دەڵێت: (باڵندەکان تێم ناگەن بۆیە ئێستا بێ حەوانەوە بووم)(ل10).

هەرچییەك(سەلیم بەرەکات) تەقەللای بۆ بدات لە گومڕایی و سەرسامی یادەوەری و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە(نادڵنیایی- اللايقين) هیچ سوودێکی(شوێن، دامرکاندنی)ی نییە... ئامادەبوونی شۆڕ بوونەوەو نوقم بوون کە هەمیشە تێ

رووانین و رامان دەگوازێتەوە، ئامادەکردنی دیاری کردنە لە ڕێی خەیاڵ لێ کردنەوە، ئەویش ئەو کارەیە کە هەردەم بەرپێوەی دەبات(باڵەکان ئەو بەڵگە سەلمێنراوەن کەزەوی خۆی پێشکەش بەراستییەك دەکات زیاتر مایەی حەپەسانە، وەك لەوەی رازی بێت بە سەلماندنی یەکێکی نادیار)(ل75) بێجگە لە گەرانەوەی ئەو پێشبینییەی کە یادەوەری بە کۆمەڵی کوردانی تیاداتێك دەناڵێت.. ئەویش بەو ئەزموونە پتەوەیە کە نووسەری پاڵەوان تیایدا دەژی و هەردەم هەوڵ دەدات سەرپێچی ئەومتبوونە بکات کە رووەو ساغ کردنەوەی راستی(تەماهی) پاڵی پێوە دەنێت لەگەڵ چەندین وێنەی

رۆمانسی لە کەلەپووری کوردیدا... تیایدا(مەم ئازاد)بە پاڵەوانێکی ئەڤینی خەیاڵی لە چیرۆکێکی کەلەپووری کوردیدا راستی خۆی ساغ دەکاتەوە... ئەویش چیرۆکی(مەم و زین)ی(ئەحمەدی خانی)یە... ئەم رۆمانە لە دەرخستنی نموونە خەیاڵییەکانیدا دەچێتە ژێر رکێفی گەمەی دەمامکەکان... کەشوهەوایەکی نابڕووبەر لەگەڵ کەلەپووری کوردیدا دەخوازێت، لە کاتێکدا ساغ کردنەوەی راستییەکانی(تەماهیەکان) بەردەوامە... هەروەها یەکتربڕ لەگەڵ واقیعی دامرکاودا... دەمامکەکان خۆیان وێنەی ونبوونی هەمیشەیین بۆ(بوون، شوێن)... کە نووسەر رووی تێ دەکات بۆ ئەوەی پێشنیاری چەندین شێوەی گۆڕاو بکات. ئەویش بۆ بوونایەتیەکی دی... کە بوونی خۆی لە ڕێی دوالیزمێکی دژدا دادەمەزرێنێت و هەمیشە بەردەوامە لە خرۆشاندنی قووڵی پەژارەی کەسایەتی و گرفتەکانی لە شوێندا... کە واقیعی مێژوویی و رۆژانەیی هەڵی ناگرێت، وەك لە کەسایەتی(مەم ئازاد)و کەسایەتی (بێکەس) لە رۆمانی(فقهاء الظلام) دا دەردەکەوێت.

(سەلیم بەرەکات) لە نووسینی رۆمانەکانیدا هەوڵی ئەوەی داوە کە بوونەوەری خۆساغکار(الكائن المتماهي) لە ڕێی خەیاڵ لێ کراوەوە دابڕژێتەوە و کە هۆگرانە لە چامەکانیدا ماوەتەوە، لەوێدا ئەزمانە ئاڵۆزو بەرزبووە دەنووسرێتەوە کە لەسەر شێوەی(بارناسینەکان)ە... حیکایەتی پاڵەوانەکانی یاخود ئەو پێکهاتانەی کەلەحیکایەت دەچێت(شێوانی سەرد) بە بەردەوامی دەگۆڕێتە سەر چەندین دەمامکی حیکایەتیانە، ئەوەش هەوڵێکی بەردەوامە بۆ دۆزینەوەیەکی تر.

وەك لە رۆمانی(پەڕ–ریش)دایەو کەتیایدا ئامادەنەبوونی مێژووی کۆمەڵایەتی دەبینێتەوە. دەری دەخات لە پێناو ئامادەکردنی وەهم لە کەسایەتی(مەم) و شۆڕبوونەوە و نوقوم بوونەکانی لە چەندین وێنەی خەیاڵی هەمیشەیی زۆردا.

رۆماننووس تەقەللای ئەوەی دەدات بگەڕێت بە دوای وێنەی گونجاوی ونبوو و ریتمی ئامادەنەبوو کە هەمیشە لەبەردەوامی و دۆزینەوەی راستی(تەماهی) دان لەگەڵ بوونی تۆژینەر بەدوای وێنە یاخود بوونێك(كينونة) لە چیندا یاخود شوێنی گرفتیدا خۆی دەنوێنێت.

پرۆژەی شیعری(سەلیم بەرەکات) کارێکی گەلێ گرنگە، ئەم شاعیرەمان قوتابخانەیەکی تایبەت بەخۆی پێك دەهێنێت، ئەو هەر بەوەوە نەوەستاوە هەر کار بکاتە سەر ئەو وەچەیەی پاش خۆی هات... بەڵکو لەوە زیاترە، هەروەها لەو ناوانەی لەرووی کاتەوە لەگەڵ ئەودا لە رەوتی ژیاندان، چ لە هاوتەمەنەکانی بێت یاخود لەوانەی پێش خۆی، لە هەر کوێیەك بێت ئەوا واژەکانی هێمای بۆ دەکەن(لەدەقدا بێت و.... بۆ هەر باڵایەکی بەرزبێت).... بەناوی ئەوەوە بانگی دەکەن.... هەروەك چۆن باڵندەکان بەدوای سێبەری خاوەنەکەیەوە کەوتوون. هەرچەندە لێکۆڵینەوەی خێرایی کەم ئاوڕیان لە ئەزموونی ئەم شاعیرە داوەتەوە، بەڵام نەیانتوانیوە هاوتایی شەتەکی ئەزموونەکەی بن و سەراپا وەك خۆی پێشکەشی بکەن و مافی تەواوی خۆی بدەنێ. لە کاتێکدا کەڵکەڵەی زۆر لەوانە لە رووی داهێنانەوە لەودیو ئامادەنەبوونی ئاشکراو زۆر زەقیەتی.

جێی داخە کەسانی دی(پێش ئێمە) سەلیم بەرەکات بناسن و (بەرهەمێك) بۆ ئێمە بنێرێت بێ ئەوەی بەردەوام بین لە بەدواداچوونی هەنگاوە داهێنراوە سەرەتاییەکانی، وەك هەمیشە روویداوە و روودەدات لەتەك هەر ئەزموونێکدا. رەخنەی ئەدەبی–لەلای ئێمە– قەرزارباری ئەم ناوە نائاساییەن جا ئەگەر لەگەڵ ئەودا هاوبیرو هاوڕابین یاخود جیاواز، ئەوا شتێکی بەڵگە نەویستە کە ناتوانرێت هیچ مەترسییەك لە ئەزموونەکەی بکرێت مادام زۆر بەهێزو تواناوە روخساری خۆی چەسپاندووە، ئەو وەك واقیعێك سەیر دەکرێت– لە کاتێکدا هەموو دەنگەکان لەیەك دەچن– بەڵکو زۆر کەس هەن– تەنانەت لە رێبازی نووسینی و.... و....و .... شێواز تۆمار کردنی نامەکانیشیدا لاسایی ئەو دەکەنەوە، بەڵام نەبوونی بەهرە لەلای زۆربەیان... ناراستگۆیی... کە هەندێکیان پێوەی دەناڵێنن وای کردووە دەقەکانیان بەرەو قووڵایی سەرەخوار تێك بشکێن و رۆبچن. لێرەدا بۆ نموونە یەکێك دوای سەلیم هاتووە و دەستی بۆ هەندێ لە هێما کاریگەرەکانی بردووە:

(کەو... چیا... بنار... خاك وخۆڵ.... تاد) بێ ئەوەی هیچی بخاتە سەر، پشتی پێ بەستووە لە ناو شیعرییەتێکی دروست کراوی پێشتردا.

–بۆ پینە کردنی دەقە کرزو لاوازەکانی– بەڵام هەرگیز... مادام تەختی نەخۆشی و خەیاڵ و وەهم ئەویش لە ئەماندایە.

ئەمەش ئەگەر بەڵگە لە شتێك بکات، ئەوا ئێستاو ئەوسا بەڵگە لە باڵابەرزی ئەم شاعیرە گرنگە دەکات...

## تێبینی

بۆ نووسینی ئەم وتارە سوود لە وەرگرتنی چەندین برگەی ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بینراوە، بەڵام بەدەسکارییەوە، لەبەرئەوەی زۆر لە وشە و زاراوە رەخنەییەکان– بەتایبەتی بونیادگەرییەکان– لە کوردیدا بەرامبەریان نییە، بۆیە ناچار بەراڤە کردن وەرمگێڕاون....

## سەرچاوەکان

الراوي: الموقع والشكل–يمنى العيد.

وتارێکی(ابراهيم اليوسف–سوريا) بەناونیشانی(سبع علامات في القصيدة السورية الحديثة– سليم بركات و ضوح القضية غموض النص) گوڵانی عەرەبی ژمارە(29).

وتارێکی(عقل العويط) بەناونیشانی (البازيار ل(سليم بركات) الخروج الى شمس المعنى).

وتارێکی(علي الفواز) بەناونیشانی(سليم بركات) المتخيل السردي الذي يبدو شعرا).

# مهابادی سەلیم بەرەکات، مهابادی ئێمە..

عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی

ئێوارەیەکی ساڵی 1983 پێکەوە لەگەڵ ڕەخنەگری عێراقی(حاتم الصكر)دا بەرەو ئەزمر دەڕۆیشتین، لەبیرمە قسەو گفتوگۆکانمان بەدەوری دوو کەسدا دەسوڕانەوە، یەکێکیان(كمال ابو ديب) و هەوڵە بونیادگەرییەکانی بوو، دووەمیش سەلیم بەرەکات بوو. حاتم ئاماژەی بۆ شیعری بەرەکات دەکرد. دەیویست کاریگەری سەلیم بەرەکات بەسەر دەنگەکانی شیعری حەفتاکانی عێراقدا دەستنیشان بکات. دەکەوتە بەراوردکاری لەنێوان شیعری سەلیم و چەند بڕگەیەکی(خزعل الماجدي)دا. پاشان هاتینە سەر هەڵوێستی سەلیم و دەربەدەری و کوردایەتی بەرەکات، بۆیە ڕایکێشاین بۆ ئەو ئەدەبەی کوردان بەزمانی عەرەبی دەینوسن: سەلیم، محي‌الدين زەنگەنە، یوسف حەیدەری، ئایوسف حەیدرەی ئەمریش زۆرجار دەیگێڕایەوە کەچۆن لە میهرەجانی(مربد)دا ئەدیبێکی زۆر دەوری سەلیم بەرەکاتیان دابوو، هەر یەکەیان هەوڵی ئەدا دوا نوسخەی یەکێك لەکتێبەکانی سەلیمی بەرکەوێ، هەموو دەستیان بۆ درێژکردبوو ئەویش سەری سوڕمابوو ئەینەزانی ئەو تاکە کتێبەی خۆی بەکامیان بدات، یوسف حەیدەری دەیوت: منیش یەکێك بووم لەو ئەدیبانە، بەلاَم لە پاسا زۆر ئەبوون بۆیە چارە نەما، لەپڕ بەکوردی هاوارم کرد:

ئەزبەنی من کرمانجم ئەو کتێبە بدە بەمن ئەویش بەدەنگم گەشایەوەو زیاتر لێم نزیك بووەوەو کتێبەکەی پێشکەش کردم.)

لە هەشتاکانا کتێبێکی خۆمم بۆ نارد ئەو کاتە لەدەرەوە سکرتێری گۆڤاری(الكرمل)بوو. ڕۆژێك بەبەریدا شیعرێکی درێژی خۆی بە ناوی(مهاباد)ەوە بۆ ناردم. سەلیم بەرەکات شیعری زۆر بوو بەلاَم ئێستا ئەو پرسیارە دووبارە دەکەمەوە بۆ لەناو ئەو هەموو شیعرە زۆرەدا ساڵی 1988 ئەو شیعرەی بۆ ناردم کەناوو ناونیشانی(مهاباد)بوو. نووسینی ئەو شیعرە لە کۆتایی هەشتاکاندا پڕە لە مەغزاو دەلالەتی کوردی و کوردایەتی سەلیم

ئەم شاعیرو ڕۆماننوسە نوێخوازە لەناو ئێمەدا درەنگ ناسرا، کوردێتی خۆی و نووسینەکانیشی بەکورد نامۆ بوو، کوردی ئەم کوردستانەی خۆمان لە کۆتایی هەشتاکانا سەلیمیان ناسی، ئەو کاتە چەند ساڵێك تێپەڕبوو بوو بەسەرمشت و مرو دەربڕینی بۆچوونی ڕەخنەیی عەرەبی جیاواز دەربارەی زمانی فرە شیعریی سەلیم بەرەکات و کاریگەری بەسەر دەنگەکانی ئەو سەردەمەوە. ڕەخنەگرو خوێنەر لەبەردەم ئەدەبی سەلیم بەرەکاتدا سەریان سوڕئەمێنێ چونکە ڕوبەڕوی ئەدەبێك دەبنەوە بە زمانی عەرەبی نوسراوە بەلاَم پڕە لە تایبەتمەندیی زاتی کوردی و وەدەوروبەرێکی جیاوازە لەسیمای ئەو زمانەی کەئەدەبەکەی پێنوسراوە. هەر ئەمەیشە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێك لەڕەخنەگرانی عەرەبی توشی گرفت ببن لە کاتی خوێندنەوەی دەقەکانی سەلیم. ئەوان دەقێك دەخوێننەوە بەزمانەکەی خۆیان نوسراوە، بەلاَم زۆرجار هەواڵەی سەرچاوەیەکی دەستەجەمعی شاعیریان دەکات، سەرچاوەی مێژوویی، کۆمەلاَیەتی، دەروونی میللەتێکی وەك کورد کەسەلیم دەیانگوێزێتەوە بۆ ناو قەفەسی شێوە

من دەڵێم زەحمەتە بەئاسانی سەلیم بەرەکات بخەینە خانەی وەك: ئەمە ئەدەبێکە کوردێك بەعەرەبی نوسیویەو بەس، دیارە زۆرن ئەو کوردانەی کە بەزمانی عەرەبی دەنوسن بەلاَم هەندێکیشیان نەك ئەدەبەکانیان دورن لەسیمای کورد بەڵکو قایل نابن بەوەیشی کوردیەتی خۆیان ئاشکرا بکەن.

سەلیم لەم دوو حاڵەتە دوورە، کوردێکی دەربەدەرە بەشانازییەوە وەك ڕۆشنبیرێکی کورد بەشێك لەتەمەنی لە پێناوی کێشەیەکی مرۆڤایەتی وەك کێشەی فەلەستینا بەکردەوە سەرف کردووە ئەگەرچی لەژێر سێبەری ئەو کێشە مرۆڤایەتیەدا بووە. بەلاَم هەر لەدەقەکانیا کوردانە ڕاماوە بیرەوەری شکستی کورد هەوێنی دەقەکانی بووە بۆیە دەکرێ بڵێین بە عەرەبی نوسینی سەلیمی کورد دورە لەخانەو خانە بازی، چونکە وەك حاڵەتێکی تایبەتی وایە. دیاردەیەکی ئەدەبی جیاوازە. زۆرن ئەوانەی پەیوەندییە کۆمەلاَیەتی و ڕووداوە مێژووییەکانمان بوون بەبنکەی هونەری دەقەکانیان، بەلاَم دەڵێم: شیعرێکم بدەرێ بەکوردی دەربارەی مهاباد بێت و وەك مهابادی سەلیم بەرەکات بووبێت بەدەق. من چی لەسەدەها شیعرو چیرۆك بکەم کەدەربارەی ڕوداوێکی وەك مهابادن و بەکوردیش نوسراون بەلاَم مەرجەکانی دەقایەتیان تیانییە.

هەربوون بەبابەت بەلاَم خاڵین لەرونیا. جا ئیتر بۆ ناکرێت دەقی مهابادی سەلیم بەرەکات بەسەر هەمویانا سەرخەین چونکە خوێندنەوەیەکی بالاَوو درەوشاوەی هونەریانەی ڕوداوێکی وەك مهابادە. من بەیەکجاری لەگەڵ ئەوەدا نیم ئەدەب بەگشتی لەسەدا سەد پەیوەندی لەگەڵ دەرەوەدا ببچڕێت. هیچ کاتێکیش دەق لەبیرەوەری(ذاكرة) سپییەوە دەست پێناکات، چونکە دەق نییە بەتەواوەتی نەك لەدەرەوە دابڕێت بەڵکو ناتوانێت لەدەقی دەروبەرو پێش خۆیشی دابڕێت، بەلاَم دەبێت چۆنێتی هاتنە ناوەوەی ئەو دەرەوەیەو چۆنێتی کارکردنی هەل و مەرجی هونەری خۆی هەبێت.

گرفتی شیعری ئێمە لەوەدایەکەلە ڕوداوە گشتی و مێژووییەکان نزیك دەبێتەوە لەجیاتی ئەوەی ئەو روداوانە ڕابکێشێت و بیانهێنێتە ئاستی خۆی و ڕەنگ و بۆی شیعریەت بەسەریانا داڕێژێ، بەپێچەوانەوە هەرەکەت دەکات و واز لەپلە بەرزەکانی خۆی دێنێت و دادەبەزێتە ئاستی ڕوداوەکان. لەو کاتەیشدا درەوشانەوە شیعرییەکە لەناو دەچێت لەشیعری نوێدا رونیا بەسەر بابەتدا زاڵ دەبێت،واتا وەك بابەت مامەڵە لەگەڵ نوێدا ناکەین، بۆیە هەموو شتێك سەبارەت بەشیعر نوێیە، بچووك بێت گەورە بێت! مێژوویی بێت یاخودی بێت. ئەگەر

روئیا بەکار بێت ئەوەشت نییە بەنوێی نەمێنێتەوە.

کورتبینی شاعیری کورد لەوەدایە لەڕوداوێکی وەک مهابادا ئاستە گشتییەکان وەردەگرێت و بەزمانێکی گشتی قسان دەکات، گۆشە نیگا دیاری ناکات بەتایبەتی زۆر لە شاعیرانی سەرەتاکانی نوێگەریمان یا بڵێین یەکەم نوێگەریمان ڕوداوی مێژوویی یاکۆمەلایەتی‌وەک مێژوو کاری کۆمەلایەتی بۆ ناو شیعر کۆچیان کردووە بەبێ هیچ گۆڕانکاری و وەچەرخانێکی هونەری، بۆیە بەدەگمەن مهابادێکی‌هونەری، یا هەڵەبجەیەکی هونەری لە شیعری کوردیا دەبینی. ئەگەر سەد شیعر سەرچاوەی دەرەکی لەمهاباد وەرگرتبێت دەڵێی یەک شیعر دەخوێنیتەوە یەک زمان و وێنەو واژەت بەرچاو دەکەوێت هۆیەکەیش دەگەڕێتەوە بۆ بزر بوونی رونیاو گۆشە نیگاو خۆبەستنەوەی شاعیر بەلایەنە گشتییەکانەوە.

شیعری(مهاباد)ی سەلیم بەرەکات جیایە لەو شیعرە زۆرەی کەبۆ مهابادە وەک ڕوداو بەلاّم بۆ مهاباد نییە وەک شیعرو هونەر. مهابادی سەلیم بەرەکاتە واتا مهابادێکە پێکهێنراوە، دورە لەمهاباد وەک ڕوداو و سەرچاوە. مهابادی ئێمەیە وەک زمانی مێژوو بەلاّم مهابادی سەلیم بەرەکات خۆیەتی وەک گوتار و پێکهاتەی شیعری.

کاتێ خوێندنەوەی مهابادی سەلیم دەتوانێت ئاماژە بۆ چەند گرفتێکی شیعری کوردی بکەیت کەسەرچاوە لەڕوداو وەردەگرن، ئەویش لەڕێگای کردنی مهابادی سەلیم بەنموونەیەکی پرشنگدارو پڕبوو لەمەرجەکانی دەقێتی، وەک گرفتی: پەیوەندی نێوان شیعری و مێژوویی، گرفتی ئاوابوونی ڕێک و پێکی زمانی شیعری، گرفتی ناونیشان و پەیوەندی لەگەڵ ئەندامەکانی تری دەقدا، گرفتی ئەندازەی شێواو. ناونیشانی شیعرەکەی بەرەکات(مهاباد)ە، واتە ناونیشانەکە بریتییە لە تەنها وشەیەک دەلالەت لە شارێک دەکات، دەلالەت لە ڕووداوێک و بەشێک لە مێژووی هاوچەرخمان دەکات واتا ناونیشانەکە لەیەک کاتدا دوو لایەن لەخۆ دەگرێت و دوانەی شوێن و کات پێکدەهێنێت، شوێن وەک شارێک و زەمەنیش وەک ڕوداوو کارەساتێکی باڵاو هەڵچوو خەفەکراو. ئەندامەکانی تری دەقەکە یا جەستەی خوارەوەی دەقەکە ئەوە دەرئەخەن کەجەختکراوەتە سەر زەمەنی مهاباد نەک مهاباد وەک شوێن.

ناونیشانەکە ڕونە بەلاّم ئالۆزی پێکهاتەی دوانەیی شوێن و زەمەن لەو ڕونییە دوری دەخەنەوە. ئالۆزی و بەیەکاچونی پەیوەندییە شاراوەکانی ناو دەقەکە ساکاری بەزاهیری ناونیشانەکە ڕەتدەکەنەوە ناونیشانەکە بەئاشکرا هەواڵەی سەرچاوەیەکی مێژوویی یا ڕووداوێکی شۆڕشگێڕانەی کپکراوەمان دەکات بەلاّم دەقەکە لەدەلالەتە ئاشکراو سواوەکانی ڕوداوەکە دوور ئەکەوێتەوە لەسەر ئاستی وێنەو گۆشە نیگا وەرچەرخانی تیا ڕوئەدات خۆی دەداتە دەست تەوژمی خەیاڵ تا سەرچاوەکە لە ناو دەقەکەدا کاڵبێتەوەو لە ناو پەیوەندییە هونەرییەکاندا ون بێت. هەر بۆیە لە کۆتایی دەقەکەدا یەک دوو جار ناوی مهاباد دێت ئەویش نەک وەک شوێن بەڵکو وەک ڕوداوێک ڕەنگو بۆچوونی نوێ و جیاواز وەردەگرێت. ئەفەسی ئەم شاعیرە درێژە بەلاّم زۆر لە خۆکردنی نییە، پێگەیشتن و پەرەسەندنی سروشتی لەلای ڕێگا بەوە نادەن لەهەڵچونی هونەریدا خلتەو بەرد و زیخ و چەو لەگەڵ خۆیا هەڵگرن. ئاوابوونی وشەیەک کون دەکاتە جەستەی شیعرەکە، پێکهاتنی ئاسایی دەشوێنێ.

یەکێک لەشێوازە دیارەکانی ئەدەبی‌سەلیم بەرەکات تێکەڵاوبونی گێڕانەوە و شیعرە لەڕۆمان و شیعرەکانیا. لەڕۆمانەکانیا شیعریەت تێکەڵاوی گێڕانەوە دەبێت، لە شیعرەکانیشیا گێڕانەوە دەچێتە ناو شیعرەوە و ئەرکی هێنانەدی شیعریەتی بێ دەسپێرێت، واتە گرفتی سنوری نێوان ژانرە ئەدەبییەکان لەلای نامێنێت، خەیاڵە گێڕراوەکانی هەر وەک شیعر دێتە پێش چاو هەر ئەو دیدە شیعریانەیشێتی کەدەبنە پێکهێنەری دیدی گێڕانەوە لەلای شیعریەتی گێڕانەوە لەدەقی(مهاباد)دا چڕی و دیدو بۆچوونی کراوە بەئەنجام دەگەیەنێت. ڕووبەری درێژی شیعرەکە تێرامانێکی درێژوو کراوەی بەسەرا ڕژاوە لەڕێگای هونەری گێڕانەوەو ڕستەی کراوەوە، ئەمە بێ ئەوەی بەرەڵاییەک دروست بکەن، بەڵکو دەچنە ژێر ڕکێفی بونیادێکی ستاتیکییەوە. غەرائبییەت فەراهەم دێنن لە ناخیانا واقیع وندەکەن بێئەوەی بەیەکجاری دەزوی پەیوەندییەکانی لەگەڵدا بپچڕێنن.

شێوەی کارکردنی سەلیم لەم دەقەدا لەوەوە دەست پێدەکات کەدکتاتۆرێتی بەخەیاڵ بەخشیوە واتا: خەیاڵ ڕووبەری سەرچاوە دەرەکییەکە(مهاباد وەک ڕوداو) هەڵئەوەشێنێت، ونی دەکات تاسەر لەنوێ وەک هونەری شیعر دروستی کاتەوە، بە مانایەکی ڕوونتر ڕووبەری واقیعی تێکدەدات، بونیادەکە (کەلە شێوەی سەرچاوەکەدایە) دەروخێنێت تا سەر لەنوێ بەیاسای شیعر بینا بەرز بکاتەوە

بۆیە مهاباد وەک شوێن و زەمەنی زەق پەرت دەبێتەوە،مەودا ئاساییەکان ئاوا دەبن. ئەمەش بەپێچەوانەی سەدەها شیعری کوردییەوە کەبۆ مهاباد نوسراون بەلاّم لاسایی کردنەوەی مهابادن وەک سەرچاوە... چوار هەنگاو لە مهابادەوە وەک سەرچاوە، بەرەو مهاباد وەک شیعریەک، دورناکەونەوە. هەر بۆیە پڕ دەبن لە ژماردنی ناوی شەهیدو شاخ و ڕووبار و دارو بەردی مهاباد.

هەر لێرەوە بەلاتەوە سەیر نەبێت وێنەی جموجوڵی یاریکەرو تۆپ و یاریگەو چەندەها شتی تری غەریب بێنێتەوە ناو چوارچێوەی شیعرەکەیەوە، وێنەی وایان لێ پێکبهێنێت:(اما اللاعبون هؤلاء الذین امانة الفجر بیننا، حتی نعثر لهم علی مساکن تلیق بالعظام. واللاعبون یمتحنون الفجر الان بعصیهم الطویلة و کراتهم، بقفزاتهم، وحدیدهم الخفیف مثل شفق محمول علی حمار).

دەسەڵاتی خەیاڵە مهاباد وەک ڕوداو ئاوادەکات(یغیب) تا ئەم وێنە غەریبە جوانانە ئامادەگییان هەبێت. سێبەرێکی ئەفسانەیی بەسەریانا زاڵدەکات، مەودایەکی جیهانیشیان پێدەبەخشێت واتا لە پێناوی بەرزکردنەوەی وێنەکان و ڕوداوە نەتەوەییەکان بۆ ئاستێکی جیهانی، لەڕێگای شیعرەوە هەوڵدراوە وێنەی شمولی و ئینسانی دروستبکرێت لە هەمان کاتدا جۆرە ڕەمزێک لە ئەدەبی سەلیم بەرەکاتدا هەیە بەکورد ئاشناترە. پاراو لەدەلالەتا بەلاّم ڕەنگە هێشتا عەرەبێک یا فەرەنسییەک ئەوەندە نەزانێت کەچ هەستێکی مێژوویی کوردی لەناخی خۆیا ئاوا کردووە. کوردێک چاکتر دەتوانێت چین لەسەر چینی وێنەی وەک ئەم وێنانەی مهاباد هەڵداتەوە تا دەگاتە سەر سەرچاوە مێژووییە پێکهێنەرەکانی؟!

(وانا هنا، موزع بین العدائین، في الفجر الذي لن یربحه احد، في الفجر السیاف الذي یجر صباحا مثقلا بنمیمة الریح، وانا هنا، تتقدمني

شاحنات عجولة تنزلق عن مقاودها ايدي السائقين، ريثما يتأمن للموتى مصادفة موت اخر يحتلق الحياة بأكاذيبه).

دەشێ بڵێین خوێنەری شیعری مهاباد چاکترە ئاگای لە ڕووداوەکانی مهاباد بێت کەسەرچاوەی شیعرەکەیان پێکهێناوە، بەڵام لەهەمان کاتدا پێویستی پێی نییە چونکە ڕووداوی شیعری دەخوێنێتەوە قەناعەتی تەواو بەپەیوەندی و شێوەی پێکهاتنی شیعرییان دەکات.

لەڕستەیەکی شیعریی وەك(ا ابوح لكم كم خدعني الجيران لادخل هذا السباق؟) خوێنەری هەموو میللەتێك دەزانێت دەلالاتی پاراوی پەیوەندی نێوان ئەم وشانە چییە؟ بەڵام ڕەنگە هەموویشیان نەزانن سەلیم بەرەکات لەدوای مانای ئەم ڕستەیەوە هەواڵەی چ سەرچاوەیەکی مێژوویيان دەکات کەلەدەرەوەی دەقەکەدا قوتبۆتەوە.

ئەم شیعرە درێژە، درێژی خۆی لە چەندایەتی سروشتی خۆیەوە وەدەست هێناوە نەك لەڕێگای ئەش و نماکردنی دراميیەوە یا فرە دەنگییەوە کەدەبنە وەسیلەیەك بۆ درێژبوونەوە، چونکە هەست بەبوونی فرە دەنگی و بەکارهێنانی تەکنیکی درامی لە مهابادا ناکەین. تەنها یەك کەس لە ڕێگای بەکارهێنانی(ڕاناوی قسەکەرەوە) قسە دەکات بۆ تاکێك، هەندێ جاریش بۆ ڕاناوی نادیاری کۆ، ئەو ڕاناوانە گوتاريان ئاراستە دەکرێت جموجۆڵیان لەدەقەکەدا نییە وەك گوێگروان. ئەمەش وادەکات فرە دەنگی ئەرەخسێنێت بەڵکو بەدرێژایی ئەو دەقە درێژە راناوێکی قسەکەری ئەفەس درێژ ڕامانی خۆی بەسەر سپێتی کاغەزدا بڕژێ، بێ‌ئەوەی بۆشایی سپی لەڕووبەرەکەدا دەرکەوێ واتا بەردەوامییەك لە گوتارو قسەکاندا هەیە ڕێگا نادات هیچ فاسیڵەیەك دروست ببێت. ڕاناوەکان بێ قسەن تەنها وەکی (بینەر) سەیری یاریگەکە دەکەن هەر ئەمی یاریکەرە تووشی شکست دەبێت، لە یارییەکاندا شکستەکانی دوبارە دەبنەوە.

بۆیە شیعرەکە وەك مەنەلوجی لێدێت دیالوگ ڕۆڵی نابێت.

لەمهابادا ڕاناوی قسەکەر بەسەر مێژووی شکست و ئاوابووندا دەکرێتەوە ئەو ڕستانەی کەدەریان دەبڕێت دەبنەوە بە جۆرێك لەنیشاندانی ئاوابوونی دەستە جەمعی.

(والريح؟! مالها؟! من(مهاباد) الى (مهاباد)
ايضا كلها من
مهاباد الى مهاباد
كل عويل من(مهاباد) الى (مهاباد))

ڕستەو وێنەو دەربڕین و گوتاری قسەکەری دەقەکە دەلالەت لەشکست و کارەسات و کەوتن و مەینەتیە وەك یاریکەرێك قەدەری دوبارە بوونەوەی کەوتنە مهابادی سەلیم لێرەدا وەك پێشانگا یا ئەنتیکە خانەی شکستە بەردەوامەکانی مێژوومانی لێدێت. واتا مهابادێك کەلەو پەری بەرزاییا بوو هاتنە خوارەوەی خەمی ڕەشی بۆ بەرهەمهێناین. لەم شیعرەدا دەنگی خەمی هەموو شکستە نوێ و کۆنەکانی تری لێوە دێت(كل عويل من مهاباد الى مهاباد).

مهاباد وەك مەتحەفی هۆنراوەیەك. ڕۆژ، شەو، بەیانی چ کاتێك سەردانی کەی هەموو شێوەیەك یا جۆرێك لەکەوتن و ناڵەکانی مێژووی شکستەکانی تیادەبینی. ئەگەر ڕێگا بەخۆمان بدەین و زاراوەیەکی وەك(پەڵەی‌ڕەنخەوانی) یا زاراوەی وەك(بيت القصيد)ی ڕەخنەی کۆن بەسود وەرگرتن لە خوێندنەوەی دەقێکی نوێی وەك ئەم دەقە بەکاربهێنین ئەوە دەکرێت ڕستەی(كل عويل من مهاباد الى مهاباد) یا چەند ڕستەیەکی پاش و پێشی ئەم ڕستە بکەین بەیەکەی بچووك کەڕەنگی بەسەر کون و کەلەبەری دەقەکەدا ڕشتووە. گشت(كل) دەلالەتێکی ئاشکرای هەیە جیاوازی و هیچ جۆرە جیاکردنەوەیەك ناکات(كلها من مهاباد الى مهاباد) نەوتراوە (العويل من مهاباد الى مهاباد) ئەمە وای کردووە گریانەکان لەیەك بچن، سەرەتا مهاباد بێت و کۆتایش مهاباد، وەك ئەوەی وا هاتبێت ڕێگاکان لە مهابادەوە دەست پێبکەن و بۆ مهابادیش بچنەوە، بەڵام نەك وەك دەرچوون و چوونەوەی کەسێکی ئاسایی بۆ مهاباد (وەك شار) بەڵکو بۆ مهاباد وەك ڕووداوێکی گەورەی مێژوویی نوێ. دەرچونەکانمان لە مهابادەوە لەشیعرەکەدا خۆیان لە (الريح؟) ڕەشەبادا دەبیننەوە گەڕانەوەکانیشمان خۆيان لە(العويل)ی شیعرەکەدا دەبیننەوە(والريح؟! مالها من(مهاباد) الى (مهاباد) ايضا كل عويل من(مهاباد) الى (مهاباد) والامومة حيرى بأثدائها الحجرية).

وشەی(ڕەشەبای) ئەم ڕستەیە دەلالەت لە تورەبوون و هەڵسان و دەست پێکردنی مێژوویی دەکات نەك لەدیاردەیەکی سروشتی و بەس چونکە لە پاڵ وشەی مهابادا هاتووە کەدەلالەت لەزەمەنی هەڵسان یا ڕووداو دەکات.

هەموو هەڵسان و تووڕەبوونەکان و دەستپێکردنەوەکانمان وەك تورەبوون و سەرەتای مهاباد وان. هەموو لێدانەکانی ئەوانیش قورسن وەك مهاباد. (كل عويل من مهاباد الى مهاباد) لەم ڕستەدا وشەی(عويل) دەلالەت لەگەڕانەوەو بەرزبونەوەکانمان دەکات، هەموو دەرچونەکان بەهێزن وەك ڕشەبا. هەموو گەڕانەوەکانیش گریەو ناڵەن چونکە دەچنەوە سەر مهاباد. ئاو جەرگەی نمونەیی کارەساتەکان.

دایکایەتیەکانیشمان بەدەس مەمکە بەردینەکانەوە داماون دیارە مەمکی بەردین هیچ پەروەردەو گەورە ناکات(والامومة حيرى بأثدائها الحجرية بين ابنائها).

شتێکی ئاساییە کە هەڵسان لە(با) بچێت چونکە هەموو هەڵسانێك جموجوڵێکی تیایە بەڵام سەیر لەوەدایە کۆتایی و گەیشتنە لوتکە ببێت بەناڵەو گریان(عويل). پۆپە دەلالەت لەسەرفرازی و ئاسودەیی و خۆشی و خەندە دەکات. لەڕوداوو سەرچاوەکەدا ئەو شکستە هەیە، بەڵام سەرکەوتن لەدەقەکەدا نرخ و بەهای هونەری لەوەدا دەبینرێتەوە دژێك کە(گریانە) بەکارهێنراوە بۆ نیشاندانی پۆپکەو لوتکەی ڕوداو.

تۆ بڵێی: بۆچی دایکایەتی داماوو سەرسوڕماو بەمەمکە بەردینەکانێوە لەبەردەم کوڕەکانیا بوەستێ؟ چونکە کوڕان چەند لەبێبەرهەمی بێزار بووبن ئەوندەیش چاوەڕوانی ئەوەیان نەکردووە مەمکی دایکیان لەبەرد بێت جودا لەمەمکی هەموو دایکایەتی دنیا. ئەم وێنەیەیش چەندی جەخت لەسەر حاڵەتی بازنەیی ڕووداوەکان بکات ئەوەندە قەدەرییەت دەرنەبڕرێت(ڕەشی ڕووداوەکە نەك بینینی شاعیر).

هیچ کاتێکیش لە خوێندنەوەی ڕەخنەییدا ئەو پرسیارە ناکەم بۆ ئەو قەدەرییەتە؟ بەڵکو دەڵێم ئەو قەدەریەتە چۆن چۆنی پێکهاتووە؟ چەند لەسەرچاوەکە وەرچەرخاوە؟ مهابادی سەلیم بەرەکات بەپێچەوانەی هەزارەها شیعری بەکوردی نوسراوە بۆ ڕووداوەکان، پەنای نەبردۆتە بەر دەربڕین تا ڕووداوو سەرچاوە وەك

خۆی بخوێنێتەوە بەڵکو لە سەرچاوە لایداوە تا ڕووداوی شیعر و هونەر دروست بکات. ئەمەیشە وەفاو دڵسۆزی بۆ ڕوداوی کوردی نەک چونەوەی ڕاستەوخۆ بۆ باوەشی سەرچاوەی ڕوداوەکان و گونجانی تەواو لەگەڵیانا یا لاساییکردنەوەیان بەپێی زاراوەی خۆ پێوانی تەواو لەتەکیانا.

## بەشێك لە کۆتایی(مهاباد)

ڕەشە بایش؟! چییەتی؟ لەمهابادەوە بۆ مهاباد.

هەمووی لە مهابادەوە بۆ مهاباد.

هەموولێدانێك لە(مهابادەوە) بۆ(مهاباد)

هەموو گریەو ناڵەیەکیش لە(مهابادەوە) بۆ(مهاباد)

دایکایەتیش بەمەمکە بەردینەکانێوە لە ناو کورەکانیا داماوە:

ئەگەر خودا، لەستایشی تەڕاوی خوێنا بێدارم کاتەوە، پێڵاوەکانم ئامادە دەکەم، ئەگەر خوێنیش بێدارم کاتەوە خودا ئامادە دەکەم.

بەڵام وەك ئازارێك کورد بەرەو حەقیقەت دەڕوا.

وەك ئازارێك سپێدە شوێن بۆ کچەکانی کۆچ کۆچ دەگێڕێتەوە

وەك ئازارێك ڕۆژ بەکوێری دەچێتە مهابادەوە.

## پەراوێز

سانی 1989 سەلیم بەرەکات ئەم شیعرەی بۆ ناردم ئێوارانێك لە کتێبخانەکەی شێخ سەعید لەڕیگای بەریدەوە نامەکەم پێگەیشت. شیعری مهاباد سانی1988 نوسراوە. دور لەخۆبەستنەوە بەجیهانی دەقەوە دەڵێم سەلیم شیعری زۆری هەبوو بەڵام بۆ لەناو هەموویانا ئەم شیعرەی بۆناردم" وەك وتم شیعرەکە سانی 1988 نوسراوە. دیارە شاعیر گەرەکی بووە پاش شکستە یەك لەدوای یەکەکانمان و ڕوداوە جەرگبڕەکانی هەشتاکان ئەم دەقە بنوسێ لەڕێگای مهابادەوە بچێتە سەریان حەزیشی کردووە خۆمان ببینین بۆیە شیعری مهابادی هەڵبژاردووە. ئەم ڕستانە وەك ڕوونکردنەوە وان نەك وەك ئەوەی گەڕان بن بەدوای مەخسەدی شاعیردا بۆیەلەپەراوێزیشدا نوسیومن



### رۆمانی(نۆردوگا هەمیشەییەکان ) ی سەلیم بەرەکات:

# باکوورێك نوقلانەی قیامەت ئەدات

**(رەخنەنووسی بەرد ئاسا بە تەنها دینامیتی هونەر دەبیزوێنێت)**

مارون عەببود

**وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی**

**ئەدگارە گشتیەکانی هونەرەکەی:**

بەدەرچوونی چوارەمین رۆمانی سەلیم بەرەکات(نۆردوگا هەمیشەییەکان) زیاتر ئەدگارەکانی ئەدەبی سەلیم بەرەکات روون دەبێتەوە، کەشێوازێکی تایبەتی ی بۆ خۆی بنیادناوە.

شێوازێك کەدانسقەیەو لەبواری رۆماندا پێشتر کەس خۆی لە قەرە نەداوە.

جا بۆ ئاسینی ئەم ئەدگارانە، پێویستە خێرا چاوێك بەکارەکانی پێشوویدا بخشێنین و ئاماژە بەرای هەندێ لەرەخنەگران بدەین. ئەگەر رۆمانی یەکەمی(زاناکانی تاریکی) باکووری سوریای هاوشان لەگەڵ سنووری تورکیادای کردبێتە زەمینەی رووداوەکانی، ئەوا رۆمانی دووەمی(رۆحە ئەندازەییەکان) چەند شوێنێکی جیای بۆ رووداوەکانی هەڵبژاردووە و کاتەکەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر وەختی شاڵاوەکانی ئیسرائیل لە ساڵی1982دا، هەروەها رۆمانی(پەڕ) سێیەم رۆمانێتی کەتیایدا نووسەر دەگەڕێتەوە بۆ بابەتە ئاشناکەی و ئەو سەرچاوانەی لەبیست ساڵی لەوەوبەرەوە هونەرەکەی ئەمیان تێراو کردووە. واتە ئاراستەی ئەخشەکە بەرەو باکوور، ئەو باکوورەی کەمناڵی و لاوێتی و تەنانەت یادی ئێستاشی داگیرکردووە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی رووداوە سەرەکیەکانی لە قوبرس روونەدەن.

بەمجۆرە دەبینین بە(نۆردوگا هەمیشەییەکان) ئەزموونی نووسینی رۆمان لای ئەم نووسەرە بەسەر پانتاییەکی زەمانیی نزیك لە دەساڵدا دابەشدەبێت. خوێنەری سەلیم بەرەکات دەتوانێ ئەو پەیوەندییانە بدۆزێتەوە کە ئەم رۆمانە پێکەوە گرێ ئەدەن، گەرچی تاڕادەیەك رۆمانی (رۆحە ئەندازەییەکان) خسوسیەتی جیای خۆی هەیە. بەڵام هەموو ئەم رۆمانانە مەسەلەیەکی سەرەکییان کردۆتە تەوەرەی خۆیان، چارەنووسی ئادەمیزاد لە گەڕانی بەردەوامیدا بەدوا شوناس و مانای ژیانیدا.

کەواتە ئەم چوار رۆمانە گەرچی لەرووی زەمانەوە یەك بابەتی هاوبەشیان نییە، بەڵام نەك هەر لەڕووی شەفافیەتی سیمبوڵەوە شێوازی‌ی هونەرییان لەیەك دەچێت، بەڵکو نموونە مرۆییەکان لەزۆر لایەنەوە لەیەك دەچن و هەروەها ئەو ئامانجانەی کارە هونەریەکەش کردوونی بەمەرام.

رووداوەکانی(زاناکانی تاریکی) لە قامیشلی روونەدەن کەچەند مەترێك لەسنووری تورکیاوە دوورە. ئەو سنوورەی بە پەرژینی تەلبەندکراو جیا کراوەتەوە و زەوییەکەی بەمین چێنراوە و کەچی وێڕای ئەوە قاچاخچییان پیایدا دێن و دەچن، نووسەریش هەندێ جار بەموبالەغەوە باس لەرەفتارە پەرجوو ئاسا پیاوانەکانیان دەکات کە لەڕاستیدا ئەمانەش کۆمەڵێك ئەفسانە بوون کە خەڵکی ئەو دەڤەرە ئەوە بەنەوە گێڕاویانەوەو لە ئەستی نووسەرداو هەرلە مناڵییەوە لەیادیدا جێگیربوون.

رۆمانی(زاناکانی تاریکی) و دوا رۆمانی(نۆردوگا هەمیشەییەکان) لە خاڵێدا هاوبەشن ئەویش ئەوەیە کەلەسەرەتای هەر بەشێکدا(دووبارە بوونەوە) یەك بۆ هەمان رووداو هەیە، لە(زاناکانی تاریکی)دا نووسەر هەروەکو تاقیکارێکی تاقیگە هەموو خانەکانی پاڵەوانەکەی دەخاتە ژێر میکرۆسکۆبی خۆیەوە، هەر لە دروستبوونیەوە وەکو کۆرپەلەیەك لە ناو رەحمی دایکیدا. لە (نۆردوگا هەمیشەییەکان)یشدا وردو درشتی ئەو شەرە کەلەشێرە دووبارە دەبێتەوە، گەرچی ئەم دووبارە بوونەوەیە هەیە وەك دواتر لێی ئەدوێین.

ئەمەتانێ لەرۆمانی(زاناکانی تاریکی)دا(مەلابێناڤ) مناڵێکی ئەبێ ناوی دەنێت(بێکەس)، بەڵام هەمووی چەند سەعاتێك بەسەر لەدایکبوونیدا تێدەپەڕێت بەشێوەیەکی‌سەیر گەورە دەبێت و ئەبێ بەلاوو داوای کچێك لەباوکی ئەکات تابیهێنێت ئیدی هەر ئەوەندە ئێوارە دێت، ئەم لاوە وەکو باوکی پیر دەبێت و لەبەردەم خەڵکی گەرەکدا باوکی دەخاتە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە، لە کاتێکا ئەوان هاتوون تاپیرۆزبایی لە باوکی بکەن کەخوا مناڵێکی پێ بەخشیوە. ئیدی رووداوەکان لەکەشوهەوایەکی خورافیانەدا و بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە سەیرە بەردەوام ئەبێ.

(بەمجۆرە سەلیم بەرەکاتی نووسەر لەرۆمانی"زاناکانی تاریکی"دا لە ژیانی راستەقینەی کۆمەڵگای کوردەواری کەشێك لەفانتازیا ئەخولقێنێت.) ئەم رۆمانەش کەوەکو رۆمانەکانی تری تیایدا واقیع بەمیتافیزیکا ئاوێتە دەبێ خەون بە یۆتۆپیایەکی پڕهیوا بەدوا رۆژ رزگار کەرەوە دەبینێ. واقیعەتی ئەم رۆمانەش لەو درەوشانەوانەدا بەدەردەکەوێ کە ژیانی نووسەر خۆیمان بیردەخاتەوە هەروەکو پێشتر لە"شێرە کوللەی ئاسنین" و"بەبەرزی بمدەرێ."دا خوێندوومانەتەوە. بۆ نموونە مامۆستا حیزبیەکە ئازاری قوتابیەکان ئەدات وجنێو بەدایکیان ئەدات و بەڵام هێندە نابات کە ڕژێم دەڕووخێ لە بەرامبەر ئەو لەخۆباییبوون و توندوتیژییەی چارەنووسێکی رەشی لەسەردەستی دایکەکان دەبێ. بەڵام لەرۆمانی"فەقێکانی تاریکی"دا وێنەی مامۆستا کە دەگۆڕێ، مامۆستاکە دڵسۆزەو ئەیەوێ بەبیرو بۆ چوونەکانی بیری قوتابیەکانی رۆشن بکاتەوە، بەڵام هەمدیسان چارەنووسی لەسەردەستی خەڵکی ناوچەکە باش نابێت، چونکە ئەو گاڵتە بەبیروباوەڕو دابونەریتەکانیان دەکات. هەربۆیە پەنجەکانی دەبڕنەوەو ئیدی لەبەرچاوان ون دەبێ. بەڵام گۆمەڵگاش لە سزا و هەستکردن بەگوناه رزگاری نابێت لەزەویەکەوە کۆمەڵێك پەنجە دێنە دەرێ و ئاماژەیان بۆ دەکەن کە تاوانبارن. ئەمەش وا لەئەهلە کە دەکات باپیرە "عەڤدی" بکەن بەپاساوانی کێلگەکەو ئەو پەنجانەو هەرپەنچەیەکی تازە ئەگەر روا دروێنەیان بکات ئەوەی ئاماژەیان پیدا جەخت لەسەر لایەنی واقیعی دەکاتەوە لەئەدەبی سەلیم بەرەکاتدا کە لەئەزموونی خۆیەوە وەریگرتوون. ئەوەی جێ‌ی سەرنجیشە وێکچوونی کارەکەی"عەڤدی" یە لەم رۆمانەدا لەگەڵ کارە پاسەوانەکە"جاجان" لە "نۆردوگا هەمیشەییەکان"دا. بەڵکو دەتوانین بڵێین کە هەردوو ئەم کاراکتەرە وێنەیەکی واقیعی‌ی رەنگدانەوەی کەسێتیی"سڤی"ی پاسەوانی جۆگەلەکانین کەناوی لەژیاننامەی نووسەرداهاتووە. ئەو پەنجانەش کەلەکێڵگەکاندا دەڕوێن و خەڵکەکە کەتاوانباردەکەن لەوینەیەکی تری دەولەمەندی وێنە بێکۆتاییەکانی"نۆردوگا هەمیشەییەکان"دا دەبینینەوە: لق و پۆپی زەقی

میوەکان وەکو باسکیان لێدێ و دەپارێنەوە... حەزمان دەکرد بەوردی و هەنگاو بە هەنگاو دوای ئەو هێلە سیحریانە بکەوین کەتان و پۆی دونیای رۆمانەکانی سەلیم بەرەکات پێکدێنن و ئەو ژینگە یە بەرجەستە دەکەن کەژینگەی نووسەرە. بەلام تۆژەر ناچار دەبێ لەسەر ئەو هێڵە ئاسۆییە بەردەوام نەبێ ولای رۆمانی "رۆحە ئەندازەییەکان" لابدات کەرووداوەکانی لەسەرەتاکانی هەشتاکاندا لەبەیروت روونەدات. بەلام ئایا بۆچی نووسەر لەم کارەیدا لەومەسەلەیە لایداوە کە خۆشیدەوێت و زۆربەی پانتایی داهێنانی شیعری و پەخشانیی داگیرکردووە؟

لەبەرئەوەی بەڕای ئێمە نووسەر هەمیشە بەڕاستگۆییەوە ئیلتزامی بۆ هونەرەکەی هەبووە کەپشتی بەئەزموونە تایبەتیەکانی خۆی بەستووە وەکوو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، هەروەها بەڕامانە دڕدۆنگەکانی سەبارەت بەو بوونەوەرانەی لەنزیکەوە ئاگاداری ژیانیان بووەو چارەنووسە جیاوازەکانیان.

لەو رۆمانەدا نووسەر شارێکی گەورەی وەکو "بەیروت"ی هەڵبژاردووە، بەپێچەوانەی شارە بچکۆلەکەی خۆیەوە، هەربۆیە ناوو مەوداو رەهەندی زەمەنیی جیاجیای تیا دەبینینەوە. لێرەدا رووبەڕووی پیاوە جۆراوجۆرەکانی رێکخستن دەبینەوە، کەبەئاشکرا بەدەمانچەکانیانەوە دەسوڕێنەوە.. ئەوانەش سەرکردەکانیانن هەروەکو لە کاراکتەری "سەرکردە" دا دەبینینەوە کەئەم رۆماننوسە بەهونەرە بەرزەکەی بەرجەستەی کردووە. ئەوەی ئاگاداری ئەدەبی سەلیم بەرەکاتیش بێ پێی سەیر نییە کە پاڵەوانی رۆمانەکە جۆرە رەنگدانەوەیەکی کەسێتیی نووسەرەکە خۆیەتی ئەو بابەتەش لای خۆشەویست بووە چونکە دیارە کەمەسەلەیەك بووە ئازاری داوە، هەروەکو دەشزانین ئەدگاری سەرەکیی داهێنانەکانی بریتیبوو لە: سۆز بۆ رەگوریشە یاد. شایانی باسە کەنووسەر لە گواستنەوەی ئەزموونەکەشیدا پەلەی نەکردووە وەك زۆر لەو رۆمانانەی کەبەوجۆرە هەڵچوون و کاردانەوەیەکەوە سەبارەت بەو ئەزموونەی بەیروت نووسراون و، هیچیان شایانی ئاوڕلێدانەوەنین. بەپێچەوانەوە، سەلیم بەرکات بەدەر لەو هەڵچوونانە و دوای چەندەها ساڵ قەڵەمەکەی ئەداتە دەست جڵەوی زەینێکی سارد بەلام بە یادەوەری هەلایساو، دەستی بەنووسینیش نەکرد ئەو دەمە نەبێ کە ئەو وێنەیە کامڵ بوو کەرۆحی بەدوایدا عەودالبوو. بەلام چی ئەم کارەی بەکارەکانی تریەوە دەبەستێتەوە راستگۆییە لە گواستنەوەی ئەزموونیمرۆییدا، هەروەها کەشی سەیرو سەمەرە و فانتازیایی کە تایبەتمەندێتیەکی ئەدەبەکەیەتی و لێرەدا لەو تارماییانەدا بەرجەستەبووە کە بەدوای پاڵەوانی رۆمانەکەوەن لەگەشتەکەیدا لەو کەشتییەدا کە خۆی و هاورێکانی بەرەو تاراوگەکان دەبات. لەلاپەرەکانی سەرەتای رۆمانی" ئۆردوگا هەمیشەییەکان"یشدا ئەم تارماییانە دەبینینەوە کەدوای کەسە زیندووەکان دەکەون. پاشان رۆمانی "پەڕ"مان خوێندەوە، خوێنەری ئەدەبەکەی هەست ناکات بەرامبەر روویەکی تازەی سەلیم بەرەکاتە. تۆژەرانیش ناکۆك نەبوون لەسەر شێوازی ئەم نووسەرەوهێما رەمزیەکانی، ئەوەش لەمیانەی کارەکانی پێشوویەوە. بەلام ئەوەی سەرنجی راکێشان مامەڵەکردنی بوو لەگەڵ مەسەلەی مێژووی تراژیکی گەلەکەیدا لە نێوان ساڵانی1900–1046دا. ئێمە ئەوە لەبەرچاو دەگرین کەسەلیم بەرەکات نەیویستووە چیرۆکێکی مێژوویی بنوسێت، لێرەشدا هەروەکو چۆن لە"رۆحە ئەندازەییەکان"یشدا بینیمان، زۆربەی رووداوەکان لە تاراوگەدا، لە قوبرس روونەدەن. لێرەدا ئێمە لەبەردەم رۆمانێکداین شوێن پێی بزاوتەکانی کوڕی باکوور هەڵدەگرێ کەخۆی لەوێنەی "مەم"دا دەبینێ، ئەو لاوەی بەمەبەستی خوێندن شارە بچکۆلەکەی خۆی جێ دەهێڵێت -کەحەلەبە-، دواتر بەغەمگینی و تەنیایی لەقوبرس دەیبینینەوە.

ئەوەتانێ واجارێکی دیکەش ئەو ئەدگارە خۆی قوت دەکاتەوە کەئەدەبی سەلیم بەرەکات جیادەکاتەوە: سۆز بۆ رەگوڕیشە/یاد. پاڵەوان لێرەدا دیسانەوە نوێنەری ئەزموونی تایبەتی نووسەرە بە ئاوێتە بوونی لەگەڵ کەشێکی نادیاری سەیروسەمەردا. هەروەها ئەو ئەزموونەی یارمەتیی داوە کە وێنەیەکی راستگۆیانەی شەێنەکان پیشان بدات، ئەمە جگەلە گواستنەوەی هەست و سۆزی تایبەتیی خۆی لە غوربەتدا، بەبێ کەوتنە هەڵدێری وێنەگرتنی رووکەشانە و(فۆتۆگرافیانە)ی کاراکتەرەکە، یان بەزۆر سەپاندنی حاڵەت و هەڵوێست بەسەریدا تا لەو رەوتە دراماییە دووریبخاتەوە بۆ پەرەسەندنی سەربەخۆی رووداوەکان کە هۆشیارانە لەدەوروبەری خۆی ئەڕوانێ و تادەگاتە ئەو بەرکەماڵیەی کە هەموو رۆماننوسێك مەرامێتی بەمجۆرە تۆژەرەوەی ئەم رۆمانە دەبینێ کەکاراکتەرەکانی سەلیم بەرەکات "هۆشیارین، لەبەرئەوەی کێشەی کوردیش کێشەیەکی سیاسییە. هەربۆیە مێژووی بزووتنەوەی سیاسیی کورد بریتییە لە مێژووی رۆحیی کاراکتەرەکانی رۆمانەکە، تێکشکانی بزووتنەوەکەش تێکشکانی رۆحیی کاراکتەرەکانە".

بەلام وێڕای ئەمەش ئەدەبی سەلیم بەرەکات لە گرفت خاڵینییەو مەسەلەی پەنهانی وەهای تێدایە کەپێویستی بەلێکۆلینەوە هەیە تاروون بێتەوە. بەتایبەتیش ئەو هێماو ئاماژە رەمزییانەی کەمانای جۆراوجۆر بەرهەمدێننو وا لە هەندێ تۆژەران دەکات نووسەر بخەنەپاڵ ئەو رێبازەی لەزاراوەی رەخنەییدا ناونراوە(ریالیزمی سیحری) کە سەرچاوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەمریکای لاتین. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە تایبەتمەندێتیی شێوازی هونەریی سەلیم بەرەکات بەئاشکرا لەم رۆمانەدا دیاردەکەوێت. بەڕای من ئەم خاڵەی دوایش خاڵی دەرچوونە بۆ تێگەیشتنی داهێنانی ئەم نووسەرەی کە هەر لەکارەکانی سەرەتاییەوە شێوازی(ناتورالیستی)ی لەرۆماندا ئەفەرۆز کرد کە بەشێوازێکی راپۆرتئاسای خاڵی لەرۆحی شیعر ناسراوە. هەروەها باق وبریقی (ریالیزمی سۆشیالیست) فریوی نەدا، ئەو رێبازەی کە داهێنان کۆت دەکات و دەیکات بەکۆیلە قاڵبە مردووەکان.

## چرکەساتی مێژوویی:

وەختێ باسی ئەدگارەکانی ئەدەبیسەلیم بەرەکاتمان کرد بەتایبەتیش لەو کارانەیدا کەبەر لە"ئۆردوگا هەمیشەییەکان" نووسیونی، بینیمان کەلەزۆربەی کاتدا قوناغێکی مێژوویی هێناوەو بەشێوەیەکی هونەریانە نەك مێژوویانە تۆماری کردۆتەوە، ئەوەش لەڕێی کۆمەڵێك کاراکتەری ئینسانیەوە کە لە ژینگەی نووسەرەوە سەرچاوەیان گرتووە و رۆچوونەتە ناو هۆش و نەستیەوە. هەروەها زانیمان کە رۆمانی "پەڕ" لەرۆمانەکانی تری زیاتر بایەخی بەمەسەلەی مێژوویی داوەو قۆناغێکی زەمەنیی دیاریکراوی کردۆتە باکگراوەندێکی گونجاو بۆ ئەو ساتەی پاڵەوانەکانی تیادەژین و، هەروەها ئاراستەی چارەنووسیان، بەو مانایەی کە ئەو

قۆناغە زەمەنیەی کە نووسەر بەیەك ئاراستە پیشانی ئەدا، بەجۆرێکە کە گوزارشت لەشەقڵی مێژوویی دیاریکراوی خۆی دەکات و وەکو زەمینیەکی هاوشان و هاوتەریب لەگەڵ چارەنووسی کاراکتەرەکانی رۆمانەکەدا دەمێنێتەوە.

سەلیم بەرەکات لەم رۆمانە تازەیەیدا "ئۆردوگا هەمیشەییەکان" دیسانەوە خوێنەر دەباتەوە بۆ قۆناغێکی زەمەنی چووتە قوژبنەکانی لەبیرچوونەوەوە. گرنگترین سیفەتی جیاکەرەوەش لەم رۆمانەدا ئەوەیە کە گێڕانەوەیەکی چێژبەخشی قۆناغێکی مێژووییە کەهەمیشە ئەلقەیەکی ون بووە لەبەرهەمی ئەدەبیماندا. لەوانەیە ئەمەش وابنوێنێ کەدوورکەوتنەوەی نووسەرە لەو ئەدگارە دیارەی کەئەدەبی سەلیم بەرەکات جیادەکاتەوە وپێشترلێی دواین واتە: سۆز بۆ رەکوریشە یاد. بەلام بەرای ئێمە. بەپێچەوانەوە. ئەم رۆمانە گەرچی سەبارەت بەقۆناغێکی زەمەنیی وەهایە کەناتوانین بڵێین دەنگدانەوەی ئەزموونێکی تایبەتییە. بەلام کۆمەلێك تایبی مرۆیی دەخاتە روو کەنوێنەری کەسانێکی راستەقینەن زۆر شت بە واقیعەوە دەیانبەستێتەوە ئەمانەش خۆیان لەخۆیاندا کۆمەلێك سیمبوڵی هوەرین کەلەژیانی تایبەتیی نووسەرەوە. چ لەدەرەوەی ناحیەوە و چ لەناوەوە. سەرچاوەدەگرن. واتە ئەو تایبەمرۆییانە هەمیشە لەو ژینگەیەدا هەبوون کە نووسەری تیا ژیاوە نووسەر نەهاتووە بەزۆر رووداوە مێژووییەکان بناخنێتە کارە ئەدەبیەکەیەوە– هەروەکو چۆن هەندێ لە نووسەران لەم چەشنە بابەتانەدا دەیکەن–بەڵکو ئێمە سەرمان سووڕدەمێنێ کەرۆمانەکە لەفەسڵی یەکەمیدا هیچ ئاماژەیەکی تیانییە بۆ ئەو چوارچێوە زەمەنیەی کەرووداوکانی تیا روونەدات تەنانەت خوێنەر سەرەتا تۆزێك وەڕس دەبێ لەو سەرەتایە کەباس لە وردودرشتی شەری نێوان دووکەڵەشێر(دوولیبوك) دەکات. ئەمە بەچاوپۆشین لە شێوازە هونەرییە دڵرفێنەکەی نووسەر. هەروەها کاتێ چوار پیاوە غەریبەکە لەسەر گردۆلکە تەنیاکە هێمنی و بەکتۆنیی ژیانی کچەکانی "مووسا موزان" تێکئەدەن، نووسەر ئەمە وەکو توخمێکی سەرنجراکێشانی لەبیناى گێڕانەوەی رۆمانەکەیدا بەکاردەهێنێ: ئەو توخمەی کەبۆ هەر رۆمانێك پێویستە. نەك وەك هەندێك کەبەناوی نوێخوازییەوە دەیانەوێ ئەفەرۆزیبکەن

دیمەنی شەرەکەڵەشێرەکە و هەروەها دیمەنی پێك گەیشتنی کچەکانی مووسا لەگەڵ غەریبەکاندا دووبارە دەبێتەوە. گەرچی بەشێوازێکی جیاواز کاتێ تارمایی مردووەکان(کەمووسا وژنەکەی و زاواکەین) دەردەکەون. ئەو گرفتە زیاتر دەبێ کەهەرلەدەرکەوتنی غەریبەکانەوە پەیدا دەبێ، بەتایبەتیش وەختێ غەریبەکان دەتوانن لەگەڵ تارماییەکاندا قسەبکەن. کەئەمە ناڕوونیەکی تر ئەخاتە سەر تارماییەکان بەلام لەپڕێکا خۆمان لەو چوارچێوە زەمەنیەدا دەبینینەوە کە رووداوکانی تیا ڕوونەدەن. ئەوەش وەختێ نووسەر رۆشنایی دەخاتە سەر ئەو شۆڕشەی کەدانیشتوان لە کۆتایی سییەکاندا دژبە فەرەنساییەکان بەرپای دەکەن

ئەم دیاریکردنە زەمەنیە لەوە بەدواوە دەبێتە هۆکارێکی گرنگی بینای رووداوەکان و پەرەسەندنیان. بۆ نموونە دەزانین کە شۆڕشەکەی سەعید ئاغا لەعامودا شەش ساڵی رێك بەر لەگەیشتنی غەریبەکان بۆ گردۆتکەکەو کۆبوونەوەیان لەگەڵ تارمایی مردووەکانی بنەماڵەی موزان(ل85) بەرپابووە، لەراستیشدا ئەم دیاریکردنە زەمەنیە مەسەلەیەکی هەرەمەکی یادروستکراو نییە لەبونیادی رۆمانی سەلیم بەرەکاتدا، بەڵکو گوزارشتە لەرێکخستنێکی ناوەکیانەی پەیوەندی نێوان کاراکتەرەکان و رووداوەکان.

لێرەدا ئەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەوەی ئاگاداری مێژووە لەگەڵ نووسەردا لەسەر ئەوە کۆك نییە کەسەعید ئاغا لەو قەناعەتەوە شۆڕشی هەڵگیرساندوە دژ بەفەرەنسییەکان کە دەڵێ: "بۆ ئەوەی سەربەخۆیی راستەقینەی عامودا درێژ بێتەوەو رەگەز دیرێنە چەلەنگەکەی لە باکووری سوریا بتەنێتەوە"ل87" بەلام بە پێچەوانەی ئەمەوە نووسەر پەردەیەکی تاریك بەسەر جوولانەوەکانی میر جەلادەت بەدرخان/ دیارترین کەسێتیی رۆشنبیری کورد لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا/ دا ئەدات کە هەوڵئەدات سەرەك عەشیرەتەکانی کورد قەناعەت پێبکات تابەو پێشنیازەی فەرەنسا قایل بن بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی بچووك لە جزیرە، هەروەکو دەولەتەکانی دیمەشق و حەلەب و کەژ و شاخەکانی عەلەویەکان و درۆ درۆز

ئێمە لێرەدا گفتۆگۆ لەسەر ئەم بیروڕایانەی نووسەر یان بەدرۆخستنەوەی زانیارییە مێژووییەکانیی ناکەین، ئەمە دەچێتە دەرەوەی سنووری ئەم وتارە. بەلام دیسانەوە جەخت لەسەرئەوە دەکەینەوە کە رۆمان لای سەلیم بەرکات داهێنانێکی هونەریی سەربەخۆیە، بەچاوپۆشین لەوەی تاچەند رووداوەکان دەچنەوە سەر رووداوە راستەقینەکانی ئەو واقیعە زیندوودەی نووسەر شتی لێوەرگرتووە هەربۆیە ئەم رۆمانە بەهای هونەریی خۆی لەدەست نادات تەنانەت کەر رۆژێك لەرۆژان مێژوونوسێك بێت و بیسەلێنێ کە ئەو رووداوو کەسێتیانەی نێو رۆمانەکە لە ئەسڵە مێژووییەکانیان ناچن سەرباری ئەم کەلێنە لەواقیعیەتی مێژوویی ئەم رۆمانەدا. هەر بەکارێکی هونەریی بەرری راستگۆیانە دەمێنێتەوە هەربۆ نموونە وەکو ئەوەی کاتێ هۆی بوونە شۆڕشگێری مووسا بۆ مەیلی عەشایری دەگەڕێنێتەوە: " لەبەر ئەوەی بنەچەی دەقورییە"(ل92) واتە سەربە عەشیرەتەکەی سەعید ئاغای سەرکردەی شۆڕشە هەربۆیەشە سەبردەکەین مووساو ژنەکەی بەگوللەی دەوریەیەکی فەرەنسایی دەکوژرێن. بەبێ ئەوەی تاوانێکیان کردبێت لەکاتێکا ئەگەر نووسەرێکی تری عەیری سەلیم بەرەکات بووایە. لەم حالەتەدا بەم جۆرە کوشتنە قایل نەدەبوو بەلکو مووسای دەکرد بەشەهیدێك بۆ نموونە لەگۆرەپانی شەڕ یان بۆردوومانداا

لەرستگۆترین وێنە واقیعیەکانی ئەم رۆمانەش ئەوەیە کاتێ نووسەر لادێییە ساویلکەکان پیشان ئەدا کەلەدیالۆگێکدا بەرجەستە ئەبێ لەنێوان "نعمان"ی شوفێر وخێزانی "گەرموموزان" برای مووسادا. وەختێ چاوەڕوان بوون کورەکانی حسێن ئاغا کەفەرەنسیەکان گرتوویانە بەخۆیان و ئەسپەکانیانەوە بێن و تۆڵە لە فەرەنساییەکان بسەننەوە.. بەلام گفتوگۆکەران سەریان لەم پرسیارە سووڕدەمێنێ: " فەرەنسا دەکەوێتە کوێوە؟"(155)

دوای شکستی ئەم شۆڕشە ولەرێی گفتوگۆی نێوان تارماییەکانەوە دەزانین کسەعید ئاغاو دەستەیەك لەپیاوانی پەنایان بردووە بۆ کێوی کورد(کورداغ) لەباکووری خۆرئاوای سوریا کەهاو سنووری تورکیایە. بەلام سەعید ئاغا لەپرێکا بەخۆی و کەژاوە تەپوتۆزاویەکەیەوە دەردەکەوێ و لە هەڵویستێکی زۆر ناروون و ئالۆزدا کەلەخەون دەچێ لەگەڵ تارماییەکاندا دەکەوێتە گفتوگۆ

لەدوا فەسڵی رۆمانەکەشدا سەرلەنوێ سەعید ئاغا لەتەپۆلکەکە لەگەڵ تارماییەکانی بنەماڵەی موزاندا یەك دەگرنەوە و گفتوگۆیەك لەنێوانیاندا روونەدات، کەوا هەستدەکەین لەگەڵ یەکێك لەو گوندیانەدا کەخاوەنی حیکمەت ودانایییە و دەتوانێ لەهەڵوێستێکی وافەلسەفیدا گفتوگۆبکات(ل244) هەروەها دەربارەی ئەفسانەی تێپەڕینی "تەیمورلەنگ"یش بەو تەپۆلکەیەدا، هەروەکو بومای هاوسەری مووسا بەوردی و بەشێوازێکی– کەشێوازی نووسەر خۆیەتی–

سەیرو تراژیك بۆكچەكانی دەگێڕێتەوە: "بەوجۆرێك كەووردترین مێژوونووسەكانیش ناتوانن بیگەنێ"(ل251) دەشێ بڵێین ئەم دووسەرنجە، جگە لەوانەی پێشووش وتمان وادەربكەوێ كەخوشێكە لەبونیادی ڕۆمانەكەدا و، یان واهەستبكرێ كەكاراكتەرەكان لەدەرەوە ڕەسم كراون و بەزمانی نووسەر قسەدەكەن.

بەلاّم ئێمە دووپاتی دەكەینەوە كەڕۆمانەكە بەشێوەیەكە هونەری نەك مێژوویی قۆناغێكی زەمەنیمان بۆ تۆمار دەكاتەوە جگەلەوەی كە نووسەر لە خولقاندنی كارەكتەرەكانیدا زۆر لابردن و گۆرانكاریێ ئەنجامداوە تاببنە كاراكتەری هونەری. دەتوانین بڵێن لە گرنگترین ئەو ڕووداوانەی كەنووسەر بەوردبینیەكی مێژوویەوە لەسەری وەستاوە ئەوەیە كەلەكۆتایی ڕۆمانەكەدا خوێنەر ناكاو بەرامبەر حەقیقەتی ئەو ئۆردوگاو تفاق و ساختومانە نهۆمدارانە دەوەستێتەوە كەلەناوەراستی ئەو چۆڵەوانیەدا قوت بوونەتەوە كەدەوری تەپۆڵكەكەی داوە، كەخوێنەرهەرلەیەكەمین لاپەڕەكانەوە ڕووبەڕووی ئەبێتەوە بەبێئەوەی پەی بەماناى بەرێت: لەڕاستیدا ئەمانە تفاقی فڕۆكەخانەت كەبەیەكەمین تیشكەكانی شارستانێتیی نوێ دڕی بەتاریكیی ئەم ناوچە پڕ بەدبەختی و نەزانین وستەمەدا.. بەڕای من جوانترین دیمەنیش ئەو دیمەنە دڵڕفێنەیە كە كچەكانی مووسا بەسەرسووڕمانەوە چاودێریی نیشتنەوەی ئەم"باڵندەیە لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەویی تەخت و تەنیشت تەپۆڵكەكە دەكەن"(266).*

ئەم وتارە یەكەمجار لە ڕۆژنامەی (الحیاة)دا بلاّوبۆتەوەو دواتر هەفتەنامەی(الاتحاد) لە ژمارەی(144)یدا ڕۆژی12ی ئابی1995 دووبارە بلاّویكردۆتەوە–و–



بەشێك لە ڕۆمانی:

# زانایانی تاریکی

سەلیم بەرەکات و:غفور صالح عبدالله

**ئەو گەمژانەی کە قایل بوون بەشداری ئەم رۆمانە بکەن:**

مەلا بێناف کوڕی کۆچەری

برینا کیژی عەڤدی ساری ژنی مەلا

کرزۆ زێوان، عانێ، حەمزات: منالأنی مەلا لەژنی یەکەمی.

خاتێ، کیژی کۆچەری: خوشکی مەلا

بێ کەس، کوڕی مەلا بێ ناف، لە بریناى ژنی دووەمی.

سینەم، کیژی مەهمەدی کۆچەری ژنی بێکەس

مەهمەدی کوڕی کۆچەری: برای مەلا بێ ناف

مەجیدۆ کوڕی عەڤدی ساری: برای برینا

باڤی جوانی، ئەو قوربانیە چەقاوە سۆیە کە مەجیدۆ دەیکوژێ

کوڕی زاری باپیرەی برینا

عەڤدی ساری، باوکی برینا و باپیرەی بێکەس

جەهوەر ساری، برای عەڤدی.

عەیشانە کیژی ئەوسی بەدرخان، ژنی مەهمەد

سەتامۆ لاوێ حەجی عەباس، قاچاخچی تووتن

حەشمۆ، مێردی خاتێ

حەیندەر، خاوەن گا.

حوسێن کوڕی کۆچەری خاوەن جووتە شاخ، باوکی مەلا بێ ناف

حەسۆ(حوسێن میرسینی) باپیرەی مەلا بێ ناف..

باران کوڕی ساری، باپیرەی عەڤدی

عبدالصمد کوری باران، باوکی عەڤدی

زیرەکە، دایکی برینا

کولش، برای عەیشانە، خالۆی سینەم

سەربەست(بەردی نۆشادر) کوری کولش

جگەر خوێن، خالۆی مەلا بێ ناف.

**بەشی یەکەم**

مەلا بێناف کوڕی کۆچەری تەقەلای دا وەکو جاران خۆی ناغروگران بگرێت. بزەیەکی هاتێ بێئەوەی لێوی دانە گەورە بەهێزەکانی ئاشکرا بکات. پاشان هەردوو دەستی هەڵبڕی و لەژێر لێوەوە فاتیحایەکی خوێند.

ئەو چەند پیاوەی لەدەرەوەی دانیشتبوون، بەهێندی ووشەی بەماناو وورتە ورتەوە ویستیان مەرایی لەبەربکەن کەچی ئاوری لێ نەدانەوە بەڵکو بەئەسپایی هەڵسا، بەرماڵەکەی راخست، بەدرێژخایەنیەکی دیارەوە دوو رکات نوێژی کرد سوپاس ووشەی حەمدو سەنای تیاکزبوو، هەرکە لێبووەوە بەرماڵەکەی هەڵدایەوە و پاشان لوولی دا، پێڵاوە لاستیەکەی لەپێ هەڵکێشا و لەدەرگاکەوە بۆ حەوشە شورە دراوەکە چووە دەرەوە حەوشەیەکی پان و بەرزین بوو، دیوەخانەکەیش دەکەوتە باکووری ئەو شوێنەی مەلا بێ ناڤی لێبوو لەلای خۆر هەڵاتەوە ژوورەکان بەدەم یەکەوە بوون، هەریەکەو دەرگایەکی جیاوازی هەیە و دەروانێتە سەرحەوشەکە، وەلێ لەلای باشووری خۆئاوایشەوە گەووڕەکەی لێیە کە پارچە زەویەکی بچووکی لە هاوشانە و بەدار ساجی رووت و گێروگەواڵ سەری گیراوە بۆ تەنوور بان.

مەلا بێناف بەرەو یەکێ لەژوورەکان ملی نا، زنجیرەیەك شوێن پێی زەردی لەسەر بەفرە تەنکەکەدا بەدوای خۆیەوە جێهێشت، لەپر وەستا، لە دووری دوومەتر لەدەرگای گەوڕەکە بەلای ڕاستا وەرچەرخا چۆلەکەیەك بووبووە فاقەوە ولنگەفرتێی بوو. نوشتایەوە و بەسۆزناکی هەڵیگرت،(زیوان)ی کوڕی بەهەڵەداوان بەرەولای هات و بانگی کرد:"باوکە ئەوە ئیمڕۆ دووان" مەلا فاقەکەی شل کردەوە و چۆلەکەکە بەلەترەدان هەڵفڕی، کورەکەی واقی وورما. باوکی خێرا پێی وت:"کوڕم، لەوانەیە خێرمان گەیشتبێ، تۆڵەت بۆ دەکەمەوە". دراوێکی ئاسنی بۆ هەڵداولەبەفرەکەدا رۆ چوو. منداڵەکەیش بەخۆشنوودیەوە چنگی پیاکردو دەستی پربوو لە گژوگیا کەلەژێر بەفرەکەدا بەدەم دەستیەوە هاتبوون. باوکەکە لەرۆیشتنەکەی بەردەوام بوو و چووە ژوورێکەوە، هاتە دەرێ چەقۆیەکی درێژی بەدەستەوە بوو، رووەو گەوڕەکە ملی نا، یەکەم بەرخ لەدەرگای گەووڕەکە بە راکردن دەرفرتایە دەرێ پاشان بەسەر بەفرەکەدا کەوت، دووەم و سێیەم و چوارەمیش بەدوایەوە بوون، هەموو بەراکردن دەردەفرتان و لە پاشان دەکەوتن. لەسەر بەفرەکە فەوارەیەکی سوور و گۆمی بچووك بچووکی سووریان دروست دەکرد و، هەڵمێکی تەنکیان لێبەرز دەبووەوە، ئەوسا مەلا بەچەقۆ خوێناویەکەیەوە هاتەدەرێ دووپیاو رایا کرد بۆ لای و چەقۆکەیان لێی وەرگرت. پاشان کەوتنە بەرخ کەوڵ کردن. ژنێك لەلای ئەو ژوورانەی کەبەدەم یەکەوەن هەڵهەڵەی لێدا. مەلا بێناف دەستی هەڵبڕی و فەرمانی دایە کە بێدەنگ بێ، ژنەکە بێ دەنگ بوو:" هەموو خەڵکی کوڕی دەبێو منیش یەکەم کەس نیم". ئەوەی وت و رووەو دیوەخان رۆی، لەبەردەرگا پێڵاوەکەی داکەندو چووە ژوورەوە، پیاوەکان لەتەنیشت زۆپانەوتە داگیرساوەکە شوێنیان بۆی کردەوە. چوار مشقی دانیشت، بەنیگای دڵنیایی و سەرلەقاندنەوە ئاوری لەلای چەپی خۆی دایەوە، ئەنجا بۆلای راستی، وەك بڵێی وەرامی پیرۆزبایەکان بەسوپاسێکی نهێنی دەداتەوە. دەستێکی بۆ قووتووە زیوەکە کەنەخش و نیگاری لەسەرکرابوو بردو دایە دەستی ئەوەی تەنیشتی و پاشان لێی وەرگرتەوە، پاشان هەر لەسەر قالیەکە بەجووڵەیەکی بازنەی بەئەسپایی دایە دەستی ئەوەی کەلەو دیوی رۆپاکە بەرانبەری دانیشتبوو، ئەویش لێی وەرگرت، گۆڕینەوەی قووتووە توتنەکان لەنێوان دانیشتووەکاندا بەردەوام بوو، ئەوەی قووتوەکەی خۆی دەدایە هەرکەسێ ئەویش قوتووە تایبەتەکەی خۆی دەدا، هەندێك لەلەفەکان تەنك و هەیشیان بوو ئەستوور بوو، کۆمەڵێك پەنجەی شارەزاو بێهەڵە جگەرەکانیان دەپێچایەوە"مەلا ناوی چی دەنێی". یەکێك لەدانیشتووان لێی پرسی "بێکەس" وەك مەلا دەمێك بێت ئەو ناوەی دیاری کردبێ وەرامی دایەوە. ئەوەی پرسیارەکەی کرد ویستی موجامەلەی بکاو ناوەکەیش هەندێ سەرسامی کردبوو:" قوربان بۆ ناوی لێ دەنێی بێکەس، لەسایەی خواوە رچەڵەکتان زۆروزەوەندە؟".

مەلا وەرامی دایەوە:"کەس هیچی نیە بێجگە لەپەزو ماڵەکەی و هەندێجار شەرمەزاری دەکەن و دەیرووتێننەوە" خاوەنی پرسیار وەرامەکەی قووت دایەوە و بەزمان خەریکی جگەرە پێچانەوە بوو، کاغزەکەی تەرکرد تا هەردوو لایەکەی یەکبگرن، لەریزە ژوورەکانی خۆرهەڵات ژنان لەدەرگایەکەوە دەچوونە ژوورەوە ولە دەرگایەکی دیکە دەهاتنە دەرێ، هەموو لە کارابوون، بەبەروانکەی سپ ئەو دەفرانەی بەنانی خۆماڵی تریتیان تیاکردبوو، بەخۆشنوودیەکی ت

وەکو ئەو بەفرەی نێوان دەرگاکان ئەنجامی شوێن پێیەکان لەگەڵیاندا هاتووچۆیان بوو. وەڵێ نێوان ژوورەکان و گەورەکە یەك پارچە زەویەکی سپی بوو شوێن پێی لێنەکەوتبوو. منداڵەکان فاقەیان لێ نابوەوە و لەژێر زەویدا شاردبویانەوە. تەنیا ئەو پارچە نانە بچووکانە بەدەرەوە بوون کەچۆلەکە بەدوریا دەگەڕان و پاشان لە ترسانا بەرەو دارە بەدەرەوە بووەکانی ژێر میچەکان ناسۆیی هەڵدەفڕین، دوای ئەوەی ئەو دووچۆلەکەیان دی کە بەسەر لەتەنانە تەرەکانەوە لنگە فرتێیان بوو. ئەگەر بهاتبا هەندێ وریا بوونایە بەبێ ترس پەلاماریان دەدا، چونکی نانی نێو بەفرەکە بەلانی کەمەوە پاش سەعاتێکی دیکە دەبوو شتێکی ناسك و، دەنووکەکان دەتوانن پارچە پارچە بیقۆزنەوە، بێ ئەوەی بزماری فاقەکان لە کەوانەکەی بترازێن هەندێ جاریش ئەوە رووی دەدا، هەرکە منداڵەکان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ فاقەکانیان لەسەر بەفرەکە بەجێ دەهێشت، چۆلەکەکان پرپۆڵەکەیان دەخوارد، بێئەوەی فاقەکە بتەقێ، لەداخاندا پەنجەی خۆیان دەگەزت، لەودیوی شووشەی پەنجەرەکانیشەوە کەدەرووانن سەر حەوشەکە هاواریان دەکرد(گەمژە ملی بشکێنە). فاقە گەمژەکەیش نقەی لێوە نەدەهات. هەموو جارێکیش بۆیان نەدەلوا نانی فاقەکان بگۆرن، چونکی گەلێ جار چولەکەکان لە شوێن پێیەکانی سەربەفرەکە دەرەوینەوە. بۆیە چاوەنۆڕ دەبوون تا شوێن پێیەکانیان بزردەبوون، بۆ ئەوەی شوێن گومکێکە بەچاکی بێ، لێرەشدا کارەسات دەقەوما ئەگەر بهاتبا بەفربارینەکە درێژەی هەبوایە عادەتیش وابوو کەدەنکە گەنم بکرێتە دان و چەشەی فاقەکان. وەڵێ لەچاوتروکانیکا بەفرەکە بەئاسانی دەنکە گەنمەکانی دادەپۆشی، بۆیە بە پارچە نانی گەورە دەنکە گەنمەکانیان دەگۆرێ تاماوەیەکی درێژخایەن بەدەرەوە دەبوون. لاوازی ئەم جۆرەیش لێرەدایە. ئای بۆ کات، دان و چەشەش کاتی خۆی هەیە، مەلا بێ ناڤیش کاتی بیرکردنەوەی خۆی هەیە. سەعات نۆونیوی بەیانی بوو. دوا کلووبەفری تەمەڵ لەسەرەخۆ دەباری(با)ی نەدەهات، هێندێ ریشۆڵە لەسەر ئەو تەلی کارەبایە کەبەسەر حەوشەکەدا تێپەڕ خۆیان دەگرن، خۆیان فش کردبوەوە، تا ملیان لەرەشایەکی چین چینی دا نوقم دەبوو، لەدەرەوەی دەرگا دارینەکەیشا سەگێك لەسەر پاشووەکانی وەستابوو، لەدرزەکانیەوە سەیری بەرماوەی ئاوسکی بەرخەکان و پێستە فرێدراوەکانی دەکرد، یەکەم جار دراوسێکانی مەلا بێناڤ هاتن، لە تاریك و روونەوە ژنەکەی ژان دەیگرت، ئەو ژنە ئاشووریەی کەلەئێوارەوە پێشبینی مەسەلەکەی کردبووهەر لە بەیانی زووەوە لەگەڵ مێردەکەی هاتبوون، ئەویش تاقە پیاوی شاری بوو لە ناو پیاواندا، ئەمەیش بەو کەسانەیان دەوت کە چاکەت و پانتۆڵیان لەبەر دەکرد، مەلا بێناڤ کورسیەکی لە نزیك زۆپاکەوە دایە میوانەکەی، وەڵێ ئەوانی دیکە هەموو لەسەر قالیە نەخشاوەکە رۆنیشتن، خۆیان بەعەبای قورس و ناوەخنی بەرەگن پێچابوەوە. پاشان قووتووە زیوینەکەی بۆ درێژکرد، کابرای ئاشووری داوای لێبووردنی لێکرد، چونکی نازانێ جگەرە بپێچێتەوە، بەهەر حاڵ ئەو حەزی لەجگەرەی فلتەرداری حازربوو. ئێستا خزمانی نزیك و دوور دەگەنەجێ(مەلا بێناڤ) ئاوها بیری دەکردەوە، مەسەلەکە برەك جارسی دەکرد، بەلایەوە گرنگ نیە ئەوخەڵکەی لەم شارۆچکەیەوە دێن پێویستیان هێندە نیە کەپێی هەڵنەسێ، بەڵکو ئەوانەی لەدێیەکانەوە دێن و چەند رۆژێك لە میوانی ئەودا بەسەردەبەن، حاڵیش وەکو خۆیەتی، هاوینی رابوردوو پشتی شکاند، گۆڵەگەنمانەکان هێندەی بستێکیش لەزەوی باڵایان نەکردو دروێنە نەکران، بەڵکو بەرەڵاکران بۆ لەوەڕ. سەڵتەنەتەکەی گورج بوو بوەوە و جێگای تەسك دەبوەوە بیری لەوە دەکردەوە چەند بەرخی سەربڕی بوو و چەند دەکوژێتەوە، چەند فەردە ئارد بەشی هاتوان دەکاو، چەند دەسەپێخەف لەژێرپێدا پیس و دڕوێن دەبن کە دۆشاوی بەفر شۆردنی و قوڕاو چووەتە نێو پێڵاوەکانیانەوە، بەهۆی گرژو مۆنییەوە هەمیشە ئاغرو سەلار دیارە، گاڵتە و گەپی پێ خۆش نیە، هێندەبەشەوکەت و فیزە بۆ ئەوەی ئەوە بپارێزێ کەماویەتی، گوێ نادا بەوەکە رابردو ئەویشی کە لەماڵەکەی دا روو دەدات غەریب بوو، گەرچی لەوێش بوو، سێیەکی رۆژێ لە بازاڕی بازرگانی بوو، ئەو شوێنەی چەند ژوورێکە پێکەوەن و پێیان دەڵێن"نووسینگە"، هەریەکەو چەند کورسیەکی لە گوش دروست کراوی تێدایەو، مێزێك بۆ ئەوەی نموونەی دانەوێڵەی لەسەردانێن، هەموو بەچیمەنتۆ سەریان گیراوە، لەسەرەوەش چەند کلاورۆژنەی تەسکی شووشە بەنی ئەستووریان پێوەیە. دواچارەکی رۆژیش لە ماڵەوەیە، ئەو چارەکە رۆژەیش درێژە و بریتیە لە ئێوارە و بەشێکی شەو، لەگەڵ خێزان و کاروبارەکەیدا نیە، بەڵکو لەگەڵ میوانەکانیدایە و قسەو باسی رۆژانەی بازرگانی لەوێ تەواو دەکەن بێگومان هاوین ئیش و کاروفرەدەبێ، ئەوەی لە بازاری بازرگانی ئەنجام نادرێ لەحەوشەی ماڵەکەیدا تەواو دەکرێ. دەروازەکە والایە، شۆفێری ئۆتۆمبیلەبارهەڵگرەکان. دێن و دەرۆن، باری دانەوێڵە لەدروێنە یەکسەر دێن بۆ بارهەڵگرەکان. قەپانچیەکان دێن و دەرۆن، هێندێکیان دەگۆردرێن بەکەسانی دیکە ئەوانیشی دەمێنێتەوە کرێی خۆیان وەردەگرن، لەنێو دەسەسری رەنگاو رەنگی پیاوانیش دا نموونەی دانەوێڵە دێت بۆ هەڵبژاردنی چاکترە پیاوانی گومرگیش لەگەڵ ئەواندا دزەدەکەن و لەبری کاروبار ئاساکردن بەشی خۆیان وەردەگرن. لە پاییزاندا مەسەلەکە جیایە، ماوەیەکی دوورودرێژ گەران بەدوای بەکرێ گرتنی زەویەکی بەپیت و تراکتۆری جووت کردن و تۆوی پاکدا، لە زستاندا چاو گێران بۆ باران، لەبەهاریشدا چاوبرینە بازاری دانەوێڵەوهەڵکردنی کوت و پڕی سەرماو سۆڵە، تادەگاتە مسۆگەرکردنی خاوەن ماشێنی دروێنەکان وهەڵبژاردنی دەستەو تاقم، هەر لە ئاشپەزەوە تا دەگاتە شوفێری ئۆتۆمبیلی ئازووقەش. لەمەوبەر گوێی بەکاروباری ناوماڵ نەدەدا، چونکی بەشێوەیەکی رێك وپێك و خۆرسك کاروبارەکان بەرێوە دەچوون. ئەوەی خاوەن سامان بێ کاروباری بەرێکوپێکی و خۆرسك بەرێوەدەچێ. ژنی دراوسێ لەبری گونیە دانەوێڵە بۆ ئازووقەی زستان دەبنە ئانکەری خێزانەکە. گۆشت فرۆش چاکترین گۆشتیان بۆ هەڵدەگرن خۆی بۆیان دەبەنە ماڵەوە، تەنانەت بێئەوەی خۆیان داوای بکەن. منداڵەکانی ئازیان هەڵدەگیرێ، خزمان لەوەدا نۆرەبڕی دەکەن، تا ژنەکەی لێیان رازی بێ، بێگومان مێردەکەشی ئاگادار دەکاتەوە، کەکێ شایستەی ئەوەیە زیاد چاکەی بەرکەوێ، تەنانەت ئەو تاقە درەختە زەیتوونەی ناو حەوشەکەیش کەماوەی حەوت ساڵە تەنیا مەترێك باڵای کردوە، بۆ ئەویش کەسێك هەبوو خۆی تەرخان کات و خۆڵەکەی دەوری بکێڵێ. کەچی(مەلا بێناڤ) ئیش و کاری زۆر داویە لەکزی لەبواری سەرقاڵیدا. بۆیە تەنیا خۆی رووبەرووی ماڵەکەی دەبوەوە: کورە، هۆو بۆ بەپێڵاوەوە دەچیتە سەرقالیەکە) هەرکە منداڵە ترساوەکە وەرامی ناداتەوە زللەیەکی پیادەکێشێ:"کێ دەفری زۆپاکەی لەبیرکردوەوپڕی نەکردۆتەوە؟"... ئەگەر وەرام نەبووایە زۆپاکەی بەرشەکان دەدا و لاردەبووەوە ودووکەڵ لەجەمسەری بۆریەزلەکانەوە کەرووەو میچەکە هەڵکشابوون، دەردەفرتا:"لەدوای خۆتەوە دەرگا داخە هەی کەرە، ماڵەکە پڕبوو لەبای سارد". "قیژەی ئەو منداڵە هارە کپ کەن". "بۆنی ساوەری سووتاو دێ، ژنەکە ئاگات لێنییە؟". "کەرن، خێزانێکی کەرن". خۆیشی لەو بێگەردیەدا هەستی پێدەکرد کە جۆرە توورەیەکی بێهۆ هاورێی بوو، هەرکاتێ بەدەفتەری

حیسابەکانیەوە خەریك بووایە کەلەسەر زۆر پیاچوونەوە شربووبوون، بەسۆزناکی ولێبووردنیکی بێدەنگ سەیری ئەوانەی دەوروبەری خۆی دەکرد، کەهەناسەیان لە خۆیان دەبڕی هەرکە ئەو هەناسەی لەخۆی بېڕیایە، بزەیان لیوەنەدەهات، کاتێ ئەویش بزەی نەدەهاتێ. بەهەرحاڵ ئەوبزەی نەدەهاتێ، بەڵکو نیگای دەگەڕانەوە سەردەفتەرەکانی، بۆ ئەو شوێنەی کەژمارەکان بە قەڵەمی رەساس نووسرابوون. مەسەلەکان هەموو بەسەرچوون وژمارە زیوینەکاڵەکان مابوون:"ئەمەیان حیسابی کێیە؟" لەخۆی دەپرسی، هێندی جار بەورتە ورتەوە، پاشان بەدووروودرێژی بیری لێدەکاتەوە تاوەرام بداتەوە:"ئا.." دەفتەرەکان بەگوێرەی قەبارەی خۆیان ریزکراون ئەو دەفتەرە بچووکانەی تەلی لوولیان پێوەیە بۆ گیرفانن و، ئەوانی دیکە مامناوەندی وچوار گۆشەیی شینیان پێوەیە، ئەوانیشی ماون گەورەو بەرگ ئەستوورن و شوێن پەنجەیان لەسەرچاپ بوەوە تا رەنگیان بواردووە. مەلا بێناڤ بەدوای شتێکەوە دەگەرێ لەبیری چووە و بۆتە ژمارەیەك، کێ ئەزانێ.. بەهەرحاڵ ئەم بەیانییە وەکو بەیانیەکانی دیکە نەبوو، ژمارە پێنجی زنجیرەی ئەوەی پەیا بوو، کەئەویش نێرینەیە، هەرهیچ نەبێ لەمێشکی باوکیدا ناوی نرابوو"بێکەس" دەشێ مەلا بەم بەشە تازەیە برەك خۆشنوود بێ، بەڵام بەفر بریاردان لە مەسەلەکە سەخت دەکا، هەڵسێ ودانیشێ و خەڵکی بەرێکاو پێشوازیان بکا، هەموو جارێکیش دەرگا بۆ بایەکی ساردسڕ بکاتەوە کە لەدەرەوە هەڵی دەکرد، کاروبار بەخۆشنوودی ناگەرێ و، لەگەڵ بلاوبوونەوەی رۆژدا

دەقیقە بەدەقیقە ئەرکی سست گەورە دەبێ کە بەسووکە کۆکەیەك دەپسا، ئەنجامی هامشۆکردنی لەنێوان زۆپاداگیرساوەکە و دەرگا ساردەکەدا. لە سەعات دەو حەوت دەقیقەی تەواودا. کاتێ مەلا بێناڤ بۆ یەکەم جار سەیری سەعاتەکەی بەرباخەڵی کرد کە بەزریزەیەکی زیوین بەدووگمەیەکی چاکەتەکەیەوە هەڵواسرابوو..

"کرزۆ" کورە گەورەی هاتە ژوورەوە، لە دەرگاوە ئامارەی بۆ کرد، وەك بڵێی داوای لێ دەکرد لێی نزیك بێتەوە وقسەی لەگەڵ بکا. (بێناڤ) گوێی نەدایە و بەقسەکردنەوە لەگەڵ یەکێك لە دانیشتوان خەریك بوو. هەرکە منداڵەکەش بەنیشارەتی بێدەنگ ناوی لێ سەندبوو، باوکی بەفیزێکەوە بانگی لێکرد:"وەرە بەرەوە لەبەر دەرگا وەکو مشکە کوێرە مەوەستە، رەقت کردینەوە" منداڵەکەش نیوەی سەرەوەی جەستەی لە دەرگاکەوە درێژکردبوو وپێی لەدەرەوەبوو نەبا پێ بخاتە سەر قالبەکە ناچاربوو پێلاوەکانی داکەنی دوای ئەوەی هەردوو پاژنەی زۆر کێشابوو بەبەردەرگاکەوە، لەوانەیە پێلاوەکانی تەسك بووبێ. پاشان بەئەسپایی چووە ژورەوە، لەنزیك باوکی هەڵکورما، لەودیوی جەمانیە سپیەکەیەوە کەسەروملی پێپێچابوەوە بەگوێیدا چپاند. (بێناڤ) بەگومانەوە سەیری منداڵەکەی کرد، پاشان ئەو گومانەی بەدەم بزەیەکی گەمژەوە رەوانەوە سەیرێکی دانیشتوانی کرد، وەڵێ بەقسەکردنێکەوە سەرقاڵ بوون و ئەو گۆرانەی سەرچاویان رەچاو نەکرد. دەستوری دایە منداڵەکە بڕوات. منداڵەکەش رۆی، بەرلەوەی هەڵسێ و بچێتە دەرەوە، دیتی ژنان بەرەو ژوورێکی دیکە دەچن کەژووری ژنەکەی نەبوو، لەو شوێنەی کە دەبوو خۆی و کۆرپەکەی لێبێو. چاوی بەخوشکەکەی کەوت کەرۆژی خۆی تەرخان کردبوو، لەبەردەرگا بوەستێ و ژنان بەنەرمی بەرێبکا:" بۆ ئەو ژوورە، بەیارمەتی خۆتان، برینا حاڵی باش نیە" وەڵێ چاوی ژنەکە توورەیی دەنواند، خەریك بوو هاسات نا ساتێکی دیکە دەردەفرتا. هەرکە چاوی بەبراکەی کەوت، بێنەوەی چاو بترۆکێنێ لەدوورەوە چاوی تێبری، بەشێوەیەك حەپەسابوو و لەدوو بیبلەکەیدا وەکو چاوی واشە دەدرەوشایەوە.مەلا بێناڤیش سەیری کرد تالەسەرچاویدا لەقسەی منداڵەکە دڵنیابێ بەرلەوەی قسەبکا. هێندە لێی نزیك بوەوە، خەریك بوو لووتی بتەقێ بەلووتی خوشکەکەیەوە. کلوو بەفری سپی تەمەڵ دەکەوتنە سەرچاوو برۆیان و چاویان نەدەترووکاند، دەستی بۆ دەسکی دەرگاکە درێژکرد ئافرەتەکەشی بەچاو ئاوڕی لەدەستی دایەوە، لەو بزاوتە ئەسپایەی کە پاش تۆزێکی دیکە لەرزی لێدێنی. پەڵی نا بەدەرگاکەوە و هێشتا لەودیوی شانیەوە سەیری خوشکەکەی دەکرد. لەدوای خۆیەوە دەرگاکەی داخست و، چاوی لەژوورە کەدا گێرا ژنەکەی لەسەر نوێنێك لەسەر قالیەکە پاڵ کەوتبوو لە هەمان پێخەفدا لە تەنیشتی بوو، تا تەوقی سەری داپۆشراوە، لە قەبارەی لەهی منداڵ گەورەترە، یەکەم جار وای هەست کرد، وەڵێ یەکەمجاریش مەزەنەی هەڵەی نەکردبوو بۆ قەبارەکان، پێلاوەکانی داکەند لەقەراغ قالیەکە و چووە بەرەوە، ژنەکەی بەدەردەداریەکی دیار و ئاوێتەی ترسێکی نامۆوە سەیری کرد لە تەنیشت پێخەفەکە لەسەر ئەژنۆکانی رۆنیشت و، هەردوو چمکی عەباکەی لەرانەکانی توندکرد:"چۆنی؟" لێی پرسی، ژنەکە بەهەمان نەخۆشییەوە چاوی تێبری، وەڵێ لێوی ژێرەوەی دوو جاران لەریەوە، رووی خۆی وەرگێرا، چاوی بڕیە ئەو سەرپۆشەی لەتەنیشتی بوو، بەئەسپایی دەستی بۆ نووکی سەرپۆشەکە درێژکرد، رایکێشا، قژێکی رەش و چروپربەدەرکەوت، هەرکە زیاتر رایکێشا نێوچەوانێکی سووروسپی دەرکەوت.

هێندی گرژبوو، مەلا چاوی زەق بوو، دەستی دەلەرزی، چارەی دایە یەکەوەو ورتە ورتێکی نەبیستراوی لێوەهات. پاشان سەرپۆشەکەی لەسەر هەموو سەروچاوی لادا. هەواڵ لە ژوورە داخراوەکە دەردەفرتێ کە خوشکەکەی مەلا لەبەردەرگاکەی وەستابوو، حەپەساوی خۆی دەگەیەنێتە سەروچاوی میوانەکان، هەنووکەیش پیرۆزبایی دەبێتەجۆرە خۆتێ هەلقورتاندنێك"ئەرێ راستە مەلای بەرێزمان؟" بەرلەوەی خاوەن پرسیار قسەکەی تەواوکات مەلا وەرام دەداتەوە:"بەخوادانە هاوسێ، بەخوادانە.." هەموو نیو سەعات جارێك مەلا خۆی دەبینێ بەرەو ژوورە داخراوەکە دەروا، هەمدیس دەهاتە دەرێ پترتورە بوو بوو، داوای لە خوشکەکەی دەکرد بەرەبەرە میوانەکان کەم کاتەوە و دەرگا داخا. دواجار کەسیش نەیەتە ژورەوە. هەرکەبەسەر سوورمانەوە سەیری دەکرد وەك بڵێی لێی دەپرسی:" چۆن دەکرێ بەر لەم هەمووە بگرین؟" بەدەم رێوە وەرامی دادەیەوە:"ئێمە لێرەنین، پێیان بڵێ ئێمە لێرە نەماوین" بەفرە تەمەڵەکە لە ئاسمانێکی شیر ئاساوە لەسەرەخۆ دەبارێ، دەقیقە لەدوای دەقیقە شوێن پێیەکان وون دەکا، ریشۆڵەکان لەسەرهەمان تەلن کەستوونەکان لەسەر حەوشەکەدا دەگەیەنێتەوە یەك، تەنیا چۆلەکەکان نەبێ دوای ئەو بێدەنگینە نەگەڕانەوە. کورە شەش ساڵانەکەی مەلا لێی نزیك بوەوەو داوای لێکرد رێگای بدا سەر لەنوێ تەلەکان بنێتەوە، باوکی بەدوورو درێژی تێی راما، بێگومان بیری لەوەرام نەدەکردەوە بۆ جاری دووەم کورەکەی پێی وت:" ئایا راستە چۆلەکەپێی بەستراوە؟" مەلا لێوی خوارووی نووشتانەوە و برۆی هەڵبڕی:"وادەڵێن، پێیەکانی بەکۆت و زنجیری نەبینراو بەستراون بۆیە هەڵدەقونێتەوە" "بارکە کێ بەستوویەتی؟" منداڵەکە لێی پرسی:" کورم، خوا دیارە گوناحێکی کردووە و شایستەی کۆت کردنە". دەمەونیوەرۆیە، تەمەنی کۆرپەکەیش حەوت هەشت سەعاتە. مەلا دەچێتە ژوورەکە و زۆر دەمێنێتەوە، خوشکەکەی لبەردەگارکەدا دێ و دەچێ و فوو دەکاتە نێو دەستە تەزیوەکانیەوە، هێندێ جار دەوەستێ تا گوێ بۆ دەرگا هەڵخات، پاشان لەبزواتەکەی بەردەوام دەبێ و دێ و دەچێ، بێ ئەوەی گوێ بداتە دەنگی

دەرگای حەوشە کەجار ناجارێ لێ دەدرێ هێشتا ئاگری ژێر مەنجەڵە گەورەکەی نزیک تەنوورەکە دەسوتێ، هەڵمێکی چڕی لێ هەڵدەسێ و لەگەڵ دووکەڵی ریخی تەڕدا تێکەڵ دەبێ کەبۆ سووتەمەنی بەکاری دێنن. پیرێژنێك بەدارێکی درێژ مەنجەڵەکەی تێك دەدا. پاشان لەبەرئاگرەکە کسۆڵە دەکا و خۆی گەرم دەکاتەوە. داوەتەکە تەنیا میوانی کەم بوو کە ئەم بەیانیە هاتبوون، بەرلەوەی گۆشتی بەرخەکان بکوڵێ دیار نەمابوون. ئەویشی نزیکی ئەو ئاهەنگە کزوکەم میوانە بوو دەرگایان لێنەدەکرایەوە. کوڕەکەی مەلا خەریك بوو بەبەفر تەڵە تەزیوەکانی دادەپۆشی: " بۆخاتری خوا ئەم هەمووەیلەکوێ دیوە؟" مەلا ئەمەی وت هەرکە خوشکەکەی لەبارەی باردۆخی ژوورەوە لێی دەپرسی و چی لەوێ روو دەدا، هەمدیس هەڵیدایە: " ئەوەیش دەزانێ کەلەخەو ماوم و نوێژی بەیانیم رۆی بەهۆی شەوارەوە. بڕوا دەکەی؟" ژنەکە لێ ی پرسی: " ژنەکەت حاڵی چۆنە؟" حەپەساوە" وەرامی دایەوە. " کەواتە هەنووکە چی بکەین؟" بەسەردانەواندنەوە وەرامی دایەوە: " کێ دەتوانێ چارەنووسی خۆی بگێرێتەوە. وەلێ ئەوەی دەمترسێنێ ئەوەیە مەسەلەکە لەکوێیەوە دەوەستێ؟" مەلا لە ناوەراستی بەفری حەوشەکەدا بەرەو ئەو پیرێژنە ملی نا کە خەریکبوو بەدارەکەی دەستی لەناو مەنجەڵەکە خواردنی تێك دەدا. کوڕەکەی لەسوچێکی گەووڕەکەدا کەکردبوویە حەشارگە و لەوێوە چاودێری تەڵەکانی دەکرد، بانگی لێکرد" وریابە باوکە پێت نا بەتەڵەیەکەوە". بەڕاستی مەلا ئاگای لەوە نەبوو کە لەژێر پێیەوە سووکە تەقەیەکی تەڵەکە بەرزبوەوە. قەدەرێك سەیری ژێر پێی خۆی کرد پاشان ملی ڕێگای گرت: "بەرخەکان چۆنن؟" پێش ژنەکە کەوت وژنەکەش بزەیەکی چرچی هاتێ و وتی: " هەنووکە گەرم و گوڕە ئەمەیان باشترە لەزقومی گەوڕەکە". ورتە ورتێکی لێوەهات" ئەی ئاگرەکە؟" کەمەیان پرسیار نەبوو، بگرە تەقەلایەك بوو بۆ دوورخستنەوەی تارمایی پرسیارێکی دیکە کەوەرام دانەوەی زەحمەت بوو. ئەویش لەنزیك مەنجەڵەکە کسۆڵەی کرد و دەستەکانی دایە بەرگری ئەو بڵێسە زەردانەی کە کوچا گرەکانیان دەلستەوەو پاشان دەگەشانەوە "برام" خەیاڵ بردبوویەوە لەبەردەم ئەو گەرمایەی کە ئەو کلوو بەفرانەی بەعەباکەیەوە نووسابوون دەکردە چڕاوگەی ئاوو لەدوتوێی تەونە رەشەکەدا وون دەبوون"برام" گوێی لێبوو هەرکە خوشکەکەی بۆ جاری دووەم بانگی لێکرد. ئاوڕی دایەوە و هێشتا کسکۆڵەی کردبوو. ژنەکە سەیری ئەوی نەدەکرد، بەڵکو دەیڕوانیە دەرگاکە، دەسبەجێ هەستی پێکرد ئەوساتەیش کەچاوەڕوانی بوو والەئارادایە لاوێکی سوروسپی، قژ رەش و پڕ، لەهێندێ شوێنی سەروچوپەوە ردێنی هاتووە لەدەرگاکەوە، سەری دەرهێنا، بەدەستی سێبەری بۆ چاوی کردوە تاخۆی لەتیشکی بەفرەکە بپارێزێ، بەو دەستەکەی دیکەی پۆشاکێکی ئەستوری لەجەستەی خۆی گوشیوە، کورتە بالآیە بەلآم رێك وپێکە. لەوانەیە بیست و حەوت یان سی سالآن بێ، مەلا بە خاوخلیچکیەوە هەڵسایە سەرپێ. هەرکە روو بەرووی بوو پێ ی وت: " کوڕم بەفرەکە ئازاری چاوت دەدا" لاوەکە چارەی دایە یەکەوەو وەرامی دایەوە: "باوکە دەبێ ئەو هەموو شتانە ببینم کە تەنیا بەهەست کردن دەیانناسم" بڕەك بێدەنگ بوو، چاوێکی بەحەوشکەکەداگێڕا وتی: " براکانم لە کوێن؟"مەلا ئاوڕێکی لە خوشکەکەی دایەوەو سەرێکی بۆ لەقاند. ژنەکەیشی بەرەو ژوورێکی تەنیشت رۆیو بەر لەوەی بگەڕێتەوە مەلاو کورە لاوەکەی سەرلەنوێ دەچوونە ژووری دایکەکەوە پاشان لەسەر پێخەفەکە لەتەنیشتی دانیشتن. دوای قەدەرێك هەرچوار کوڕەکەی هاتنە ژوورەوە. منداڵن، بچووکەکەیان چوار ساڵانەو گەورەکەیان تەمەنی دەساڵانە. خوشکەکەی رێنومایی دەکردن کەلەدەوری زۆپاکە لەکوێ دانیشن. سووکە ژاوە ژاوێکیان لێدەهات، بچووکەکەیان لە پڕێکا هەڵیدایە"دەمەوێ وەکو بێکەس گەورەببم" گەورەکەیان لێی خوڕی: "بێدەنگبە" گەورەکەشیان بەهەست دەیزانی و لە ئاستی ئەو حەپەساویەی سەروچاوی باوکەکە دەسەپاچەیی دەنواند کە مەسەلەکە گاڵتە نیە باوکەکە هیچی نەدۆزیەوە بیڵێ، تا پێ ئاساندنی هەرچوار کوڕەکەی لەلایەك و ئەو منداڵە تازە لەدایك بووەی کە هەموو سەعاتێك ساڵەکان کورت دەکاتەوە لەلایەکی دیکە، ئاسان کات، هانا بەرێتە بەر چ پەندێك تا وابکات تێگەیشتنی گونجاو بێت و پەنا بەرێتەوە بەر چ دیاردەیەك بۆ ئەم شتە سەرسوورهێنەرە کە هیچ شتێ خۆی لەقەرەی نادا، جگە ئەوە نەبێ کەسەبارەت ئەو پێغەمبەرە بیستبووی لەلانکەدا قسەی کردوە و قسەی گەورەیشی کردووە، نیگا حەپاساوەکەی لە نێوان ژنەکەی کەسەری لەسەر بالیف کردوە و خوشکەکەی دێ و دەچێ، هەرکە هیچی نەدۆزیەوە بەچپە ئاسا ووتی. "ئەمە بێکەسی براتانە، بێکەس ئەمانەیش برای تۆن" قسەکەی مەلا وەکو دەنگی تەنەکە لێدان وابوو. لاوەکە بەخشکەو لەسەر چۆکان لەبراکانی چووە بەرەوە کەلەدەوری زۆپاکە دانیشتبوون. بزەیەکی هاتێ و منداڵەکان چاویان زەق بوو، دەستێکی سورو سپی بەقژی برا بچووکەکەیدا هێناو گەمەیئاشنایی لەگەڵ دەکرد. منداڵەکەش سەری ئەوی کرد تا ئەو دەستەی بەرنەکەوێ، وەلێ کورە گەورەکە"کرزۆ" وەکو برا بچووکەکەی دەسپێشخەری نەکرد بێزاری بەرانبەری نەنواند بەدەم دانیشتنەوە لەسەر قاڵیەکە کشایە دواوە، بەڵکوبە"بێکەس" ی وت: "بەخێرهاتی برام." پاشان دەستی بۆ درێژکرد و تەوقەی لەگەڵدا کرد. ئەمەش دەسپێخەرەیەك بوو لەکوڕەگەورەکەوە بۆرەواندنەوەی ئەو حەپەساویە گەرم و گوورە، کە گەرمایی زۆپاکە وروژاندبووی سیانەکەی دیکە بەچرپەوە وتیان: "بێکەس بەخێرهاتی". دیك و باوکەکە وەك بلێ ی ئەو ئاناساییەیان لەبیر چووبوەوەو ئەم دەسپێشخەریە زیرەکانەی منداڵەکان هانی دان بەگەرمی منداڵەکان هان بدەن: "یەکدی ماچ کەن ئەوانە براتن، ئەویش براتانە، شوورەییە وەکو نەناس چیە چیتانە، دەنگ هەڵبڕن، بەڵێ، ئاوها"لەخۆبایی بوون لەنێو منداڵەکاندا رەویەوە، کە هێشتا لە هەناوی دایك و باوکیاندا مابوو "بێکەس" دوای دووسەعات لە دایك بوونی دەرگای وێنەی باوکایەتی لەسەر خۆی داخست، هەردووکیانیش هەروەکو کورپەیەك تەماشایان دەکرد. سۆزی دایك و باوکایەتی لەدەروونیاندا بەرانبەر بەکۆرپەیەك دەپەنگایەوە، پاشان لەدەرەوە گەشەی کرد بەجۆرێك سەرسوورمان و حەپەساوی بووە سەرداری هەستیان دایك و باوکیان تەنیا چاودێری دەکەن، لەهەموو تەگبیرێك کاروبار بەرێوە دەچێ، "زیوان" خاوەنی تەڵەکان رووی دەمی دەکاتە بێکەسی برای و دەڵێ: "حەزت لەڕاوە چۆلەکەیە؟" چۆلەکە"بێکەس دەپرسی "ئا. چۆلەکە، بەرلەوەی بێم زۆرم لێ راوکردن". بەبزەیەك سەیرێکی براکەی کرد کەوەرامەکە بەلایەوە ناکاو بوو، پاشان لەسەری رۆیشت تا حەپاساویە تەنکەی منداڵەکە بڕەوێنێتەوە: " وەکو تۆ چۆلەکەمان بەلەتە نان راو نەدەکرد، بەڵکو تەڵەکانمان دەخستە نێو گەڵآی دارەکان و میوەمان دەکردە چەشە". دوای ئەو وەڵآمە رووی کردە گەورەکە(کرزۆ) و لە خاوەن تەڵەکان گەڕا، پرسیاری یەك لەدوای یەکی دەکرد: "بۆلێم ناپرسی چۆن وازوو گەورە دەبم؟". (کرزۆ) وەکو یەکێك پرسیارێکی دۆزبێتەوە دەمی کردەوە، بێکەس دەرفەتی نەدا قسەکەی تەواوکات. ئاوڕی دواوەی دایەوە، بۆ ئەو شوێنەی کە چاوانی دایك و باوکیشی بەهەمان پرسیار دەدرەوشانەوە: "ئەفرەت" ورتەیەکی لێوەهات: "چۆن بتوانم کە خویشم ووزەی روون کردنەوەیم نیە. منیش وەکو ئێوە سەرم لێی سوورماوە.

هەموو سەعاتێ دەتانبینم کەسانێکی دیکەن و ساڵ بەساڵ لەگەڵمدا گەورە دەبن، هێندەش پەلەیە تێگەیشتنم سەبارەت بەشتەکان تێکەڵ وپێکەڵ دەبێ کەبەرلەوەی بێم سەبارەتان دەمزانی "بەرەك بیدەنگ بوو، و لەسەری رۆیشت: "سەر سووڕمانم دوو سەرسووڕمانە، سەرسووڕمانی ئێوە لە بارەی منەوەو سەرسووڕمانی من لە بارەی ئێوەوە باپێکرا بەمەسەلەکە رازی بین. چونکی ئەوەندەی کات بەبەرەوە نیە. سەیرکەن، ئەمەو عەسر ئەبمە چل ساڵان و لە ئێوارەیشدا دەبمە پەنجا ساڵان.. شەویش؟.. نازانم باوکە هێندێ مەسەلە هەیە دەبێ لەگەڵتدا جێبەجێی بکەم، خوولەکە هەر خوولە، ئەگەر لە رۆژێکدا تەواو بێ یان لەبیست هەزار رۆژدا تەواو بێ، لە مەڕتۆ روون کردنەوەی مەسەلەکە سەختە، بۆ ئەوانەی لەودیوی دەرگاکەوەن و چاوەڕێی وەرامی بنەبڕن، بەراستی قوڕبەسەریە، خۆت تەنیا بۆ ئەوە تەیارکەو سەرسوڕمانی من لەبیرکە."

برا بچووکەکەی دەستی بەرانی دا هێنا تا ئاوەڕی لێبداتەوەو ئاوڕی دایەوە: "تۆ دەفتەرت هەیە؟ من دەفتەرم هەیە" منداڵەکە ئەمەی وت "ئۆە" بێکەس وەرامی دایەوە: "دەفتەر!! ئەو هەموو دەفتەرانەی لەلای باوکمە دەفتەری منن". منداڵەکە چارەی گرژ کرد "نەخێر دەفتەری باوکمن". (بێکەس) بێزاری دەربری، چونکی پرسیارە شیاوەکانی ئەو منداڵانە درێژەی دەکێشا: "باوکە، دەمەوێ دوو بەدوو قسەیەکت لەگەڵدا باس بکەم کەتەنگی پێهەڵچنیووم". پاشان سەیری دایکی کردو وتی: "لەگەڵ تۆیش". (خاتێ) باوکەکە بانگی لێکرد، خوشکەکە وا بەهەڵەداوان هاتە ژوورەوە وەك بڵێی بەدرێژایی وەخت گوێی لێدەگرتن: "بەڵێ؟" پێی وت: "خوشکم منداڵەکان بەرەو خواردنیان بدەرێ" مەلا وتی و هەمدیس لەسەری رویشت: "درەنگە و هێشتا نانیان نەخواردووە" خوشکەکەی چووە پێشەوە و لەدەستی بچووکەکەیانی گرت و ئەوانی دیکەی وەك پەزی دڵخۆش دایە پێش خۆی. (بێکەس) بەخشکە لەسەر ئەژنۆ لەنوێنی دایکی نزیك بوەوە، بەهەمان شێوە کە لە زۆپاکە نزیك بوەوە "گوێم لێبگرن" دەسپێشخەری کرد چونکی زانی تانووکی پەنجەی گوێی لێدەگرن: "دەمەوێ ژن بێنم" بێدەنگ بوو تالێویان بخوێنێتەوە کە هێندێ شۆڕ ببونەوە، هیچ دەربڕینێکیش لەسەرچاویاندا بەدی نەدەکرا، وەك بڵێی دەیەویست پتر بە جادو یەك کۆتیان بکات تاپتر شۆڕببنەوە، تا بەهەژانێکی لاستیکانە گۆشتیان لەسەر ئێسقانیان دابماڵێ، وتی: "کارەساتە". باوکی ورتەیەکی لێوە هات: "کارەساتە" وەکو یەکێ: وڕێنەبکا وەڵ دایکی شانەکانی لەو بالیفەدا چەقین کە پاڵی پیوە دابوو، وبووە پارچەیەکی خۆڵەمێشی لەپێخەفە خۆڵەمێشیەکە" کارەساتەو هەرکە بەسەریش چوو لەبیریان ئەچێتەوە، بەڵام من کاتی ئەوەم نیە لەبیری خۆمی بەرمەوە، دەمەوێ ژن بێنم و پێویستیەکە و بەرلەوەی داوای جل وبەرگ بکەم کەلەبەری بکەم" ئەمەی وت. لەو دەمەدا باوکیچاوی نووسابە چوارگۆشەیەکی شینی قاڵیەکەوە، هەڵزەپاوو رەق بوو، لەوانە بوو یەکێك لەو گۆشەکانیشی لەوژێر قاڵیەکە بزرێ. لەمێشکی خۆێدا گۆشەکانی رێك دەخست، بەهێڵێکی ئاسۆیی بەرەو گۆشەکە دەخولایەوە پاشان بۆ هێڵێکی ستوونی، هەڵدەکشاو دادەبەزی، وشەیەك نادۆزێتەوە، مۆتەکەیەکی چوارگۆشەیی شین دەست بەسەر زمانی دادەگرێ و دەیکاتە شینایەکی پان وپۆر لەحەوشەکەدا، نەك لەوشە ئەندازەیەکان. مەودایەکی کاریگەر مێژووی مەلا وباوباپیرلنی لەعەدەمێکی شیندا حەشار دەدا، مەودایەکی کەروڵاڵ و لە چوارگۆشەکەدا گۆشەکانی دەتوینەوە و ون دەبن و چیدی دەرناکەون خۆی و ژنەکەی تەنیا کەوتبوونە نێو ئەو بێدەنگیە گاڵتە جاریە "ژن دێنی" دایکی بەچرپەوە وتی، باوکیشی بەئاگاهاتەوە و وتی "ژندێنی" وەك بڵێی هەردووکیان واتای وشەکەیان نەدەزانی تەنیا (بێکەس) نەبێ کەبەم حەپەساویە گاڵتە جاریە بزەی دەهاتێ "بەڵێ" بەسووربونەوە وتی: بێگومان مامەکانم دەناسی و دەتوانی یەکێك لەکیژەکانیان هەڵبژێری "مامەکانت؟" باوکەکە ووشەکەی دووجار وت "ئا..!" پاشان بەرەو هەڵدێری چوار گۆشە شینەکەی قاڵیەکە گلۆربوەوە: "مامەکانت؟" راپەری: "گاڵتە دەکەی؟ بڵێ گاڵتە دەکەی بروامان پێ ناکەن بەوەی دەیڵێن هێشتا ئێمە بڕوامان بەمەسەلەکە نەهاتووە بێکەس کێ لە پێناوی درۆیەکدا کیژی خۆی دەدا؟" کوڕەکەی وەرامی دایەوە: "باوکە پێویستە لەسەرت تەقەلا بدەی، وەختی زۆری بەبەرەوە نەماوە" باوکی تووڕە بوو" وەختی کێ کابرای سەیر؟ باکی بەوەیە ئەگەر وەخت مابێ یانەمابێ بۆ دەبێ گوێ کێ سووربوونەکەت بگرم کەهێندەی دی کارەساتەکە سەخت دەکا؟ بۆ خاتری خوا بمانپارێزە، تۆ لەناومان ادەبیەت".. "نەخێر" بێکەس وەرامی دایەوە: "مەسەلەکە براوەتەوەو دەبێ بیکەی..." مەلا هەڵسایەسەر ئەژنۆ و هەرەشەو گورەشەی دەکرد. "کێ مەسەلەکەی برانۆتەوە؟" کوڕەکەی وەرامی دایەوە" باوکە دواجار حاڵی دەبێ". "نامەوێ لەمەودوا هیچ حاڵی ببم و ئەهەنووکەش دەمەوێ، بەرپرسیاری تێگەیشتنی ئەم کارەساتە نیم، باخوا بۆ خۆی تێی بگا". ژنەکەی لە قۆڵی گرت وەك بڵێی لۆمەی دەکرد کە ئەو قسەیە لەشان و شەوکەتی کەسێکی وەکو ئەو ناوەشێنێتەوە، قۆڵی راکێشاو وورتەیەکی لێوە هات: "بۆ من؟" پەنجەی بۆ سەرسنگی خۆی درێژ کرد: "ئەگەر بۆ ئەم تاقی کردنەوەیە هەڵبژێردراوم دەرەقەتی نایەم. مرۆ تارادەیەك ووزەی هەیە، گوێ بگرە، سەرحەدی توانای من لەو حەوشەیە تێپەڕناکات کە براکەت راوە چۆلەکەی لێدەکات" تادەهات لێدانی دڵی بەرزتردەبوو عەباکەی دەلەرایەوە، وەك بڵێی هەموو جەستەی مەلا بۆتە دڵێکی تۆقیوو: "وابزانم تۆ هەموو شتێك دەزانی، کەواتە رێگایێکمان پیشان بدە" لەسەر پێخەفی دایکەکە بەدانیشتنەوە کشایە دواوە. بەتاڵیەوە خۆی دابووە دەستی قسەکانی ئەوەی کە چاڵیەکانی دەوری سەرچاوی تادەهات قوڵتر دەبوون. قووتووی زیوینی توتنەکەی لەتەنیشتی چوارگۆشە شینەکەی قاڵیەکە بەدەم پەنجەکانی بێکەس دەخولایەوە، باوکی سەیری ئەو جموجۆڵەی دەکرد و چاوەڕێی وەرامێك بوو. (بێکەس) قووتوەکەی لەسەر لەپی گرت و بۆ باوکی درێژی کرد: "باوکە جگەرەیەکم بۆ بپێچەوە". "جگەرە.. بەڵێ.. جگەرە" مەلا وەك بڵێی خەوی لێکەوتبێ وەرامی دایەوە و قووتوەکەی لێوەرگرت، کردیەوەو کاغزێکی تەنکی لەهێندێ تووتن پێچایەوە، پاشان قەراغەکانی تەڕکردو تەواو بوو، دایە دەستی کوڕەکەی و بەچەرخە ئەوتە پڵیتەدارەکەی بۆی داگیرساند، کوڕەکەیش" زاری پڕ لە دووکەڵ کردو بێ ئەوەی هەڵیمژێ و لەسەرەخۆ دەریدا باوکە تووتن تاڵە، چۆن بەرگەی دەگرن؟" لەپاشان وەکو بێزهاتنەوەیەك تفی قووتدا، وەڵ جگەرەکە لەنێو ئەو دووقامکەی دەسووتا کە باوکی چاوی تێبڕیبوون: "بێکەس ئێستا چی دەڵێی؟" بەورتەوە ووتی و بێنەوەی سەیری سەروچاوی بکا. کوڕەکەی وەرامی دایەوە: "باوکە هەرهەمان داواکاریە و ژن دێنم، مەسەلەکەش لەگەڵ مامەکانمدا تەگبیر بکە" باوکی هەڵسایە سەرپێ و پاشان سووکە شەقێکی تێهەڵدا و وتی: خۆزگە نەبوویتایە... خۆزگە نەبوویتایە" دەگەرابۆ ووشەیەك. تاوەسفی پێبکات بۆی نەدۆزرایەوە لەوانەیە: "ئەگەر سەمەرە نەبوویتایە" یان "سەیر نەبوویتایە" یان "شتێکەو پێی دەڵێن کوڕ" یان "هاتوویەکی و هێشتا لە خۆبایی بوون لە نێوانماندا هەیە" یان.. کێ دەیزانی بەو توورەییە بیری لەچی دەکردەوە، وەڵ لەسەری رۆیشت

وتی:"سەرو گوێلاکیم بەرشەق دەدا، تووشت کردم، تەنانەت دەرگام لەرووی میوانانیش داخست، ئەواتا لەگەڵ کەسانی دی تووشم دەکەی بەداواکاریەك کەس تیّی ناگا لەزینەوە ریّکەوە کەکەس تیّی ناگا پاشان بەرەو دەرگاکە ملی ناو هاواری دەکرد:"رادەکەم، دەبیّ لەم ماڵە راکەم..." پیّلاوە لاستیکە مل دریّژکەی لەپیّ هەڵکیّشاو دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست. (بیّکەس)یش خیّرا بەرووتی لەژیّرئەو پۆشاکە ئەستوورەی کەجەستەی پیّپیّچرابووەوە هەڵساو لەدوای باوکی چووە دەرەوە. کلووبەفرەکان تادەهات زۆرو چرتر دەبارین هیّشتا بای نەدەهات، ریشۆڵەکان هیّشتا لەسەر تەلی کارەبای سەرحەوشەی خانورەکە بوون. مەلا بەراکردن بەرەو دەرگای دەرەوە ملی نا. لەتارماییە پیّخاوسیّکەی کورەکەی هەڵدەهات، کەئەویش بەراکردن دوای کەوتبوو خوشکەکەی مەلا لەو دەرگایەوە سەری دەرهیّنا کە منداڵەکانی لیّوە بردبووە ژووریّ، هیچ دەربرینیّك بەسەروچاویەوە دیارنەبوو. پاشانیش بەئەسپایی لەسەر ئەو دیمەنەی داخست، وەك بلیّی مەسەلەکە تەنیا پیّوەندە بەچارەنووسەوە. مەلا دەرگاکەی کردەوە و بەلیّوباری چووەدەرەوە، بۆ حەوشەیەکی سپیی کەلەهاوشانی شوورەی خانووەکە دابوو و پانتایەکە بەرەو باکوور دریّژ دەبوەوە هیّندی خانووی تاك و تەرا لەدوور رادیارن بەفر بارینەکە هیّندەی دیکەی قوڵی کردبوون. مەلا بەقوورسی هەنگاو هەڵدیّنیّ، چونکی پیّیەکانی بەبەفرەکەداڕۆدەچوون کوڕەکەیشی بە قورسی هەنگاوی هەڵدیّنا و پیّخاوسیّ بوو، بیّکەم و زیاد چەند مەتریّك نیّوانیان بوو باوکەکە هەنووکە لەسەرخۆ ڕیّ دەکاو کوڕەکەشی وەك بلّیی دوای کەسیّکی شارەزا کەوتبیّ وەکو ئەو لەسەرخۆیە.. تەنیا دایکەکە کە باوك و کورەکەی لەپیّش بڕکیّکەدا بەجیّیان هیّشتبوو، هیچ مەودایەکی پیّ نەدەزانی جگە مەودای حەپساویەکەی نەبیّ، چوار گۆشەکانی قالیەکە دەبوونە چاوی پرسیار کردن و دیوارەکان دەدەنەقاقا لیّفە ئەستوورەکە رادەکیّشیّ تاسەرلووتی، چاو دەبڕیّتە بۆ شاییەك لە هەوادا قەمچی رادەوەشیّنیّ:" ئەی خوایە، گەر ئەم هەمووە لەچاوتروکاندنیّکا لەناو بردبایە بەبیّ دەنگی وادەلّیّ، واقیعیش گەورە دەبیّ کەجەستەی بەجەستەی کوڕەکەی دەچیّ، قژیّکی چرو لەجیّگایەکی نەزانراوەوە شۆر بووەتەوە و قامکە سوور و سپیەکانی گەمەبەپرسیارەکان دەکەن.

کوڕو باوکەکە لەودیوی خانووە تاك و تەراکانی باکوور وون دەبن شویّن پیّیە چەوتەکانیان خەریکە گزنگی بەفرەگەمژەکە پیّیان دەگا. لە جیّگایەکی دوور، لەوشویّنەی کەسنووری ئەم شارۆچکەیەی دەگەیەنیّت بە سنوری تورکیاوە. کورەکە دەگا بەباوکی:" باوکە، پیّویستت بەم هەمووە نیە". بیّکەس هاواری لیّکرد، هەرکە باوکی ئاوڕی دایەوە ماندوویی و بیّچارەیی پیّوە دیاربوو، وەستاو بەبەزەییەوە لەکورەکەی پرسی:" باشەو بەپیّخواسی ئازارت ناگاتی؟" کورەکە وەرامی دایەوە:" هەستیان پیّ ناکەم، بەلاّم چاوم لە پیّلّو دەردەپەڕیّ ئەگەر ڕاوەدوونانەکە بەردەوام بیّت. باوکەکە بەدەستیّکی شین هەڵگەراو کەلەژیّر عەباکەوە دەریهیّنا ردیّنەکەی سریەوە، پاشان لەپیّش چاویدا ئەو دیوو ئەم دیوی دەکرد ولّی وورد دبوەوە:"کوڕم لیّت بردمەوە، بۆ کویّ بڕۆم؟" کورەکەی لّی نزیك بوەوە و لەدەستی گرت:" کەواتە باوکە بابگەڕیّینەوە".

دەسکی دەرگاکە بەهۆی جوولانەوەی ئەو دەستەی کەلەدەرەوە دەیسوڕیّنیّتەوە لەژوورەوە سوور دەخوات. ئەنجا دەنگی دوو چرپە بەدووای ئەو جولانەوەیە دیّت:"فەرموو"یەك لەوی دیکە داوا دەکا ئەوی دیکە وەرام دەداتەوە:"تۆفەرموو" دایکەکە لەژیّر لیّفەکەوە خۆی دەرهیّنا و پاڵی دا بەبالیفەکەوە. باوکی هاتە ژوورەوە و رەنگ لەنیّیەکانیدا نەماوە، بەسەرسوورماوی رادەوەستیّ: ئایا پیّبخاتە سەر قالیەکە یان چارەنۆڕبیّ؟ باوکی بانگ دەکا:"خاتیّ" خوشکەکەی لەژوورەکەی تەنیشت وەرام دەداتەوە:"بەلّیّ برام". "ئاوی گەرم بیّنە" مەلا پیّی دەلّیّ ئاوی گەرم لەمەسینەیەکی مس دادیّنیّ لە هەرژوورێکیش مەسینەیەکی ئاو دەخەنە سەرزۆپاکە" بەسەر هەردوو قاچی دابکە" خوشکەکەی لەسەرخۆ ئاو بەسەر قاچەکانی برازاکەیدا دەکا، ئاوەکە بەسەر پیّستەکەیەوە دەچۆڕیّ و بەرەبەرە سوور هەڵدەگەریّ، لەویّشەوە بەرەو ئاوەرۆیەکی چیمەنتۆ لەسووچیّکدا دادەکشیّ و دەچیّتە دەرەوە، لەنیّو بەفرەکەدا بەریّچکەیەکی تەسك ریّگا بۆ خۆی دەکاتەوە لەبەر سەرسورماوی مەلا دەستی بەبزاوتیّکی ئامیّرانە لەسەر ردیّنەکەی دەخزیّ و ئەنجا بۆ سەرسنگی و لەویّشەوە بۆسەر رانی ڕاستی سنووری چوارگۆشەکانی قالیەکە گرژ دەبنەوە بەرلەوەی ئەوتاڵە بەنە بگریّ کە لەقەراغ قەفتانەکەی هاتووەتە دەریّ، هەرکە تاڵە بەنەکە رادەکیّشی، گریّکانیش لەدووری ئینجیّکەوە لەقەراغەکەی دەکریّنەوە. دەوەستیّ، چونکی دەزانیّ ئەگەر لەراکیّشانی تاڵەبەنەکە بەردەوام بیّ لۆچەکە شۆردەبیّتەوە گریّەکی بچووك دەدا لەو شویّنەی کەراکیّشانی بەنەکە تەواو دەبوو پاشان بەئاگری جگەرەکەی دەیپسیّنیّ. ئاوڕ لەژنەکەی دەداتەوە، لیّی دەپرسیّ:"کامیان هەڵبژیّرم؟" ژنەکەی وەرامی دەداتەوە:"مەهمەد.. خۆت دەزانی مەهمەد کیژیّکی هەیە.." پاشان ژنەکە دەستیّك تاتاقاری سەرچاوی هەڵدەبریّ، وەك بلّیّی دەیەویّ بلّیّ:"لەوانەیە" مەلا ئەو بزاوتەی ژنەکەی تیّدەگا کە(مەهمەد)ی برای کیژیّکی ئەقلّ سووکی هەیە و تەمەنی بیست ساڵانە و نازانیّ تابیست بژمیّریّ هەرکە بەو شیّوەیە بیردەکاتەوە دڵی تەنگ دەبیّ:"بۆ کورەکەم شایستەی کیژیّکی بیّعەیب نیە؟". لە خۆی دەپرسیّ، لەشەرمان چاوی ئەوی دەکا ئەبا بەرچاوی کورەکەی بکەویّ، وەلّ دەبیّ پلانەکە لەسەر ئەم کارەساتە ساز بدا، لەهەمان کاتیشدا دەبیّ خۆی لە مەسەلەیەکی ناجۆر دووربگریّ بەرانبەر براکانی بیانووەکەی زۆر لاواز دەبیّ. وەلّ ئەگەر لە(مەهمەد)داوای کیژەکەی بکات، واتا هەرچی لاوازی براکەی هەیە بەدەستیّك دەکریّ. بۆ سەعاتی پیّنج، پیّنج دەقیقەی دەویّ. مەلا کاتژمیّرە سەرقەباغ دارەکەی خستەوە گیرفانی بەرباخەلّی:"باهەر ئیّستا بڕۆم" بەدەنگی بەرز ئەمەی وت و مەبەستیشی هیچ کەسیّك نەبوو، بەرەو دەرگاکە هەڵدەسیّ، بەرلەوەی تاکیّك لە پیّلاوە لاستیکە ئاوەخن تووك دارەکەی لەپیّهەڵکیّشیّ، بانگی خوشکەکەی دەکا:"خاتیّ"، دیّتە ژوورەوە، داوای لیّدەکا خۆی ئامادەکات بکەویّتە تەکی، ئەویش ئامادەیی خۆی نیشان دەدا. مەلا سەیری دەکا و وای بۆ دەچیّ لەبارەی مەسەلەکەوە لّی بپرسیّ، وەلّ ژنەکە ناپرسیّ، چونکی(خاتیّ) زنجیرەی ئەو گاڵتە جاریە تاڵە پیّدەزانیّ، سەرەرای ئەوەیش کەمی دەبیست ودەبینی. هیّمنە وەکو یەکیّك لەمەوبەر ئەرکیّکی پیّسپیّردرابیّ و پیّویستە لەسەری جیّبەجیّی بکا، جار بەجاریش بیری لەلای منداڵەکانی بوو، کەرۆژ تائیّوارە بەجیّی هیّشتبوون وەلّ دەیزانی میّردە رووح سووکەکەی بەچاکی ئەوکارە ئەنجام دەدا. لە راستیدا(خاتیّ) پشت گویّ خرابوو، براکانیشی تەنیا بۆ خزمەتی منداڵەکانیان بانگیان دەکرد ئەگەر میوانیان زۆر بووایەبراو خوشکانی میّردەکەشی هەروابوون، تەمەنیّکی لەجل شۆردنی دژویّنی منداڵان گوزەراند بوو، یان جل وبەرگی دایکیان هەرکە منداڵی ببوایە تەمەنیّکی دریّژی لەژیّر گوانی چیّلّ و پەزەکاندا بەسەر بردبوو، لەو شویّنەی کەشیر لەنیّو مەنجەڵە بەدووکەڵ رەشبووەکاندا کەف دەکا، تەمەنیّك لەتەتەڵەو گیّژەکردنی ئەو دانەویّڵەی میّردەکەی دەیکریّ و بەرلەوەی بۆ ئاشی بەرن بەسەربردبوو ئەوەتا هەنووکەیش شانازی بەوەوە دەکا لەهاوشانی

براکەیەتی لەکارێکی سەختدا. (خاتێ) لەنێوتاریکیدا کە لەم وەرزەی ساڵدا زوو دادێت کەوتە شوێن براکەی هەردووکیان لەبەر رۆشنایی بەفرەکە کەگەڕەکە بێشۆستەکانی قەراغ شاری پڕکردبوو رێیان دەکرد بەسەر قۆقزی و چاڵ وچۆڵی رێگاکەدا لەتر دەدەن. یان پێیان رۆدەچێ. سرتە نایەت، جگە دەنگی هەناسەکە برکێ نەبێ خوشکەکە لەمەسەلەیەکی چارەنووس ساز بیر دەکاتەوە کە پەیوەند بەو بەرازییەی کەلەودیوی بەفرەکە بزر دەبوو. مەلایش بیری لەپێشەکی دەکردەوە بۆ سەردانەکەی پاشان،هەردوکیان پرسیارەکانیان لەبیر دەبردەوە، هەرکە لەو دەرگایەیان دەداکەلەناوەراستی شوورەیەکی قوڕدابوو، بەتووندی لەدەرگاکەیان دەدا تاخاوەن ماڵەکە گوێی لێبێ ترپە لەرووەمەتیان بەرزدەبێتەوە دەنگێك لەدوورەوە وەرامی دەدایەوە"ئێ..ئێ"، کوڕێکی سیازدە ساڵان دەرگاکە دەکاتەوە، دەیانناسێ:"مامە.. پووری.." دەچنە ژوورەوە بێنەوەی وەرام بدەنەوە. کورەکە بەتووندی

دەرگاکە پێوە دەدا، پاشان پاڵ دەنێت بەسەر کلۆمە ئاسنە ژەنگاویەکەوە بۆ نێو بازنە ژەنگاویەکە.. دەنگێکی لێهەڵدەسێ، وەکو نووزەی سەگ وایە مەلا و خوشکەکەی بەدەم رێگاوە گوێیان لە هەڵسانەوەی مانگایەکە لە گەووڕەکەدا و دەنگی مریشکیکش دێت لە کولانەکەیدا، هەرکە تێپەر دەبن کپ دەبێ. دەگەنە بەردەرگای ماڵەکە کەسی مەتر لەدەرگای حەوشەوە دوورە. بەبێ ئیزن پاڵی پێوە دەنێن، لەژوورەوە رووناکیچرا ئەوتەکە کزە، وەڵ درەوشانەوەی ئاگری زۆپاکە رووناکی کردوەتەوە و سێبەرێکی ئاشنای لەسەر دیوارەکان چاپ کردوە. دانیشتوان لەبەر کوت و پڕی سەردانەکە هەڵدەسنە سەرپێ. گەرچی هەوڵیان دابوو سەردانیان بکەن و پیرۆزبایی لێبکەن وەڵ دەرگاکەیان داخرابوو. ئەوا خۆی لەپڕهاتوو وسەردانیان دەکا .وەکوو یەکێك دزی گرتبێ لەپڕ هەڵدەسنە سەرپێ، تۆ بڵێی لەو دەمەدا باسی دەرگای ماڵی مەلایان نەکردبێ؟ یان دەربارەی ئەوەی کەلە ئاهەنگی خۆشنوویەکە دا سەری خۆی هەڵگرتبوو؟ هەرکەبەسەریاندا هاتن قسەیان دەکرد و قاچیان لەدەوری زۆپاکە راکێشابوو و سەروچاویان دووکەڵی جگەرە داپۆشیبوون:"فەرموون.. فەرموون" ژاوەژاو بەرز بوەوە. خێزانەکەی(مەهمەد)ی برای نۆ کەس بوو لەدەوری زۆپاکە دانیشتبوون. (مەهمەد) شەش ساڵ لەمەلا گەورەتر بوو، چەند دراوسێیەکیشی لێ بوون، شەوچەرەیان دەکرد، مەلا زۆر وەرامی بەخێرهاتنەکانی نەدەدایەوە، وەك بڵێی پلەی بوو. تاقە نێوانی بێ دەنگی و و حەپەساوی دانیشتووان ئەوە بوو کەلەقووتووەکەی براکەی جگەرەیەکی پێچایەوەکەلەسەر قاڵیەکە خزابوو تاگەیشتبووە بەردەستی لەزاریەوە گەواڵەیەك دووکەڵی دەردا، وەڵ ئەوەی لەکوونە لووتیەوە هاتە دەرێ لەسەردینەکەی نیشتەوە، وەکو تەمێکی تەنك لەسەر کێکەی بیبەرپێچی دەخواردەوە:" دەمەوێ دوو بەدوو لەگەڵ خۆت و ژنەکەت قسە بکەم" ئەمەی بەبراکەی وت و قسەکەیشی هیچ تێ وررووژانێکی پێوە دیارنەبوو، گومان کەوتە دڵی دانیشتووانەوە، دراوسێکان روخسەتیان خواست و چوونە دەرەوە، وەڵ ئەوانی دیکەی خێزانەکە چوون بۆ بەر زۆپای ژوورێکی دی، کەدەرگایەکی نزم لەو ژوورەی جیا دەکردەوە بە پەردەیەکی ئەستووری قەندی رەنگاو رەنگ داپۆشراوە بوو..(برام) مەلا بەکابراکەی دیکەی وت کەبەدانیشتنەوە ئەژنۆکانی خۆی بەسنگەوە گوشی بوو" هاتووم بۆ داخوازی سینەمی کچت". چاوی بەخوشکەکەیو براژنەکەیدا دەگێرا چاوی بڕیە گرەکەی ئەودیوی پەنجەرە بچووکە سلۆڤینەکەی زۆپاکە. دەیزانی ژن و مێردەکە لەچی بیردەکەنەوە و لەسەروچاویاندا ئەوەی دەخوێندەوە کە چاوەڕێ بوون بەم سەردانە کوت و پڕیە مەرگی ئەو کۆرپەیەیان پێراگەیەنێ کەئەم بەیانییە لەدایك بوو بوو. لەوە زیاتر نەبوو ئەگینا نیشانەی هیچی دیکە لەسەروچاویدا دیار نەبوو: "گوێم لێبگرن". و لەسەری رۆیشت"ئەوەیدەیڵێم تێ ناگەن، چونکی خۆێشم هێشتا تێی نەگەیشتووم بەڵام تکام وایە ئێوەش خۆتانی بۆ بدەن بەدەستەوە، هەروەکو خۆم داوە بەدەستیەوە.. کورەکەم..".

تانیوە مژێکیدا لە جگەرەکەی، ئاگرەکەی لاربوەوە و خەریك بوو بەربێتەوە، وەڵ بەپەنجە راستی کردەوە، دوای ئەوەی بەزمان تەڕی کرد: بێکەسی کورم کە ئەم بەرەبەیانە لە دایك بووە، لەماوەی سەعاتێکدا بەگوێرەی سێساڵ گەورە دەبێ، ویستی خوایە، کورەکەم ئەمرۆش دەیەوێ ژن بێنێ لەو باوەرەدام کەتێگەیشتن بۆ دەرگام لەرووی میوان داخستووە، پرسیاری زۆرم ناوێ، چونکی هێندە پرسیار لەمێشکمدا دەسوورێتەوە سەرم ئاوساوە. دەمەوێ تەنیا بۆ درۆکە خۆتان بدەنە دەستەوە بەبێ کەم وزیاد. (مەهمەد) وەرامی نەدایەوە. ژنەکەیشی دەستی نایە سەردەمی وەك بڵێی چاوانی خۆی دەگرت نەبا دەرپەرێن. "ئۆە.." مەلا فوویەکی کرد:"ئەوحەپاساویەی لە ئێوە رووی داوە، لەمنیش روویدا هەرکە بەچاوی خۆم بۆ یەکمجار دیتم دەقیقە بەدەقیقە گەورە دەبێ. برام هەرکە بڕەك بێ ئاگابووی بەدەم جگەرە پێچانەوە بیدە بەرزەین، هەر ئەوەندەت زانی موو لەرووەمەتی رواوە، پاشان سمێڵی دوا جاریش دەبینی ئەوەی ئێمە دەیزانین ئەویش دەیزانی وبێ ئەوەی هیچی دیبێ، هێندەش روو خۆشە حەپەساویت لەبیردەباتەوە" بزەیەکی هاتێ تائەوە برەوێنێتەوە کەلەتواناى کەس نەبوو بیرەوێنێتەوە: ژاوەژاوی ئەم کارەساتە ببیستێ بۆیە بۆ لای ئێوە هاتووم چونکی لەخواترسن". (مەهمەد) سەری هەڵبڕی لەبەر ئەو سێبەرەی کەئاگری زۆپاکە دروستی کردبوو و چاوی دیار نەبوو:"بۆیە کچەکەی منت هەڵبژاردووە چونکی ئەقڵ سووکە؟". مەلا بڵمە بڵمێکی لێوە هات و بۆ وەرام دانەوە تەنیا سەرەتای وشەکان بەهانایەوە هاتن. براکەی دووبارە هەڵیدایە وەك بڵێی ویستی قوتاری کات: "لەتۆ بەولاوە کەسی دیکە داوای نەکردووە، دەزانم، بەڵام بەهەرحاڵ کچمە.." مەلاش بەدەنگێکی توورەیی ئاساوە سووکە وەرامێکی دایەوە: "بەهەرحاڵ بێکەسیش کورمە، مەسەلەکەش لە نێوان من وتۆدا مەسەلەی رێکەوتن نیە لەسەر باوکایەتی بەڵکو کچێکی دیکە نادۆزمەوە خۆی بۆ ئەم هەڵوێستە سەرسوور هێنەرە بەخت کات" مەلا بێ دەنگبوو تاجگەرەیەکی دیکە لە قووتووی براکەی بپێچێتەوە و بۆ زاری هەڵبری ووتی:"بەڵێ برام، منیش بۆیە هاتمە لات چونکی تۆیش هەڵوێستت لاوازە و داوایەکم لێ کردوی هیچ تەفرەدانێکی تیانیە". لەسەرەخۆ جگەرەکەی داگیرساند، وەکو یەکێك دانی بەشتێکدا نابێ و چاوەڕێی لێبووردنێکی مسۆگەر بکات.. (مەهمەد) رووی دەمی پرسیاری لەژنەکەی کرد: "ئەی تۆ دەڵێی چی؟" ژنەکەیش سەری سوورمابوو، وەرامی دایەوە:"ئەویش براتە.." وقسەکەی تەواو نەکرد. (مەهمەد) ورتەیەکی لێوەهات:"دەتەوێ کەی ئامادە بێ؟". "هەرئێستا.. لەگەڵ خۆماندا دەیبەین" مەلا وتی... هەمدیس لەسەر قسەکەی رۆیشت:"نامەوێ تاسبەینێ کەس پێی بزانێ، بالەمارە برینەکەیشدا هەرخۆمان بین" ژنەکەی (مەهمەد) یەکسەر هەڵساو لەو پرسیارە زۆرە رایکرد کە رووبەرووی خۆی و مێردەکەی دەبووەوە پاشان لەپەردە قەندەکەوە خۆی کرد بەژوورەکەی تەنیشتەوە، ئەوەندەی پێنەچوو غەڵبە غەڵبی منداڵەکان بەرزبوەوە و بانگیان هەڵدەدا و بەدەم سروودێکی گاڵتە جاریەوە دەیانووت:"س.. ی.. نە...م.. سینەم.. نەم... نەم".

گەورەکان زانیان ژنەکەی ناچار بووە مەسەلەکەیان پێراگەیەنێ، تا بۆ رۆیشتنی خوشکە ساویلکەیان پاکانە بکات بەو شێوەگاڵتە جاریە دوای

چارەکە سەعاتێك کچەساویلکەکە بەبزەیەکی گەمژانەوە لەتەکیان وەستا بوو، جارنا جارێکیش بەنیمچە پێکەنینێکی تاساوەوە، دایکیشی لەپشتیەوە وەستابوو، دوو بوخچەی بچووکی بەدەستەوە بوو کەبریتی بوون لەجل و بەرگ و پێویستیەکانی کچەکە: " بەر لەمنێوە دەڕۆم" مەلا ئەمەی وت و هەڵسا: "لەڕێگای خویشمەوە دەچمە لای شێخ عارۆو لەگەڵ خۆمدا بۆ مارە برینەکە دەیهێنم". ئەنجا پێڵاوەکانی لەپێکردو ویستی بچێتە دەرەوە، بەڵام وەستاو ئاوڕێکی لەبراکەی دایەوە: " برام ئەگەر قەناعەتت نیەمەیکە". قونکە جگەرەکەی تووڕدایە دەرەوەی دەرگاکە کە تۆزێك کرابوەوە، براکەیشی بەدەست ئیشارەتی بۆ کرد: " بڕۆ.. بڕۆ" بێ ئەوەی هیچ بڵێ.(خاتێ) ی خوشکی مەلا لەڕێ ورۆیشتندا گەڵ سووکتر بوو، بەچاوی پەپوو هێڵی خۆڵەمیشی بەفرەکەی دەبینی و، وەکو مشکە کوێرەیش هەستی بەشوێن پێیەکانی خۆی دەکرد. هەرکە لەشووورەی خانووی براکەی نزیك بوەوە غاری داو دەرگاکەی بەهەردوولادا کردەوە. پاشان بەرەو ژووری دایکەکە پێچی خواردەوە. بەچرپە چرپ و فیشکەیەکی بەرزەوە چووە ژوورەوە: "ئەوا هاتن، بامنداڵەکان بچنە ژوورەکەی دیکە" بێکەس لەودیوی زۆپاکە دانیشتبوو تەنیا چمکی عەباکەی باوکی دەبینرا کەبەبەری گەورە بوو، وەرامی دایەوە: "پورێ بالێرە بن، قەیناکە" بەرلەوەی پووری قسەی تربکا ئەوان لەبەر دەرگاکە بوون، خاتێ وتی: "فەرموون" جارێ باوکەکە هاتە ژوورەوە، ئەنجا کچەکەی لەدوای ئەوانیش دایکەکەو دوو بوخچەکەی بەدەستەوە بوو. (خاتێ) بەپەلە دەرگاکەی داخست، سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەوجەوە توونـدو تیژە پتر بەنەرمی بگەرێ. وەڵ (بێکەس) هەڵساو دەسپێشخەری کرد و دەستی درێژکرد: "مامە بەخێر هاتی" مامەکەی حەپەسا بێکەسیش دەستە خاوەکەی کابرای خستە نێو دەستەکانی و رایوەشاند و لەنزیك زۆپاکە بالیفێکی بۆ دەسنیشان کرد. مامەکەی بەهەموو قورسایی جەستەیەوە خۆی بەسەریدا دا. (بێکەس) چاوی بریە سەروچاوی ژنەکەو پاشانیش بۆ سەروچاوی کچەکە کچەکە هەمیشە دەمی دابچڕیوە و پێکەنینێکیش لەدوو تۆی دانەکانیدا خۆی حەشارداوە. (خاتێ) خۆی تێهەڵقورتاند: "دانیشن.. دانیشن" و دوو بالیفی دایە کچەکەو دایکی (بێکەس) لێفەکەی لەسەر خۆی هەڵدایەوە، وەك بڵێی خۆی بۆ ئەو هەلوێستە ئامادەکردبوو، تەواوی جل و بەرگی پۆشی بوو سەرپۆشێکی سووری مووسلاوی بەخاڵی ڕەش ڕەش نەخشاو لەسەری بەستبوو، و هەوریەکی گوڵ گوڵی بەدەوری ملیدا پێچابووەوە لەسەروچاوەکاندا بێ دەنگی بەقولاپ بێدەنگی ڕاو دەکا هەریەکە و چاودێری ئەوەی دی دەکا، یان گەمە دەکا بەهەرشتێك کەبەر دەستی بکەوێ، بۆ لەبیربردنەوەی ئەو بێهوودەیەی خۆی بەسەر زۆپاکەدا کێشا بوو. تەنانەت منداڵەکانی مەلایش کە بەپێی فەرمایشتی بێکەسی برایان لە ژوورەکەدا مابوونەوە، سیخورمەیان لەیەکدی دەدا، بێئەوەی فزەیان لێوە بێت، ئەگەر یەکێکیان ئازاری پێگەیشتبا دەمی دادەپچڕی و پاشان زمانی خۆی دەگەزت کورە چوار ساڵانەکەیان لەبووکە چاوەڕوان کراوەکە نزیك بوەوە، وەڵ یەکێکی دیان چمکی دیشداشەکەی ڕاکێشاو بەدەما کەوت و پاشووی چوو بەحەواوە، خەریك بوو بگری، وەڵ دەستێك فریای کەوت و دەمی گرت لەپڕێکا شێخ(عارۆ) خۆی کرد بەژوورا و مەلایش لەدواوە بوو. هەموو پێکڕا هەڵسان و پێکڕا دانیشتنەوە، سەرلەقاندنی بێ واتا لەدەوری زۆپاکە لەکارابوو: "کورم وەرە پێشەوە، کچم تۆیش وەرە پێشەوە "شێخ عارۆ بەپەلە دەیووت، بەپارچە کاغزی دراوێکی بیست وپێنج لیرە خێزانەکە خۆی لە پرسیارەکانی شێخ ڕزگار کرد: "بسم الله... مارەم بڕین، دەیکەیتە مێردی خۆت، دەیکەیتە ژنی خۆت بەمارەییەکی پێشەکی.. پێنج لیرەی ڕەشادی"ئەو وشانە و وشەی دیش لەسەر قالیە بەرەگنە چوارگۆشە دارەکە جێگیر دەبوون. پاشان شێخ بەوورتە ورتێکەوە هەڵسا: "بەتەمای خوا" چووە دەرەوە و لە بەردەگا ماڵئاوایی لە مەلاکرد.



# شێرەکوڵلەی ئاسنین مەودایەك بۆ یاداشتی منداڵی

ئاوات عبدالله

شێرەکوڵلەی ئاسنین، یاداشتی ئەدەبی ڕۆمان نوس "سەلیم بەرەکات". عیسا چیایی لە عەرەبییەوە کردوویەتی بەکوردی و لە زنجیرە کتێبی گیرفانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمە. ئەم کتێبە جگە لە دەقێکی ئەدەبی دەکرێت ڕوانگەیەکی دیکەمان سەبارەت بە ئەزمون و سەرگوزشتەکانی دونیای منداڵی پێناشنا بکات. ئێمە هەموومان بەتەمەنی منداڵیدا تێپەڕبوین. کەم جۆر لە فەیلەسوف و ئەدیبەگەورەکانی دونیاش هەیە ئەزمونی منداڵی وەك ئەزمونێکی پڕ چێژ و بایەخ وەك سەرەتایەك بۆ دروست بونی چەندین پرسیاری فەلسەفی و ئەدەبی سەیرنەکات.




هەمیشە مرۆڤەکان حەز دەکەن گەورەبن بەردەوام لەگەورەیی یەکەوە بۆ گەورەیی یەکی تر لە شڵەژان و هەڵپەدان، دونیای گەورەیی دونیایەکە ڕەنگە سەرچاوەی گەلێك لە خۆشبەختی و لە هەمان کاتیشدا مەرگەساتەکانی ژیانیش بێت، هەمیشە مرۆڤ لە گەورەیدا وەك مرۆڤێکی کامڵ و خاوەن ئەزمون حسابی بۆ دەکرێت، مرۆڤی گەورە لە ژیاندا کەسێکە دەکرێت گوێی بۆ بگیرێ و متمانەی پێبکرێ چونکە ئەوکەسێکە خاوەنی سیقەونەزمون و ڕابوردوی ژیانە، هیچ گومان لەوەشدانیە زۆرینەی هەموو ئەو ئەزموونانەش باکگراوندو زەخیرەی منداڵین، یاخوود ئەوە تەمەنی منداڵیە لە هەناوی خۆیدا گرنگی گەورەبونی هەڵگرتووە بە جۆرێك وامان لێدەکات بپرسین: ئەگەر منداڵ نەبێ ئەی مرۆڤی گەورە بۆ هەیە؟ ئایا بەبێ منداڵی شتێك دروست دەبێ ناوی گەورەیی بێت؟ هەموو گەورەکان قەرزباری منداڵین هەموو منداڵێکیش مەرجەعی جۆرێك لە گەورەبونی هەڵگرتووە. بەم شێوەیە دەکرێت بپرسین کوا ڕێز و پێزانین و خوێندنەوەی ئەم دونیایەکەپێی دەڵێن(منداڵ)؟ سەلیم بەرەکات وەك کەسێکی ڕۆمان نوس بە بڕوای من لەم کتێبە بچوکەیدا دەیەوێت ئەم دۆخەمان نیشان بدات، گەڕانەوە بۆ نوسینەوەی یاداشتێکی ئەدەبی و هێنانی دونیای منداڵی بۆ نێو ئەم دەقە لای ئەم پیاوە یەکەم جار وروژاندنی ئەم پرسیارە هەستیارەیە. داخۆ هەموو ئەو شتەگەورە و بچوکانەی لەلای گەورەکان بەگەورەیی حزوری هەیە لە دونیای منداڵیشداهەمان شتن، ئێمە پێوانەمان چیە بۆ ڕوداوو بەسەرهاتەکان لای گەورەکان چ شت و ڕوداوێك جێی بایەخەو بە پێچەوانەشەوە چ شتێك مایەی پشت گوێ خستن و فەرامۆش کردنە، ئایا لەم نێوانەدا ئەم دووجۆرە دونیایە کامیان خاوەنی دونیای ڕاستەقینەی مرۆڤن، بێ گومان منداڵ و گەورە بەردەوام لە شەڕێکی دوانەهاتودان لە سەر حسابی بۆ کردن و نەکردنی شتەکانی دونیا، لای منداڵ هەمیشە کۆمەڵێك هاوکێشە لەژیاندا جێی بایەخ و گرنگین و لای گەورەکانیش کۆمەڵێك شتی دیکە، بەڵام پرسیاری ئێمە ئەوەیە داخۆ ئەم دوو دونیایە کامیان خاوەنی ماکی ڕاستەقینەی ژیانی ئادەمیزادن..

لەڕاستیدا سەلیم بەرەکات زۆرهەوڵی وەڵامی تێروتەسەلی ئەم پرسیارەنادات بەڵکو ئامانجی سەرەکی نیشان دان و خستنەڕوی خودی پرسیارەکەیە. ئەوهەوڵ دەدات لەڕێی ئەزمونی خۆیەوە پێمان بڵێ منداڵان چی دەبینن ئەوەی کە منداڵ دەیبینێ هەمان شتە کە ئێمەش دەیبینین بەڵام گرنگ لە جۆری لێکدانەوەکەدایە ئێمە لەم هاوکێشەی بینینەدا لێکدانەوەکانمان بۆ ئەم نمایش وبینینانەچیە، چۆن دەتوانین لێیان تێبگەین، یاخود تێگەیشتن لەشتەکان بایەخیان چیە..؟ ژیان پڕیەتی لە دونیای جۆراو جۆر کەسەلیم بەرەکات هەوڵ دەدات لەم کتێبەیدا نزیکەی حەوت جۆر لەم دونیایەمان نیشانبدات، بەڵام کێشەی سەرەکی ئەوەیە ئەم جۆرە دونیایانە تێگەیشتن و بینینیان چۆنە، چۆن لێیان بڕوانین یاخود ئایا دەتوانین ئێمەی مرۆڤ بە تایبەت مرۆڤە گەورەکان لە دونیای‌شتەکان بڕوانین، تێڕوانین لە ژیان ئایا لە قودرەتی مرۆڤدایە؟ ئایا باشترین ڕێگاچارە ئەوەنیە هەندێك جار مرۆڤ منداڵانە لە ژیان بڕوانێ، ڕەنگە زۆرینەمان ئەم جۆرە پرسیارە غروری گەورەیمان بروشێنێ بەڵام ئەوەش ڕاستیەکی تاڵە دەبێت بزانین کە هەمیشە شەڕ و کوشتار و چەوسانەوەکان بەدرێژایی مێژوو سەرچاوەکەی مرۆڤە گەورەکان بون، ئەو مرۆڤانەی شانازی یەگەورەبونیانەوە دەکەن. هەموو خوێن ڕێژیەکانی مرۆڤایەتی هەمیشەبە دەستی ئەو مرۆڤانەبووە کە گەورەیی مرۆڤ بە گەورەترین سەرمایەی ژیان دەزانن، کەواتە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئێمە لە ئاشوب و فیتنەو جەنگە خوێناویەکانی ژیان بێبەرین ئەوا دەبێت پەنا بەرینەبەر دونیای منداڵان بۆ پاکانە کردنمان لە ژیان دەبێت هانا بۆ منداڵان بەرین و داوایان لێبکەین لەو دونیا گەورەیەی خۆیاندا سوچێکی بچوك بە ئێمەی گەورە ببەخشن.. منداڵ پزیشکی شەڕەنگێزیەکانی مرۆڤایەتیە.. گەربێداری منداڵان نەبێ گەورەکان لە خەون و هەڵپەی ژیاندا یەکتری نغرۆدەکەن سەلیم بەرەکات پێی وایە منداڵ خۆی بێدارەو پاشان ئێمەش بێدار دەکاتەوە بۆ ئەوەی گاڵتەجاڕ یەکانی خۆمان بگێڕینەوە لەم بێداربونەوەیەدا منداڵ لایەنی جوانی و هێمای بوژانەوەیە و گەورەکانیش بەشی گێڕانەوەی گاڵتە جاڕیەکانی خۆیانیان بەر دەکەوێت. گاڵتەجاڕییەك کە زۆرجار بە خویانەوە منداڵانیش توشی گۆبەندەکانیان دەکەن، ئەوان دەیانەوێ منداڵان لە دونیای منداڵی دابڕن و توشی گاڵتەجاڕی گەورەبونیان بکەن، گەورەکان دەیانەوێ منداڵ بە ژیانێکی بێ منداڵیەوە بژی واتە بەردەوام هەوڵ دەدەن منداڵانیش هەمان شێوەی خۆیان تەسلیمی دڕندەییەکانی خۆیان بکەن، ئەمەیە

حیکمەتی گەورەیی.. گەورەکان خۆیان بە دڕندەیی منداڵانەوە هەڵدەکێشن ئەم سەدەیەی ژیان سەدەی دووجەنگی جیهانی و پڕ لە خۆ خواردنەکانی مرۆڤایەتیە، سەلیم بەرەکات ئەم سەدەیە ناو دەنێ زەمەنی جەردەیی، ئەم زەمینەپڕ لە دزی وجەردەییە منداڵانیش وەك هەموو کایەو بوارەکانی جەنگ و ئاشوب بونە بارمتەی جەردەیی، گەورەکان لێنەگەڕان لەم سەدەیەدا منداڵان ژیانی تایبەتی خۆیان بژین، چەندین سەرگەردانی و ئاوارەییان بەسەر دا سەپاندن، منداڵان سەرگەرمی ژیانبون ئەوانبەجۆرێکی تر سەرنجی ژیانیان دەدا.

سەرنجدانی منالاَن جۆرێکی جیاوازە لە گەورەکان گەورەکان هەمیشە لە سەرنج دانیان بۆ نمونە بۆ لەشی ئافرەتان جۆرێك لە چێژی سێکسی و نەشئەی پیاوەتی دەبینن بەلاَم منداڵی لە نێو ئەم یاداشتەی سەلیم بەرەکاتتدا بە شێوەیەکی دیکە ئەم سەرنجدانە شیدەکاتەوە، ئەو بەلایەوە ئاساییە کە ژنان و کچان لەشوجەستەیان سپی و ناسکە بەلاَم ئەم شتانە جارێکی تر مەودایەك بون بۆ هەندێك پرسیاری تایبەت بە خۆیان سەبارەت بە وجودی مرۆڤ، بینینی لەشی ئافرەت بەڕوتی ئەو پرسیارەی لای منداڵان دروست دەکرد ئایا ئافرەتانیش هەمان شێوەی پیاوان جەستەیان موی لێدەڕوێ..؟! گەورەکان هەمیشە لە هەوڵی دابەش کردنی زەوی دان، گەورەکان زەوی دابەش دەکەن، لای منداڵ هیچ هێزێك نیە بتوانێت مرۆڤەکان لە سەرزەوی لێك جیابکاتەوە، سنورێك بونی نیە زەوی بریتیە لە تەختاییەکی پان و بەرین ئەم تەختاییە بێ جیاوازی ماڵ و مەنزڵی هەموو مرۆڤایەتیە، بەلاَم دواتر گەورەکان هاتن و زەوییان لەت و پەرت کرد و دابەشیان کرد بەسەر چەندین دونیای جۆراوجۆردا کەلەدواجاردا ئەم دابەش کردنە بۆ منداڵان مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕیە..

منداڵان زۆریان پێسەیرە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو گەورە دڕندانەی ئێستا ئەوانیش هەمان شێوە وەك منداڵ ژیابن ئەرێ هەربەڕاست ڕۆژێك لە ڕۆژان گەورەکانیش منداڵییان هەبووە..؟! هەرگیز جێی باوەڕنیە چۆن دەکرێ مرۆڤێك ئەزمونی جوانی منداڵی ژیابێ و کەچی لەدواییدا تەحامولی دڕندەیی و شەڕەنگێزی و دابەش کردن دەکات هەرچۆنێك بێ زەمەنی منداڵی بەسەرچوو، هاتین بۆ گەورەبون بۆشەڕ و گەمەی بێکەڵك و بێ مانا، ئەوەش ئێمە و دونیای گەورەبون، داخۆ لەم دونیایەداچی دەبینین؟ بێ گومان جگە لەخۆکوژی و دڕندەیەکانی مرۆڤ چیتردەبینین. چۆن جارێکی تر بچینەوە بۆ منداڵی، بەچ ڕێگایەك لە تەوقی گەورەبون ڕزگاربین؟ ئەمەش سەرەتا و کۆتایی ئەو پرسیارەیەکە ناتوانین وەلاَمی سەبارەت بەخۆی بدەینەوە...



